ناوی بەرهەم: فەلسەفە، ڕەگەزپەرستی، پەروەردە
نووسەر: ڕێبوار سیوەیلی
بابەت: توێژینەوەی ڕەخنەیی، فەلسەفەی پەروەردە.
بەرگ: نووسەر
تاییپ، هەڵەچنی دیزایین: نووسەر
دەزگای چاپ: ڕێکخراوی زەریاب بۆ خزمەتگوزرایی کولتووری و ڕۆشنبیری ژمارە (١٤)
پەخش: ماڵی وەفایی/ فلكەی زراعە، هەولێر.
نورەی چاپ: چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی(٥١٧)ی ساڵی ٢٠١٦ی دراوەتێ.

Rebwar Siwayli
Philosophy, Racism @ Pedagogy
2016, Zaryab Publisher, Hawler, Kurdistan

## پێڕست


پێشەکی ........................................ ٥

**بەشی یەکەم: فەلسەفە** ........................................ ١١

- بیست و یەک بیرۆکە لەبارەی مرۆڤەوە .......... ١٣
- ئەگەر مرۆڤ نەبووایە، چی دەبوو؟! ................ ١٩
- ڕۆڵی فەلسەفە ........................................ ٣٥
- ڕەخنە و فەلسەفە، ڕەخنەی فەلسەفی ................ ٤٥
- ڕاوی فەلسەفی، ڕاوکردنی فەلسەفە! ................ ٥١
- بنەمای فەلسەفیانەی ئومێد ........................ ٧٣
- لە دایکبوونی فەلسەفیانە ........................ ٨٥
- فەلسەفە و شەڕ ........................................ ٩٥
- هونەری ڕەخنەگرتن لە خود ........................ ١١٧

**بەشی دووەم: ڕەگەزپەرستی** ........................ ١٢٣

- خراپەی مەترسیدار ........................................ ١٢٥
- لەبارەی ڕەگەزپەرستییەوە ........................ ١٤٥
- گەشتیاریی و ڕەگەزپەرستی ........................ ١٥٩
- لە دژی ڕەگەزپەرستی ........................................ ١٦٧
- جەنگ و ڕەگەزپەرستی ........................................ ١٧٣

**بەشی سێیەم: پەروەردە و داهاتوو** ........................ ١٧٦

- پەروەردە و فێرکردن وەک سامانی گشتی....... ١٧٧
- سێ بەڵگە سەبارەت مافی زانین و فێربوون...... ١٨٧

- **ئاسایشی پەروەردەیی ........................ ١٩١**
- **خۆشەویستی و قوتابخانە ........................ ١٩٥**
- **قوتابخانە تایبەتیەکان: میراتگرانی کۆلۆنیالیزم.. ٢٣٣**
- **قوتابخانە پەرپووتە تایبەتەکان............... ٢٤٧**
- پەرپووتی ........................ ٢٥٧
- کەمتەرخەمیی باوکان و دایکان ........................ ٢٦٩
- گۆڕینی قوتابخانە بە قوتابخانەیەکیتر ........................ ٢٧٥
- بەڕێوەبەریتی لە پەروەردەدا ........................ ٢٨٦
- گرنگیی بەڕێوەبەری خۆماڵی ........................ ٢٩٠
- ڕێکلام لە قوتابخانەدا ........................ ٢٩٧
- ئایا قوتابخانە میدیای ڕیکلامە؟ ........................ ٢٩٩
- لە منداڵیخستنی منداڵێتی ........................ ٣٠٥
- زمانیی دایک و قوتابخانە تایبەتییەکان ........................ ٣١١
- بەپیرۆزکردنی زمانی ئینگلیزی ........................ ٣١٨
- کێشەی زمان لە هەرێمدا ........................ ٣٢٤
- نامۆکردن بە زمانی دایک ........................ ٣٣٣
- گرنگیی مامۆستای زمانی دایک ........................ ٣٣٩
- کتێبەکەی فیلیپسۆن ........................ ٣٤٣
- دوارۆژی قوتابخانەکان ........................ ٣٥١
- وتەی کۆتایی ........................ ٣٦٥
- لیستی سەرچاوەکان ........................ ٣٧١

**پێشەکی..**

ئەم کتێبە پرۆژەیەکی ماندووکەر بوو. دەمویست کتێبێک لە ڕوانگەی تایبەتی خۆمەوە و بە ستایلی وتار و بەشێوەیەکی سادە و ئاسان بنووسم بەدوور لە قەیدوبەندی ئەکادیمیانەی دەستوپێگر، کە ڕووی لە داهاتوو بێت و لە هەمان کاتیشدا ئەو تواناییەی فەلسەفە و پەروەردە ئاشکرا بکات کە بۆ ڕاڤەکردنی کێشەکان پێویستە. ئێمە کەمتر بەو جۆرە فەلسەفە و پەروەردە، یان هزری پەروەردەیی بەکار دەهێنین و تێکەڵ بە شیکردنەوەیەکی گشتیتریان دەکەین بەبێ چوونەوە ناو وردەکارییە تەکنیکیەکانی نووسین بە ناوی زانستگەراییەوە. فەلسەفە بۆ تێگەیشتن و بەرهەمهێنانی دیدێکی نوێ لە سەر دنیای واقیع گرنگیی و تایبەتمەندیی خۆی هەیە. دەکرێ بکرێتە ڕوانگەیەکی سوودمەند بۆ هەر بابەتێک دەمانەوێت لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەین. ئەمە هەڵبژاردنێکە و پێویستە ئەنجام بدرێت بۆ ئەوەی هزرینی فەلسەفیی بەتەنیا نەبەستینەوە بە چوارچێوە مێژوویی و ئەکادیمیەکەی خۆیەوە. بۆ ئەوەی فەلسەفە بەشداریی و کاریگەریی هەبێت لە ژیانی کردەییماندا، پێویستە بیخەینە بەردەم کێشە واقیعیەکان و لێوەی ئەو بەشە شاردراوەیە لە جیهانی خۆمان ببینین، کە لێماندەشاردرێتەوە.

بەودیوی دیکەشدا، پەروەردە لە وڵاتی ئێمەدا لەوپەڕی لاوازیی خۆیدا دەژی. توندوتیژیی سیاسی و میدیایی و دەستێوەردانی کەسیی و لایەنەکان و دەسەڵاتی شاراوەی ئەو کۆمپانیایانەی بازرگانی بە پەروەردەوە دەکەن، وایانکردووە لە هەرێمی کوردستاندا وشەی پەروەردە و هزری پیداگۆژی لەبەرچاوی بەشێکی زۆر لە خێزان، منداڵ، هەرزەکاران و خەڵکی وڵاتەکە بکەوێت. پەروەردە کواتکراوەتەوە لە کردنەوەی قوتابخانە و دامەزراندنی مامۆستا و ئەرکە ڕۆتینییە ئیدارییەکان، کە زۆربەیان ڕێگرن لەبەردەم پەروەدە خۆیدا وەک جۆرێک لە بیرکردنەوە. ئەمە جگەلەوەی پەروەدەکارانی دەرەوە و ناوەوەی هەرێمی کوردستان لەناو سیستەمی پەروەدەیی ئێمەدا تا ڕادەیەکی زۆر لەبیر دەکرێن و دەخرێنە پەراوێزەوە بەو بەهانەیەی ئەوانە "ڕەخنە دەگرن" و "شتگەلێکی تیۆریک باس دەکەن!"

پەروەردە کە دەبوو کێشەچارەسەر بوایە، بۆخۆی کێشەی گەورەی هەیە. ئەمەش لە کاتێکدا کە چ پەروەردە و چ فەلسەفە، یان جۆرێ لە فەلسەفەی پەروەردە دەبوو لە پێشەوەی ئەو هزرینە بن کە بۆ تێگەیشتن و چارەسازیی کێشە زۆرەکانیتر، پەنایان بۆ ببەین.

لەگەڵ ئەوەشدا بە سووربوونم لەسەر تێگەیشتنێکی فەلسەفیانە لە مرۆڤ و کێشەکانی وەک بنەمایەک بۆ تێگەیشتنێکی دروست، هەروەها بە باوەڕبوونم بە بەشداریی هزری پیداگۆژی و فەلسەفەی پەروەردە لە دۆزینەوەی ڕێگا چارە بۆ هەندێک لەو کێشانە، سووربووم لەسەر بەرەوپێشبردنی کارەکەم بەبێ ئەوەی بمەوێت باسێکی سیستەماتیکی لێوەبەربێنم و ناونیشانیی وەک "زانستیی و پسپۆڕیی و ئەکادیمیکیانە"ی بۆ دابتاشم.. من بە پەنابردنە بەر ئەزموون و تێگەیشتنی خۆم، بە ئەزموونی باوکایەتیم، بە سوودوەرگرتن لە سەرچاوەی پێویست و بە گرتنەبەری دیدێکی میتۆدیکی ڕەخنەیی، کە ئاسانکارییم بۆ دەکات تا بەشێوازێکی فرەڕوانگەیی بۆ کێشەکان بڕوانم، هەروەها بە ئاماژەدانی جاروبارەی هەندێک تیۆریی و سەرچاوە، کارم لەسەر ئەم بەرهەمە کردووە و بەهۆیەوە بەشداریی پێدەکەم لە دووبارە بیرکردنەوە لە یەکێک لە کێشە هەرە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای خۆمان لە ئێستا و داهاتوودا.

لەگەڵ ئەوەشدا تێزی کتێبەکە ئاوای لێهات: ***فەلسەفە بنەمای بیرکردنەوەی ئەم بەرهەمەیە، ڕەیسیزم کێشەکەیەتی و پەروەردەش ڕێگا چارە...***

سەرەتا بە هەندێ تێگەیشتنی خۆمت لە فەلسەفە ئاشنا دەکەم، کە وەک بنەمایەک وان بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ و بۆ وەستانەوەی مرۆڤ لە دژی ڕەیسیزم و هەرجۆرێکی دیکەی توندڕەوی، پاشانیش ئەم بۆچوونانە دەبنە بناخە بۆ داڕشتنەوەی چەند بیرۆکەیەک لە بواری پەروەردەدا.

ونبوونی بنەمای فەلسەفیانە بۆ تێگەیشتن لە پەروەردە و تواناکانی، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی فۆرمەکانی ڕەیسیزم. جێهێشتنی ڕەیسیزم بە تەنیا بۆ فەلسەفە، مەسەلەکە لە چوارچێوەیەکی تیۆریی ڕووتدا دەهێڵێتەوە. بۆیە پێویستە فەلسەفە و پەروەردە بچنە هەمان جەنگەوە لە دژی دێوە هەزار سەرەکەی ڕەیسیزم..

من نالێم ئەوەی بە ڕەیسیزم ناو دەبرێت و لە وڵاتانی خۆرئاوا بەرهەمهێنەری چەندین بزاڤ و حزبی ڕەگەزپەرستیانەیە، لە هەرێمی کوردستاندا هەیە. بەڵام لەبەر هەستیاریی بابەتەکە بۆ من کە ساڵانێک لە نزیکەوە فۆرمە سیاسیی و کولتوورییەکانی ڕەیسیزمم ئەزموونکردوون، ناکرێت ئەو گوتارانەی بۆنی ڕەیسیزمیان لە وڵاتەکەمدا لێدێت، بۆ یەک چرکەش چاوپۆشییان لێبکرێت.

مێژووی ڕەیسیزم، یان دەمارگیریی لە کوردستاندا بەشێوەیەکی سیستەماتیک، مێژوویەکی مەترسیدار نیە.

بەڵام سەرەتاکانی سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەیە، بەهەر ناوێکیترەوە، لە برەوسەندندان. ئەمەش بە چاوپۆشین لە رەگوڕیشە مێژووییەکەی، لەسەردەمی ئێستاماندا دەگەڕێتەوە بۆ دیاردەی کۆچ و لێشاوی پەنابەریی و ئەو بەریەککەوتنانەی لەم پەیوەندییە دەکەونەوە. هەروەها نەبوونی یاسای پێویست و ناچالاکیی کۆمەڵگای مەدەنی لەم بوارەدا و بەردەوام وێناکردنەوەی کورد بۆخۆی وەک قوربانی، دەبنە هاندەری بەهێزکردنی ئەو میکانیزمانەی بۆیان هەیە خزمەت بە هزری ڕەیسیستیانە بکەن..

ئەم وتارانەم لە پەراوێزی ئەم هەوڵە باشانەدا نوسیون، کە هەر یەک لە پەروەردەناسانیی هەرێم و مامۆستایانی پەروەردەناس لە دەرەوەو و ناوەوە، کاریان بۆ کردوون.. پێشتر بەشێکی وتارەکان بڵاوکراونەتەوە، بەڵام بۆ ئەم چاپە کاری دیکەم لەسەر کردوون و پێیانداچووومەتەوە...

ڕێبوار سیوەیلی ٢٠١٦

# بیست و یەک بیرۆکە لە بارەی مرۆڤەوە..

١. مرۆڤ دروستکراوە یان نا، کێشەی من نیە. من لەو شوێنەوە مرۆڤم خۆشدەوێت کە هەیە و هەبوونەکەی بەری ڕەنج و تێکۆشان و خەباتی خۆیەتی،

٢. ئادەم و حەوا ئەفسانە بن یان ڕاستیی، کێشەی من نیە، گرنگ ئەوەیە ئەوان پشتیان بە ویست و بیرکردنەوەی خۆیان بەست و یەکەمین بیرکردنەوە و کرداریشیان بەرجەستبوونی ویستی خۆیان بوو بۆ مرۆڤبوون بە شێوەیەکی هاوسەنگ لە یاخیبوونیاندا لە هەر سنوور و قەدەخەیەک،

٣. بۆیە مرۆڤ لە بنەماوە بوونەوەرێکی قەدەخەشکێن و خۆ دروستکەرە. ئەمە ئەو لایەنەی مرۆڤبوونە کە من خۆشمدەوێ و دەمەوێ لە خۆمدا بەرجەستەی بکەم.

٤. متمانەی من بە مرۆڤ لە سەرووی متمانەی منەوەیە بە خۆپەرستی. مرۆڤی خۆپەرست ناتوانێت کەسیتری

خۆشبوێ، بۆیە ناتوانێت ئاوەدانکەرەوەبێت و مرۆڤایەتی لە خۆیدا بەرجەستە بکات.

٥. مرۆڤبوون واتە (ناگوتن) لە بەرامبەر واقیع دا لەبەر ئەوەی زۆرجار ئەوەی ئەقڵ دەیبینێ، واقیع لێمانی دەشارێتەوە. بۆیە واقیعی مرۆڤی بیرنەکەرەوە، هەمان واقیعی مرۆڤی هوشیار و هەستیار نیە.

٦. هووشیاریی مرۆڤ بەدەر نیە لە هەڵسەنگاندنی ژیانی خۆی لە چوارچێوەی ژیانی کۆمەڵایەتیی و لەگەڵ و لەپاڵ مرۆیەکانیتردا. کار بەرەنجامی هووشیارییە، هووشیاریش هاندەرە بۆ هەڵبژاردن و ڕەتکردنەوە لە نێوان چاکە و خراپەدا.

٧. مرۆڤ ئەو کاتە مەزنە کە وێڕای ئەرکەکانی لە ئاست میتافیزیکا و خوای خۆیدا، ئەرکەکانی لە ئاست خاک و هاوڕەگەز و مرۆیەکانیتر و جیهاندا، لە ئاست کرم و کێشکە و کیسەڵ و نەهەنگ و دڕندەکانیشدا جیبەجێی بکات.

٨. ئەو مرۆڤە مەزنە کە مرۆڤ بێت.

٩. مرۆڤبوون قورسە، چونکە لەگەڵ مرۆڤبووندا دەبێت لێبووردە بین، جیاوازیی قەبووڵ بکەین، تەحەموولی بیروڕای یەکتر بکەین و سوکایەتی بەکەس و هیچ نەکەین، پێویستە خۆمان و ژینگە و خاک و ئاسمانەکان وەک ئەندامێکی تەواوکەری گەردوون بزانین..

١٠. ئەو کەسەی خۆپەرست بێت، بۆی گرنگ نیە کەسانیتر کێن و چین، خۆپەرست کەسێکە ناتوانیت خۆی دروستبکات،

١١. ئەو کەسەی نەیەوێت خۆی دروستبکات بۆمن گرنگ نیە دروستکراوە یان نا، یان کێ دروستیکردوە!، گرنگ ئەوەیە من ناتوانم پشتی پێبەستم، چونکە ئەو ناتوانێت لە مەزنایەتی تێبگات..

١٢. مرۆڤ ئەو کاتە مەزنە کە مەزنێتی و کەرامەتی ئەوانیتریشی بۆ گرنگ بێت.

١٣. ئەگەر مرۆڤ دروستکراویش بێت، بۆ نمونە ئەگەر خوایەکیش دروستیکردبێت، تەنیا ئەو کاتەی مەزنایەتی

ئەوانیتری بۆ گرنگ بێت، تەعبیر لە گەورەیی دروستکەرەکەی دەکات.

١٤. جگە لە خوایەک، هەر هێز و گۆڕان و ڕێکەوت و پەرەسەندنێک مرۆڤی دروست کردبێت، دروستکەرێکی مەزنە، تەنانەت ئەگەر مرۆڤ خودی خۆیشی خۆی دروستکردبێت.. چونکە تەنیا مەزنەکان دەتوانن مەزنایەتی بەردەوام و بەرجەستە بکەن..

١٥. ژمارەی ئەو مرۆڤانەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بە ویستی مرۆڤە باشەکان دروستبوون، زۆر زیاترن لە ژمارەی ئەو مرۆڤانەی بە ویستی مرۆڤە خراپەکان لە بەرەکانی جەنگدا لەناو چوون.

١٦. بۆیە ویستی مرۆڤ بۆ ژیان و مانەوە، هەمیشە باڵاتر و گەورەترە لە ویستی مرۆڤ بۆ مەرگ و کوشتن..

١٧. ویستی ژیان ویستی ڕاستەقینەی ئەقڵە. بۆیە تەنیا مرۆڤ لە ئەقڵدا جیاوازە لە هەموو زیندەوەر و ئاژەڵەکانیتر..

١٨. بەڵام ئەقڵ ئیمتیاز نیە، بەڵكو دەروەستی و بەرپرسیارییە. بۆیە پێویستە پەیوەندیی ئێمەی مرۆڤ بە سرووشت و زیندەوەرەكانیتر و گشت گەردوونەوە، بە ناچاریی ئەقڵانیانە بێت..

١٩. لە دەرەوەی ژیانێكی ئەقڵانیانە، نا لێبووردەیی، بێڕێزیی بە بیروڕای ئەوانیتر، دووزمانیی، درۆ، دووڕوویی، تۆمەتباركردن، تانەلێدان، دڕندەیی، ستەمكاری و كوشت و بڕ و گەندەڵیی و بەفیڕۆدانی وزەی مرۆیی و سرووشتیی دەستپێدەكات..

٢٠. لە جیهانێكی وادا، كە ئەقڵانییەت لە ئارادا نیە، خودا هەبێت یان نا، مرۆڤ دروستكراو بێت یان نا، هیچ لە مەسەلەكە ناگۆڕێت..

٢١. لە هەموو ئەم بیرۆكە و هەنگاوانەدا مرۆڤ پەروەردەی پێویستە. مرۆڤبوون لە پەروەردەیەكی مرۆڤانە جیا ناكرێتەوە، پەروەردەی مرۆڤانە هیچ نیە لە كەڵەكەبووی ئەزموون و تێگەیشتنی بەرەی مرۆڤایەتی لە ڕاستەڕێی هەوڵدانیدا بۆ دروستكردنی مرۆڤێكی باش. پەروەردە بیركردنەوەیەكی هەمەكیی و گشتیی مرۆڤانەیە كە تیایدا

مرۆڤایەتی پێک دەگات.. نابێت مرۆڤ ئەم ڕێگایە بەردات، ئەوە ڕاستەڕێی مرۆڤە بەرەو خۆی وەک بیری چاک و ڕەفتارچاک و کردارچاک..

# ئەگەر مرۆڤ نەبوایە، چی دەبوو؟

(ئەگەر) ئاماژەیە بە گریمانە، نەبوونی هەبوو دەخاتە ژێر گومانەوە. گومان لە هەر شتێ، بوونی ئەو شتە دەخاتە ژێر پرسیارەوە. کاتێ دەڵێین: (ئەگەر مرۆڤ نەبوایە)، لە خودی ئەم ڕستەیەدا هەبوونی مرۆڤ وەک هەبوو گومانکاری کراوە و مەرجدار کراوە. بەم مانایەش نەبوون وەک بەشێکی تری بوونی هەبوو، کە لێرەدا مرۆڤە، خراوەتە ڕوو.

ئەو شتەی کە هەیە، هەبوونی خۆی لە نەبوونیدا تەواو دەکات، چونکە دەتوانێ نەبێ، بۆیە گریمانەکردنی نەبوونی مرۆڤ، نە شیعرە، نە خەیاڵە و نە وڕێنە. بەڵکو ئەنجامێکی لۆژیکیانەی هەبوونیەتی.. لێرەشەوە، نەبوون ئەگەری بەردەم هەر هەبوویەکە. هەر هەبووێک بۆی هەیە لە هەمان کاتدا نەبێت. نەبوون، دیوەکەی تری بوونە بەبێ ئەوەی ڕەتکەرەوەی بوون بێت..

کەواتە لەم قسانەدا، نەبوون، بەمانای *نابوون* نیە، بەمانای چوونە دۆخی هیچبوون و چوونە دەرەوە بۆ پانتاییەک نیە، کە هەبوو (بۆ نمونە مرۆڤ) لە بوونەوە بسپێرێ بە پانتاییەکی دیکە، کە تیایدا نەبێت.

(ئەگەر مرۆڤ نەبوایە)، بەمانای کردنە دەرەوەی مرۆڤ نیە لە بوونەوە بۆ نەبوون و جیاکردنەوەی ئەم دوو پانتاییە بێت لە یەکتری، بەڵکو بە مانای دۆزینەوەی مرۆڤە لە دۆخێکی دیکەی شیاوی گریمانەکراوی خۆیدا، کە دۆخی هەبوونەکەی بواری پێنادات هەبێت. لێرەدا هەبوون و نەبوون، جیاوازیی نین، بەڵکو تەواوکەرن، نەبوون پشتەوەی ئاوێنەی بوونە، بەڵام بەو ڕوونییەی کە ئەم ئاوێنەیە لە بوونی هەبوونی مرۆڤ دڵنیامان دەکاتەوە، پشتەوەی ئاوێنەکە، لەبەر ئەوەی لە نەبووندایە، هەبوونی مرۆڤ دەخاتە بەر گومان و ئەگەری هەبوونی لە نەبوونیدا دەکاتە پرسیار. بۆیە هەبوونی مرۆڤ، بە تەنیا نابەسترێت بە بوونیەوە لەبەر دەم ئاوێنەکەدا، بەڵکو لە نەبوونیشدا ئەگەرێک هەیە بۆ هەبوون.

ڕەتکردنەوەی نەبوون، وەک ئەگەرێک بۆ بوونی مرۆڤ تەنیا بەوە دەسەلمێت، کە پشتەوەی ئاوێنەکە ببینین و بزانین ئاخۆ لەوێدا مرۆڤ چۆن هەیە.

مرۆڤ هەیە، چونکە ئێمە وەک مرۆڤ هەین و هەست بە هەبوونی خۆمان دەکەین، بەڵام ئەگەری نەبوونی مرۆڤ، هەبوونی مرۆڤ ڕەتناکاتەوە، بەڵکو هەبوونی بەمجۆرەی مرۆڤ ڕەتدەکاتەوە، کە هەیە. ڕەتکردنەوەی هەبوونی بەمجۆرەی مرۆڤ لە هەبوونیدا، بەمانای ڕەتکردنەوەی

مرۆڤ نیه له دۆخی نەبوونیدا، مەگەر تەنیا هەبوونی ئەم هەبووە، کە مرۆڤە ببەستینەوە بە ڕەهەندە بایۆلۆژی و جەستەییەکەیەوە.
بەڵام هەبوونی مرۆڤ لە ڕەهەندی جەستەیی و بایۆلۆژیدا، هەبوون و مانەوەی ئەو لە یادوەریی و مێژوودا ناسڕیتەوە، چونکە ئەگەر وا دەبوو، بە مردنی مرۆڤ، وەک دۆخێک بۆ نەبوون، دەبوو ئێمە هەموو ئەو مرۆڤانەمان بیر بچوونایەوە، یان نەبوونیانمان قەبووڵ بکردایە، کە ئیتر مردوون و لێرە نەماون. ئەمەش دەمانخاتە بەردەم ئەو ڕاستییەی کە مردنیش وەک دۆخێک بۆ نەبوون، مەرجی نەبوون نیە، چونکە ئەگەر مردن یەکسان بێت بە نەبوون، ئەوە مرۆڤگەلێک هێشتا لە ژیاندان و هەن، بەڵام لەبیرمان چوونەتەوە، دەبوو نەبن..
ئەگەری نەبوونی مرۆڤ، ئەگەری هەبوونیەتی لە نەبوونیدا. لێرەدا پرسیارەکەی سپینۆزا دەکرێ دووبارە بکرێتەوە: **(شتێک بەوەدا پێناسە ناکەین، یان بوونکەی ناسەلمێنین کە چییە و چۆن هەیە. بەڵکو بەوەدا کە چی نیە و چۆن نیە).**
کەواتە ئەگەری نەبوونی مرۆڤ، شتێکمان لەسەر هەبوونی پێدەڵێت و نەبوون وەک دۆخێک بۆ هەبوو، یان مرۆڤ پێشنیار دەکات. کاتێ نەبوون وەک دۆخێک بۆ هەبوو وێنا دەکەین، یەکسەر مردنمان بیر دەکەوێتەوە، چونکە

بەردەوام نەبوون دەبەستین بە مەرگ و نەمانەوە. ئەم ترسە بنەماییە وامان لێدەکات لە نەبوون بترسین و یەکسانیی بکەین بە کۆتایی و لێرە نەمان..

لێرەدا دەبێت بپرسین: چیە وا دەکات کە بترسین لەوەی (ئەگەر مرۆڤ نەبێت)، چی دەبوو؟ لەکاتێکدا زۆر جاران ترسیی سەرەکیی ئێمە لە هەبوونی مرۆڤ خۆیدایە؟!

ئایا بوونی مرۆڤ چ دڵنیاییەکی لەسەر بوون پێبەخشیوین، کە وا بزانین تەنیا لە بوونیدا مرۆڤ هەیە؟ ئەگەر هەموو ترس و پەشۆکان و دڵەڕاوکێ و مەترسیەکانی ژیان لە بوون و بەهۆی هەبوونی مرۆییەوە یەخەی جیهانیان گرتووە، ئەگەر ئەوە هەبوونە لە مرۆڤدا کە ئەوی کردۆتە سەرچاوەی هەموو ترس و زەندەقچوون و وێرانکارییەک، ئایا بۆچی ئێمە ئەوەندە هەبوونی مرۆڤمان لەلا شیرین و پیرۆز بووە و لە پێناوی بوونی ئەم هەبووەدا، کە لە بوونیدا هیچ ئیمتیاز و سەردەستەییەکی لەچاو هەبوونی هەبووەکانیتردا نیە، وەک تاکە ئیمکانێک بۆ بوون تێدەگەین؟ ئایا هەبوونی گوێدرێژێک چی لە هەبوونی مرۆڤێک کەمترە، کە خەسڵەتەکانی لە هەبوونی ئەودا نیە و لە هەبوونی مرۆڤدا هەیە؟ ئەمەش لە کاتێکدا هەموومان دەزانین، هەبوونی گوێدرێژێک، مانگایەک، یان شێرێک، هیچ مەترسییەکی بۆسەر هەبوونی هیچ هەبوویەکیتر دروست

نەکردووە، وەکئەوەی هەبوونی مرۆیی هەڕەشەیەکی بەردەوامە لەسەر هەبوونی هەر هەبوویەکیتر.

ئایا کەس تا ئێستا زانیویەتی شێر جگە لە وەڵامدانەوەی غەریزەی شێربوونی خۆی، هەڕەشەیەکی بۆسەر بوونی هەبووەکانیتر دروست کردبێت؟ یان گوێدرێژ بە پێی ستراتیژێکی ئایدیۆلۆژی، شۆڕشێکی لە بەرامبەر ستەمکاریی و بێگاریی لە دژی هەبوونی هیچ هەبووێکیتر بەرپا کردبێت؟ یان هیچ کاتێک مانگا و مەڕ و بزنەکان، بە ئاماژەدان بە هەر ڕەوایەتییەکی ئایینی و کولتووری و لە پێناوی هیچ بۆنەیەکدا، قوربانییان بە مەلۆتکەی یان قەسابخانەیان بۆ هەبوونی هەبووەکانیتر هەڵخستبێ؟ وەکئەوەی مرۆڤ لە مەراسیمی قوربانیکردن بە بوونی ئاژەڵانیتر دەیکات؟

لە کاتێکدا جیهان پڕە لەو ئایدیۆلۆژیا و ئایین و کولتوورە مرۆییانەی بۆ ڕەواجدان بە ئامانجەکانی خۆیان، ڕووباری خوێن و بەرپادەکەن و ژینگە و ئەخلاقی بوونەوەر دەخەنە مەترسییەوە، هیچ بزووتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و هیچ ئایین و کولتوورێکی ئاژەڵییمان نیە، بۆ سەرخستنی مەرامی خۆی، یاسای دارستان تێکبشکێنێ. دڕندەترین دڕندە، هاندەرەکانی دڕندەیی خۆی لە پاڵنەرە غەریزەییەکانەوە وەردەگرێ، بایی پێویستییەکانی خۆی بۆ مانەوە و

تێرکردنی برسییەتی و پاراستنی هەرێمی خۆی، دڕندەیی دەنوێنێ. لەکاتێکدا ئەم ئاژەڵە دڕندەیە بەراوورد دناکرێت بە ئەخلاقیترین مرۆڤ کە بەناوی ئایدیۆلۆژیا و ئایین و کولتوورەوە، چاو لە بوونی هەبووەکانیتر دەپۆشێت لە پێناوی هەبوونی خۆیدا، هەبوونی ئەوان دەسڕێتەوە..

کەواتە هەبوونی مرۆیی، بە بەراووردی بە بوونی هەبووەکانیتر، نە پیرۆزە و نە ئیمتیاز و باڵادەستییەکیتری هەیە، بەڵکو هەبوونێکە تا دوایین جومگەکانی هەبوونی خۆی، بەسەر بوونی هەبووەکانیترەوە باڵادەست کردووە و بوونی لە بوونێکی ڕەسەنەوە، کە هەبوو لە چوارچێوەیدا دەبێت هەبێت، کردۆتە بوونێک بەسەر بوونی هەبووەکانیترەوە و هەبوونەکەی بۆتە بوونێکی مشەخۆرانە، کە بەبێ دەستدرێژیکردن بۆسەر بوونی ئەوانیتر ناتوانێ وەک ئەوەی پێویستە و ڕەسەنە، هەبێت.

لەبەر ئەوەیە، کە هەبوونی مرۆیی، هەبوونێکە لە ئاستێکی نزمتر لەوەی کە بوون، هەبووی تێدا دەگرێتە خۆی. هەبوونی مرۆیی ناتوانێ هەبێ، ئەگەر بوونێک نەبێت بەسەر هەبوونی بووەکانیترەوە و ئەم (بەسەر و لەسەر و لەپای و بەهۆ)یانەش، لە ڕەسەنایەتی هەبوونی مرۆییان کەمکردۆتەوە و هەبوونەکەیان کردۆتە هەڕەشە بەسەر بوونەوە.

لێرەوە لەسەر ڕێچکەی سپینۆزا دەپرسینەوە، ئەگەر مرۆڤ نەبوایە، چی دەبوو؟ لەکاتێکدا لە هەبوونی مرۆڤدا شەڕانییەت و توندوتیژی و مەرگ و نایەکسانیی هەیە!.

بەم مانایە بۆمان هەیە بپرسین، ئەگەر مرۆڤ نەبوایە، بەشێکی زۆر لەم وزە زیانبەخشانەی کە هەڕەشە لە بوون دەکەن و سەرچاوەکەیان، نەک هەڕەشەی دەرەکیی و دڕندەیی ئاژەڵەکان، بەڵکو سرووشتی مرۆییە، نەدەبوون.

جارێکیتر دەپرسمەوە: **ئەگەر مرۆڤ نەبوایە، چی دەبوو؟!**

بێگومان شەڕ و کوشتن و توندوتیژی و نالێبووردەییش نەدەبوون. کەواتە بۆ ئەوەی هەبوونی مرۆیی پێناسە بکەین، یان بیناسین، دەبێت نەبوونەکەی وەک گریمانەیەک وێنا بکەین و پرسیارەکە لێرەوە دەبێت پرسیار لەو بەشەی هەبوونی مرۆڤ، کە لە نەبوونیدا بەمجۆرەی کە هەیە، **هەیە** و ئەم بەشەی کە بەمجۆرە هەیە، زیانی گەیاندووە بە بوونی ئەو لەو بەشەیدا کە نیە، یان بەرجەستە نەبووە و دیار نیە..

ئەو بەشەی بوونی مرۆیی کە لە نەبوونیدایە، شتێک نیە لە مەرگ و نەماندا بەمانا مێژوویی و فیزیکییەکەی بەرجەستە ببێت. مرۆڤ لە نەبوونیدا نامرێت، چونکە یادوەریی و مێژوو ڕێگرن لەبەر دەم مەرگی هەبوودا و

بچووککردنەوەی لە بوونی فیزیکیانە و ماتەریالّیانەیدا. پێویستە مرۆڤ هەبێت لە نەبوونیدا بەم شێوەیەی کە هەیە. ئەم شێوەیەی کە مرۆڤ هەیە، هەموو هەبوونی خۆی نیە، بۆیە پێویستە بوونی مرۆیی چڕ و کورتنەکەینەوە، لەم بوونەیدا کە ڕەتکەرەوەی ڕەسانەیەتی بوونە. چونکە ئەمجۆرەی کە هەبوونی مرۆڤ خۆی لەسەرەوە بەرجەستە دەکات و لە خواستیی ئەودا بۆ شەڕانییەت و توندوتیژیی و نالێبووردەیی ڕەنگدەداتەوە، ناکرێت بەشێک بێت لە بوون وەکئەوەی کە خێر و چاکە و ڕۆشنایی ڕەهایە.

هیچ ڕەسەنەیایەتیەک لە بوونی هەبووێکدا نیە، کە بوونەکەی بوون بێت بەهۆی قوربانیکردن و ستەمکردن و بەسوخرەگرتنی بوونی هەبووەکانیترەوە. هیچ ڕەسەنایەتیەک لە بوونێکدا نیە، کە بوونێک بێت لە ڕێگای ئایدیۆلۆژیا و ڕەگەزپەرستی و کوشتنی هەبووەکانیترەوە، هەبوونی خۆی دەستەبەر و دابین بکات. هەر جۆرە پیرۆزکردنێکی هەبوونی مرۆیی، لەکاتێکدا کە ئەم مرۆڤە ناتوانێت بوونی خۆی بەبێ قوربانیکردنی بوونی هەبووەکانیتر بسەلمێنێ و بژی و گەشەی پێبدات، بە بوونێکی ڕەسەن دانانڕێ.

مرۆڤباوەڕی بەبێ ڕەخنەگرتن لە مرۆڤ، ئایدیۆلۆژیایەکیتری بێ مانایە، کە لە جیاتی خواوەندەکان و

مەرام و کولتوور  و پیرۆزییەکانیتر، پیرۆزیی بە مرۆڤ دەبەخشێت، لە کاتێکدا مرۆڤ بۆخۆی دەبێتە پەڵەیەکی ناشیرین بە ڕووخساری بوونەوە. هەبوونی ئایدیۆلۆژیانە و پیرۆزمەندانەی مرۆڤ، هەمیشە دیوە ڕەسەنەکەی مرۆڤبوونمان بیر دەخاتەوە، کە لە دۆخی نەبوونیدا بەمجۆرەی کە هەیە، دەبێت عەودالی بین و بەدوایدا بگەڕێین.

بۆیە پرسیارەکەمان: ئەگەر مرۆڤ نەبوایە، چی دەبوو؟ پرسیار نیە لە چییەتی هەبوونی مرۆڤ لە شێوە و بیچمێکیتردا. مرۆڤ لە بیچمی کۆتر و کەروێشک و بوولبوولدا وێنا ناکرێت. مرۆڤ لە زۆرینەی مەوداکانی مێژووی بوونی خۆیدا و لە زۆرینەی دامەزراوە کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئایدیۆلۆژییەکاندا لە بیچمی کالیگۆلایی و هیتلەری و سەدامیانە و داعشییەتیی خۆیدا هەبوونی خۆی بەرجەستەکردووە. لە گوزارەی (ئەگەر مرۆڤ نەبوایە، چی دەبوو؟)، ئەم (چیبوونە)ی مرۆڤ، ئاماژە نیە بە گۆڕینی جەوهەریانەی هەبوونی مرۆیی بۆ هەبوویەکیتر. بەڵکو ئاماژەیە بۆ جیهان و واقیع کە لە ئەگەری نەبوونی بەمجۆرەی هەبوونی مرۆڤدا و هەبوونی بەو جۆرەی کە نیە، چیی جیاواز دەبوو کە بەرەنجامی هەبوونی مرۆڤ بێت وەکئەوەی کە نیە.

لەبەر ئەوە پرسیارەکە نامانباتەوە بۆ سەر گۆڕینی جیهانێک کە ڕێگەی داوە مرۆڤ بەمجۆرە هەبێت، کە هەیە. لەم بەجۆرە هەبوونەی مرۆڤدایە، کە جیهان خراپە و ناخۆش و شەڕانی. لەکاتێکدا ئەم ناخۆشی و شەڕانییەتە هەم ئەنجامی بەمجۆرە هەبوونەی مرۆڤە کە هەیە و هەم ڕێگرە لەبەردەم هەبوونی مرۆڤدا بەو جۆرەی کە نیە. لێرەشەوە، هەموو ئەو فەلسەفە و ئومێدانەی کە وادە و مژدەی گۆڕینی جیهان لە پێش گۆڕینی مرۆڤدا دەدەن، بیریان دەچێتەوە کە جیهان بەرەنجامی ئەمجۆرەی بوونی مرۆڤە کە هەیە، نەک بەرەنجامی قەدەرێکی میتافیزیکی یان شەڕانییەتێکی گەردوونی، یاخود ویستی هەر هێزێکیتری بان مرۆیی و غەیبانی.

سرووشت لەخۆیدا پیس و نائۆرگانیزەبوو نیە، دەریاکان بە مەبەستێکی تایبەت کەشتییەکان بەهۆی هێزی شەپۆلەکانیانەوە، نغرۆ ناکەن. ڕەشەباکان، ئاگرکەوتنەوەکان، بوومەلەرزەکان، بوورکانەکان ئامانجێکی شەڕانییان لە هەڵکەندنی درەخت و نغرۆکردنیماڵەکان، لە سووتاندنی دارستانەکان، لە وێرانکردنی شاران، نیە.

لە پشت لەدایکبوونی منداڵێکی کەمئەندام، یان مرۆڤێکی شێواو، یاخود بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی و هەژاری و نایەکسانیی و نادادپەروەری و کوشتن و جۆرەکانی سەودا

و مامەڵە بە مرۆڤ و ئۆرگانەکانیەوە، هیچ هێزێکی بانسرووشتی، هیچ خودایەک، هیچ ویستێکی باڵا، هیچ شەیتانیک، هیچ جادووگەرێک و هیچ نادیارێک نیە، جگە لە مرۆڤ خۆی وەکئەوەی کە هەیە. لەبەر ئەوە ئەگەر جیهان بەمجۆرەیە کە هەیە، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە هەبوونی مرۆڤ بەمجۆرەی کە هەیە، دەستنیشانی بارودۆخی جیهانیی بەمجۆرە کردووە کە ئاوا بێت. خراپەی جیهان و شەیتانیەتی جیهان و نایەکسانیی و نادادپەروەری واقیع، نیشانەی خراپەی مرۆیی و ئەو خۆپەرستیە بێسنوورەین کە دواجار بە زۆربوون و بەردەوامیدانی، لە فۆرمی نادادپەروەری و نایەکسانییدا بەرجەستە دەبن و وەک بەشێ لە سرووشتی واقیع دەردەکەون.

خراپەی جیهان، هیچمان لەسەر بوون وەکئەوەی بەدیهێنەری جیهانە، پێناڵێت، بەڵکو شتگەلێکی زۆرمان لەسەر هەبوونی مرۆیی بەمجۆرەی کەهەیە، پێدەڵێت. ئەوەی کە دەبینرێ خراپەی بوون نیە، خراپەی هەبووە و بەوەی کە ئەم مرۆڤە بەمجۆرەی کە هەیە، خراپەکارە، گریمانەی ئەوە دەکرێ مرۆڤ بەوجۆرەی کە نیە، چاکەکار بێت.

لێرەوە، دەتوانین بڵێین، پێویستە لە گۆڕینی هەبوونی مرۆییەوە بەمجۆرەی کە هەیە، دەستپێبکەین، تا ئەو

هەبوونە مرۆییە بەرجەستە ببێت، کە نیە و لە هەبوونی ئەوجۆرەی کە مرۆڤ نیە، جیهانیش بەمجۆرە نامێنێت، کە هەیە.
ئەی باشە ئەگەر مرۆڤ نەبوایە، چی دەبوو؟ مرۆڤ هەر مرۆڤ دەمێنێت، نابێتە پشیلە و نابێتە شێر و ناشبێتە فریشتە. مرۆڤ ئەگەر بەمجۆرەی کە هەیە، نەبوایە، هەبووێکیتر نەدەبوو، بەڵکو وەکئەوەی کە نیە، دەبوو، چونکە وەکئەوەی کە هەیە، هەبوونی ڕەسەنانەی خۆی خستۆتە مەترسییەوە. مرۆڤ بەمجۆرەی کە هەیە، هەبوونەکەی واقیعیانەیە، بەڵام ئەمجۆرە هەبوونەی مرۆڤ ڕاستەقینەی مرۆڤ نیە. مرۆڤ ئەگەر بیتوانیبا و ویستبای بەشێوەیەکی تر مرۆڤ بیت، ئاوا نەدەبوو کە هەیە. ئەم هەبوونەی مرۆڤ چەندە واقیعیانەیە و بێ ڕووپۆش، ئەوەندەش دوورە لە ڕەسەنایەتیی بوون و حەقیقەتی مرۆڤبوونەوە.
لە ڕەسەنایەتی خێرۆمەندانە و چاکەکارانەی بوونەوەیە، کە دەتوانرێ هەبوونی بەمجۆرەی مرۆڤ ڕەتبکرێتەوە، چونکە بۆتە سەرچاوە بۆ دەرد و ئازار و بەدبەختییەکانی و دوورکەوتنەوەی لەو داهێنان و ئاستانەی هەبوونیی خۆی، کە دەیخەنەوە دۆخێکی هارمۆنی و هاوسەنگیی و ئاشتەوایی لەگەڵ بوون و بوونەوەرەکانیتر و ژیان و

زیندویێتیدا. ئەمەش لەکاتێکدا کە مرۆڤ هەبوونی خۆی وەک هەڕەشەیەک لێکردووە بەسەر ئەوجۆرەی هەبوونیدا، کە نیە، هەر وەکچۆن وەک مەترسییەکیی لیکردووە بۆ سەر بوونی ئەوانیتر، بەبێ ئەوەی هەبوونی بەمجۆرەی مرۆڤ ببێتە هەڕەشە بەسەر بوونی گەردوون و ژیانەوە. مرۆڤ بەمجۆرەی کە بوونی خۆی هەیە، ناتوانێ لە خۆی زیاتر هیچ وێران بکات.. دوایین وێرانەیەک مرۆڤ بیگاتێ و ئەقڵ و هۆشی خۆی بۆ بخاتە کار، بریتیە لە کوشتنی ئەوانیتر و ژینگەی بونەوەر. بەڵام کوشتنی هاوچەشنەکانی لە هەمان کاتیشدا کوشتنی خۆیەتی. مرۆڤ بەمجۆرە کالیگۆلایی و هیتلەریانە و سەدامیانە و بەششاریانە و داعشیانەیەی کە هەیە، دەتوانێ قات و قڕی بۆ ئەوانیتر دروستبکات، دەتوانێ جینۆسایدیان بکات، بەڵام ناتوانێ بیانخاتە دەرەوەی بوونەوە.

هەبوو، ناتوانێ بوون ڕەتبکاتەوە، ئەگەر هەبوونی خۆی ڕەتنەکاتەوە. ڕەتکردنەوەی هەبوو بۆ بوون بە نەبوونی خۆی کۆتایی پێدێت. بۆیە کاتێک مرۆڤ قارەمانە و بیرناچێتەوە و نەمر دەبێت، کە بتوانێ بەمجۆرە نەبێت کە هەیە. ئەمە ئەو شۆڕشە مەزنەیە کە پیویستە مرۆڤ بەسەرخۆیدا بیکات، تا ببێتە ئەوەی کە نییە و پێویستە

هەبێت تا نیەتمەندیی ڕاستەقینەی خۆی بە بوون و جیهان و دەوروبەری بناسێنێ.
مرۆڤ لە کارێکی بەکۆمەڵی و خۆ ڕێکخستنەوەیدا لەناو هاوشێوە دووپێکانی خۆیدا، کە ئەوانیش بەو جۆرە هەن کە هەبوونیان مەترسیە بۆسەر نەبوونی خۆیان بەو جۆرەی کە نین، ناتوانێت شۆڕش بەرپا بکات. ئەم شۆڕشەی باسیدەکەین، شۆڕشێکی کۆڵەکتیڤ و ئاپۆرەیی نیە، چونکە ئاپۆرە لە هەمان دۆخیی هەبوونیدایە کە بۆتە هۆی خراپبوونی و تەسلیمبوونی بە واقیعێک، کە ڕێگەی داوە مرۆڤ بەمشێوەیە هەبێت، کە هەیە و نەبێت بەو شێوەیەی کە نیە. ئەم شۆڕشە شۆرشێکی تاکەکەسیانەیە، شۆڕشی خودە بەسەر بوونی واقیعیانەی خۆیدا، بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێ بە قارەمانی حەقیقەتی خۆی، کە ئەم واقیعە ئەو حەقیقەتەی بیربردۆتەوە. بوونی شەرانییەت و خراپە و مەیلی وێرانکاری، لەبەر ئەوەی لە واقیعدا پەسەند و چاولێپۆشراون و پاساویان بۆ دەهێنرێتەوە، بەمانای ئەوە نیە ئەمە حەقیقەتی هەبوونی مرۆڤە. هەبوونی واقیعیانەی مرۆڤ بەمجۆرەی کە بەشێکە لە شەڕانییەتی واقیع، دەستنیشانی هەبوونی لە حەقیقەتدا ناکات. بۆیە ئەگەر مرۆڤ بیەوێ بە حەقیقەتی خۆی نامۆتر نەکرێ و بە تەسلیمبوونی بە واقیعێکی شەڕانی، نەبێتە ئامرازی

واقیعیانەی خراپە و شەڕ، پێویستە شۆڕش بەسەر هەبوونی واقیعیانەی خۆیدا بکات، تا هەبوونی حەقیقیانەی خۆی بدۆزێتەوە. شۆڕشەکە لە خودی واقیعیانەی مرۆڤەوە بۆ خودی حەقیقیانەی هەبوونی مرۆڤە.. لەبەر ئەوە، شۆڕشی مرۆڤ، سەرەتا واقیع ناگۆڕێت، بەڵکو مرۆڤ خۆی دەگۆڕێت و دەیخاتەوە سەر ڕێگای ئەو هەبوونەی کە هەتا بەمجۆرەی بمێنێت، نیەتی. تەنیا لەو نەبوونەیدایە کە هەبوونی ڕێگرە لە بەردەمیدا، مرۆڤ دەتوانێ لەگەڵ خۆی و بوون و گەردوون و جیهاندا ئاشت بێتەوە و سەر لە نوێ هەبوونی خۆی لەناو هەبووەکانیتردا ڕیکبخاتەوە. ڕێکخستنەوەیەک، کە پێویستی بە دەستهەڵگرتنی مرۆڤ لە زۆرینەی ئەو خراپە و توندوتیژی و ناهارمۆنیەتە پیرۆزیانە هەیە، کە لەناو ژیانێکی واقیعیانەدا و بە دووبارەکردنەوەیان لێی بوونەتە حەقیقەت. ئەو پیرۆزیانەی هەبوونی مرۆییان وەک هەبوونێکی خرپ بەرجەستەکردووە، بەشێکیان ئایدیۆلۆژی، بەشێکیان سیاسی، بەشێکیان ئایینی و بەشێکیان مێژوویی و بەشیکیشیان دەروونین.

ئەگەر مرۆڤ توانی ئەم شۆڕشە بکات، کەمێک لەم هەبوونەی خۆی هەڵگەڕێتەوە، هەنگاوێک چاوپۆشیی لە بەکارهێنانی خراپە بکشێتەوە، ئاوەدانیی و چاکە بۆ جیهان دەگەڕێتەوە و ئەوکاتەش واقیع ملکەچی ئەوە دەبێت کە

مرۆڤ له چاكه‌كاریدا به‌سه‌ریدا ده‌یسه‌پێنێ، نه‌ك ئه‌وه‌ی كه مرۆڤ ناچار ده‌كات به‌مجۆره‌ی به‌رده‌وامیی به هه‌بوونی خۆی بدات، به‌بێ ئه‌وه‌ی گوزارشكردن بێت له هه‌بوونی ڕاسته‌قینه‌ی مرۆڤ..

# ڕۆڵی فەلسەفە

## (لە ئەگەری نەبوونی مرۆڤدا وەکئەوەی کە هەیە، بۆ هەبوونی وەکئەوەی کە نیە).

ئەگەر گریمانەی باشتربوونی هەبوونی مرۆیی پەڕینەوە بێت لەو دۆخەی بوونەوە کە هەیە بۆ ئەو بوونەی کە نیە، ئایا ڕۆڵی فەلسەفە لەم گواستنەوەیەدا چییە؟ ئایا فەلسەفە دەتوانێ یارمەتیدەری مرۆڤ بێت تا بەمجۆرە نەبێت کە هەیە بۆ ئەوەی ببێتە ئەو هەبووەی کە پێویستە هەبێت؟

فەلسەفە، دەربڕینێکی پێکهاتەییە و لە دوو وشەی (فیلۆ) بە واتای خۆشەویستی و (سۆفیا) بە مانای دانایی پێکهاتووە. هەردوو وشەی خۆشەویستی و دانایی ئاماژەن بە هەبوونی دوو وزەی نامەتریاڵی، نا ئەزموونی و ناخەکیی و ڕۆحیی و فیکری، کە بریتین لە وزەی خۆشەویستی و دانایی. بکەری بەگەڕخەری ئەم دوو وزەیە وەکئەوەی گوزارەی (فیلۆسۆفیا)، یان فەلسەفە پێشنیاری دەکات، بریتیە لە مرۆڤ. فەلسەفە پێشنیاری ئەوە بۆ مرۆڤ! یان بۆ بکەر دەکات کە هەم هەستی خۆی لە جۆرێکی تایبەتی خۆشەویستیدا، بخاتەکار و هەم ئامانجیکیش لەو کردەیەدا دەستنیشان بکات، کە داناییە. بەمجۆرەش مرۆڤ بکەری

چالاکییەکە بە ناوی خۆشەویستی و بە نیازی بەدەستهێنانی بەهایەکە بەناوی دانایی. لێرەشەوە بەبێ ئەو بکەرە، بەبێ مرۆڤ هەست و خۆشەویستییەک بۆ دانایی ناگاتە ئەنجام و لێرەشدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤ لە فەلسەفەدا رۆڵێکی تایبەتی هەیە تا ڕووداوێک، چالاکییەک ڕوودبدات بە ناوی (خۆشەویستنی دانایی).

لێرەوە، فەلسەفە مرۆڤ ئاراستە دەکات بۆ خۆشویستنی دانایی و دانایی دەکاتە ئامانجی فەلسەفە کە تەنیا و تەنیا لە ڕێگەی مرۆڤەوە لەم ئامانجە نزیک دەبینەوە. مانگایەک هەرچەندە ببۆڕێنێ و هاوار بکات: (بۆۆۆ)... ئەم (بۆ)یە نابێتە پرسیارێک و تەنیا وەک بۆڕەی مانگایەک دەمێنێتەوە. کەچی هەرکات مرۆڤ (بۆ)ی بەکار هێنا، ئێمە دەکەوینە بەردەم بیرکردنەوە و وەڵامدانەوەیەک، چ سەلمێنرا و بێت یان نەسەلماو.

بەڵام ئایا هەموو مرۆڤێک دەتوانێ ببێتە چالاکوانی فەلسەفیی و دەتوانێ لە ڕێگای خۆشویستنی داناییەوە، مرۆڤ لە ئەگەری نەبوونییەوە بەو جۆرەی کە هەیە، ئاراستە بکات بۆ ئەو بوونەی کە پێویستە هەبێت؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە قورسە، چونکە بەشێکی زۆری فەیلەسووفەکان بۆخۆیان لە ڕاستەڕێی خۆشەویستییاندا بۆ دانایی، وەک ئامانجی کۆتایی فەلسەفە، پەنایان بۆ ئامراز و

شێوازگەلێکی جیاواز لەوانە بردووە کە خۆشەویستی پێویستی پێیەتی، یان شیاوی ئەوەن ئاراستەکەری وزەی خۆشەویستیی بن. لەناو فەیلەسووفەکانیشدا بە ڕێژەیەکی زۆر، ڕق و کینە، دووزمانی، توندوتیژی و شێوازەکانیتری سانسۆرکردنی هەستی خۆشویستن دەبینینەوە، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەمیشە فەلسەفە بە ئاراستەی خۆشەویستیدا، ڕێگای خۆشویستنی دانایی وەک ئامانجی ئەو خۆشەویستیەی نەبڕیوە. ئەمەش ئاشکرای دەکات، کە نە هەموو مرۆیەکان بە ئاسانی دەبنە چالاکوانیی فەلسەفیی و نە دانایی بەدەستهاتوویش لە مێژووی ئەو چالاکییەدا هەمیشە بەرهەمی خۆشەویستیە.

میزاجیی مرۆیی و کاریگەرییە دەرەکیەکانی و ناکۆکە ناخەکیەکان و بیرەوەری و ئەزموونەکانی لە کار و چالاکیی فەلسەفاندندا ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن و چالاکوانەکە، کە فەلسەفەکارە، سەرقاڵ دەکەن بە ئامانجەکانی خۆیانەوە، بۆ ئەوەی لەسەر ڕێگای خۆشویستنی دانایی بەلاڕێیدا بەرن و لە دواجاردا لە ناخی فەیلەسووفیشدا مرۆیەکی بچکۆلە بە هەموو سیفاتە مرۆییەکانەوە خۆی دەشارێتەوە و ئامادەیی هەیە.

بەمجۆرەش، ناتوانین بڵێین: هەمیشە فەیلەسووفەکان لە خۆشەویستییاندا بۆ گەیشتن بە دانایی، خۆشەویستییان

لەبیر بووە، چ جای مرۆڤە ئاساییەکان.. لەگەڵ ئەوەشدا فەلسەفە هەمیشە وەک ئەو شێوازی بیرکردنەوەیە ماوەتەوە، کە مرۆڤ لە ئامانجەکەی خۆی کە گەیشتنە بەدانایی، بە ژیریی و مەعریفە، بە ئاشکراکردنی نهێنیەکانی بوون و گەردوون و ژیان، نزیکخستۆتەوە. لێرەشەوە، لەبەردەم هەر ئەگەرێکی نەبوونی مرۆڤدا وەکئەوەی کە هەیە و هەبوونی وەکئەوەی کە نیە، ڕۆڵی فەلسەفە، یان ئەو چالاکییەی کە لەسەر بنەمای هاوڕێیەتی و خۆشویستنی داناییەوە دامەزراوە، پێشمەرجێکی هەرە سەرەکییە.

مرۆڤ ناتوانێ دەست لە فەلسەفە هەڵبگرێت، چونکە بوونی فەلسەفە لەدەرەوەی بوونی مرۆڤ خۆی نیە. فەلسەفە کۆمەڵە زانیارییەکی کەڵەکەبووی ماتەریالیی نیە لە دەرەوەی ژیانی کردەیی مرۆڤ بە هەردوو ڕەهەندە فیزیکیی و ڕۆحییەکەیەوە. مرۆڤ ناتوانێ هەبێ و فەلسەفەی نەبێت، یان نەیەوێت، یاخود پێویستیی پێی نەبێت. ئەمەش بە سێ هۆکار: هەستکردن، دانایی و ئازادی.

یەکەم مەرجی پێویستیی مرۆڤ بە فەلسەفە بوونی هەستە لە پێکهاتەی مرۆیی خۆیدا. مرۆڤ بوونەوەرێکی هەستەوەرە و بەشێکی زۆر لە ژیان و بوون و تێگەیشتنی خۆی لەسەر بنەمای هەستەکانەوە دادەمەزرێنی. بەبێ

هەستەکان، بەبێ ئەو کاریگەرییانەی، ئەو پەیامانەی، ئەو پرۆسە ناخەکییانەی کە بوونی مرۆیی هاوسەنگ دەکەن، ئارامیی دەکەنەوە، کامڵی دەکەن، بوونی مرۆیی دەکەوێتە مەترسییەوە. ئەوە ڕاستە کە مرۆڤ هەموو تێگەیشتنی خۆی لەسەر ژیان لەسەر بنەمای هەستەکانەوە، دانامەزرێنێ، بەڵام هەستەکان لە تێگەیشتن و پێگەیشتنی مرۆییانەی ئێمەدا نەک هەر بێ کارییگەر نین، بەڵکو دەستنیشانکەریشن. لەبەر ئەوە، خۆشەویستی وەک وزەیەکی هەستەکی، چ لە ئاستی ئەزموونی ڕۆژانە و چ لە ئاستی ئەزموونی ئەقڵیی و دانایيدا، دواجار وەک هەستێک، یان ئاراستەبوونی هەستێک و بەرجەستبوونی هەستێک دەمێنێتەوە. بەمجۆرەش، هەرچەندە فەلسەفە هەموو بانگەشەکانی لەسەر ڕەوایەتی بەڵگاندنی ئەقڵیی و ژیرباوەڕییەوە، دادەرێژێ، بەڵام ناتوانێ ڕیشە بنەماییەکەی خۆی، کە سۆز و خۆشەویستی بۆ دانایی بەرجەستە دەکات، بسڕێتەوە.

دووەمین مەرجی پێویستی مرۆڤ بە شێوازی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە، ئەوەیە کە ئەم هەست و سۆزە، ئەم ئەڤینە وەکئەوەی وزەیەکە لە مرۆڤدا، نەک لە گیانداران و ئاژەڵانیتردا، ئاراستەکراوە بەرەو دانایی. واتە دانایی دەکرێتە دوا ئامانجی فەلسەفە و بکەری گەیشتن بەم

داناییەش مرۆڤە. ئێمە دەزانین کە لە لای ئاژەڵانیتریش هەست و سۆز هەیە و ئاراستەکراویشە، بەڵام تا ئێستا نەزانراوە ئەو ئاراستەکردنە، بەرەو دانایی بێت.
بۆیە فەلسەفە چالاکییەکی دانسقە و بە ئیمتیاز مرۆییە، ئەویش بە وەگەڕخستنی وزەی خۆشەویستی بە ئاراستەی داناییدا. نەک بە وەگەڕخستنی خۆشەویستی بە ئاراستەی مرۆڤێکیتردا، یان بە ئاراستەی سرووشت و هەر شتێکی تری مادیی و مەعنەوی، یان دیار و نادیاردا. مرۆڤ لە فەلسەفەدا، ئەڤینی خۆی بۆ دانایی و فێربوون و تێگەیشتن بۆ ئاشکرا دەبێت. تەنانەت ئەوکاتانەش کە مرۆڤ نایەوێت تێبگات، تەنانەت نەبانبوونی مرۆڤیش لە (تێگەیشتن) بۆخۆی لە تێگەیشتنێکی تایبەتەوە هاتووە. ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت، تەنانەت ئەو کاتەی مرۆڤ نایەوێت لە هیچ تێبگات، ئەمەی لە تێگەیشتنێکی تایبەتەوەیە، نەک لە وەستان و عەودالبوونی بەدوای تێگەیشتندا. مرۆڤ کە نایەوێت تێبگات، کە نایەوێت بیر بکاتەوە، کە نایەوێت هیچ قسە و بۆچوون و فەلسەفەیەکی هەبێت، ئەمەی لە تێگەیشتنێکی تایبەت لە (تێگەیشتن) و (بیرکردنەوە) و (بێدەنگیی) و (فەلسەفە)یەکەوە بۆ هاتووە. بەم مانایەش بیرکردنەوە ڕاناوەستێت و بەردەوامیی هەیە، تەنانەت ئەو کاتەی مرۆڤ بانگەشە دەکات، کە بیر ناکاتەوە. چونکە ئەو کاتەی مرۆڤ

نایەوێت بیر بکاتەوە، بیر لە بیرنەکردنەوە دەکاتەوە و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو بەردەوام بیر دەکاتەوە.
هەر بەڵگەیەک لەسەر ئەوەی مرۆڤ بەردەوام بیر دەکاتەوە، بەڵگەیەکی باشە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ هەمیشە توانای ئەوەی هەیە بەو جۆرە نەبێت کە هەیە و ببێتە ئەوەی کە نیە. ئەم گریمانەیەش بۆ (نەبوونی مرۆڤ وەکئەوەی کە هەیە، بۆ ئەو ئەگەرەی ببێتە ئەوەی کە نیە)، بۆخۆی لە بیرکردنەوەدا ڕوودەدات.
لەبەر ئەوە بیرکردنەوە، وەک پرۆسە و چالاکیی بنەمایی لە فەلسەفەدا یارمەتیدەرێکی گرنگیی مرۆڤە لە خستنەڕووی گریمانەی: ئەگەر مرۆڤ نەبوایە چی دەبوو؟! بێگومان مرۆڤ لە بیرنەکردنەوەیدا، یان لە سست بیرکردنەوەیدا هەرگیز ئەوە نیە، کە لە بیرکردنەوەیدا هەیە. بۆیە ئەگەر مرۆڤ بەمجۆرەی کە هەیە نەبێت، ئەوە دەبووە مرۆڤێک کە بوونەکەی یەکسانە بە بیرکردنەوە، وەکئەوەی لە فەیلەسووفە پێشسوکراتییەکانەوە فێری بووین. بەمجۆرەش، ڕۆڵیی بنەمایی فەلسەفە لە ئەگەری نەبوونی مرۆڤدا وەکئەوەی کە هەیە، (ئەگەر ئەم هەبوونەی بێ بیرکردنەوە بێت، یان بیرکردنەوە تیایدا لاواز بێت)، ئەوەیە، کە بیکاتە ئەو مرۆڤەی بوونەکەی یەکسانە بە بیرکردنەوە.

مرۆڤ لە ئێستادا وەک هەمیشە بیریکردۆتەوە، بەڵام ناوەڕۆکیی ئێستایانەی بیرکردنەوەکانی ڕێگرن لەبەردەم هەبوونیدا وەکئەوەی کە نیە و ئەم بابەتانەی کە لە ئێستادا ناوەڕۆکن بۆ بیرکردنەوەکانی، لەم بوونەیدا دەیهێڵنەوە بەمجۆرەی کە هەیە و ئەمەش ڕێگرە بۆ ئەوەی بچێتە بوونێکەوە، کە نیە، بەڵام تەنیا بەو بوونەیدا بوونی ڕاستەقینە و بیرکردنەوەی ڕاستەقینە ئاوێتەی یەکتر دەبن..

ڕۆڵیی فەلسەفە لە هەڵدانەوەی ئەو پەردەیەدایە کە ئەم ڕاستیانەی لە مرۆڤ شاردوونەتەوە و بیرکردنەوەی ئەویان لە چاوبەستێکدا ڕاگرتووە، تا وا بزانێت، ئەوەی ئەو بیری لێدەکاتەوە، بابەتی ڕەسەن و دانسقەی بیرکردنەوەیە. بیرکردنەوە ناتوانێ بابەتی ڕەسەنی بیرکردنەوە بدۆزێتەوە، ئەگەر بە پلەی یەکەم بیرکردنەوە لە مرۆڤ، لە کەسێتی و خودێتی مرۆڤ خۆی نەبێتە بابەتی یەکەمی بیرکردنەوەکە. لە (تالیس)ـەوە تا (سوکرات) و تاکو (ئیبن سینا) و (لۆک)، (سپینۆزا)، (کانت)، (شۆپنهاوەر)، تا (کیاکەگۆرد) و تا (فوکۆ)، بیرکردنەوە لە خود، لە سۆژە، لە بکەری بیرکەرەوە، بابەتێکی ڕەسەنی پرۆسەی بیرکردنەوە بووە. هەر بیرکردنەوەیەک لە دەرەوەی بیرکردنەوەی بیرکەرەوە لە خۆی، لەو دۆخی بوونەی کە هەیەتی و تیایدا دەژی، ڕێگرە

لەبەردەم بیرکەرەوە خۆیدا وەکئەوەی کە هەیە، بۆ ئەوەی نەچێتە دۆخی بوونێکەوە، کە پێویستە تیایدا هەبێت..

ئەمە ئەو هووشیارییە قووڵەیە کە فەلسەفە بە هۆی خستنەگەڕی وزەی نەبڕاوەی خۆشەویستییەوە، بە ئاراستەکردنی بەرەو دانایی، ئەگەری نەبوونی مرۆڤ وەکئەوەی کە هەیە، دەگۆڕێ بۆ هەبوونی وەکئەوەی کە نیە. چونکە تەنیا بە ڕزگاربوونی مرۆڤ لە ئەگەری نەبوونی وەکئەوەی کە هەیە، بۆ هەبوونی وەک ئەوەی کە نیە، دەتوانێ ئازاد ببێت. مرۆڤ پێویستە سەرەتا لە هەموو ئەو کۆت و پێوەندانە ڕزگاری بێت کە لەم هەبوونەیدا هێشتویانەتەوە و ناهێڵن بەمجۆرە نەبێت، نەبێت. لەکاتێکدا بوونی مرۆڤ بەمجۆرەی کە هەیە، لە هەموو ئاستەکانیدا بیمارییەکی بەردەوامە کە بەرەو لە بیرچوونەوە و مردن و نەمانی دەبات.

بەڵام ئازادیی ئەو دوا جەوهەرە شاراوایەی ناو حیکمەت و دانایییە، کە فەلسەفە وەک دیارییەک پێشکەشمانی دەکات.. هەر بۆیەشە، فەلسەفە بەردەوام بەیادهێنەرەوەی خۆشەویستیە بۆ دانایی، چونکە دانایی لە ئازادیی جیا ناکرێتەوە..

# ڕەخنە و فەلسەفە،
# ڕەخنەی فەلسەفی..

ئایا ڕەخنە چالاکییەکە تەنیا لە بواری ڕەخنەی ئەدەبی و ژۆڕنالیستیی و ڕەخنەی کولتووریدا کارایی خۆی هەیە؟ ئەم وتارە لەو ڕوانگەیەوە تەماشای کاری ڕەخنە ناکات و ڕەخنە وەک سیستەمێکی فراوانتری بیرکردنەوە دەبینێ، کە دەیەوێت ئاستی ژیانی مرۆیی لەو ئاستەوە کە هەیە، بگۆڕێ بۆ ئەو ئاستەی کە پێویستە هەبێت. لەبەر ئەوە یەکەم پرسیارم ئەمەیە: ئایا لەم ڕوانگەیەوە چۆن دەتوانین باسی چییەتی ڕەخنە بکەین؟ بێسوود نابێت بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، کەمێک بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای مێژووی دروستبوونی ڕەخنە بەمانای ئەمڕۆیی، تا بزانین چییە ئەوەی ڕەخنەی پێدەناسرێتەوە؟

بە پشتبەستن بە مێشێل فۆکۆ لە (*کانت، ڕۆشنگەریی و شۆڕش ١٩٨٣، ڕۆشنگەریی چییە؟ ١٩٨٤ و ڕەخنە چییە؟* ١٩٨٧)، ڕەخنە لەو کاتەوە لەدایکبوو، کە مرۆڤ نەیویست بڕوا بەوە بکات کە گوێی لێدەبێت. لە دەوروبەری سەدەی پازدەیەم و شازدەهەمدا، ڕەخنە بە ڕەتکردنەوەی ئەوەی گوێمان

لێیدەبێت، یەکەم زللەی لە ئۆرتۆدۆکسیە مەسیحیەکانی ئەوروپا دا و لەدایکبوونی ئەمڕۆییانەی خۆی ڕاگەیاند، ئەمەش بەوەی کە گومانی خستە سەر پیرۆزی:

ڕەخنە بۆ ئەوەی زمانی پیرۆزی بەجێبهێڵێت و بە زمانی خۆی بدوێت، دەبوو گوزارە یەقینیەکان و ڕەهاکان لەخۆی فڕێداتە دەرەوە. لێرەوە زمانی ڕەخنە، زمانێکی گومانکارانە و ئەگەریانە و گریمانەکراوە: ڕەخنە دەڵێت: ("ڕەنگە"، "لەوانەیە"، "پێدەچێت"، "مەزەندە وەکرێت" ئا لێرەدا شتێکی تر مەبەست بێت!). ئەم دەربڕینانە بوونە سەرەتا بۆ بیرکردنەوەیەکی تر، کە پرۆسەی تێگەیشتنیان لە باوەڕی ئاینی، لە سیاسەت و لە کۆمەڵگا، بەلایەکی تردا دەبرد، چونکە مرۆڤیان دەخستە سەر ئەو بڕوایەی باشتر و جیاوازتر لە پەیامی یەزدان و پاشا و کۆمەڵگا تێبگات، جیاواز لەوەی پیاوانی کەنیسە و خاوەن نفوزی کۆمەڵایەتی و پاشا و حاکمەکان ڕایاندەگەیاند.

لەو سەدەیە بەدواوە، مرۆڤ توانی بڵێت: "ڕەنگە خودا، یان ئافەریدەگار مەبەستی ئەوە نەبووبێت، کە دەگوترێ، پێدەچێت مەبەستی ئاوا و ئاواش بووبێت". بەمجۆرەش ڕەخنە بووە فۆرمێکی بیرکردنەوە، کە دەیتوانی نیشانەی پرسیار لەسەر "پیرۆزی" و "ڕاستەقینە" دابنێ و شیکردنەوەی پیاوانی ئاینی لەوبارەیەوە ڕەتبکاتەوە.

میشێل فۆکۆ گوتویەتی: ڕەخنە لەگەڵ ئەو پرسیارەدا لەدایک بوو، کە دەیپرسی: چۆن خۆمان لەو دۆخە ڕزگار بکەین کە تیایدا ڕابەرایەتیی دەکرێین؟ پاشان ئەو پرسیارەی کە دەیپرسی: چۆن خۆمان لەو ڕابەرایەتیە و بە چ نرخێک، ڕزگار بکەین؟، دواجاریش ڕەخنە لەو پرسیارەوە بەرجەستە بوو کە دەیگوت: چۆن دەکرێ خۆمان لەو جۆری ڕابەرایەتیکردنە بدزینەوە؟

دەوڵەتی مۆدێرن لە هەناوی ڕەخنەگرتن لە شێوەی ڕابەرایەتیکردنی فیودالیزم و خاوەنزەویی و میرنشینەکانەوە لە دایک بوو. مەکیاڤیللی بەڵگەی ئەمەیە. ڕەخنەی مەکیاڤیللی ئەوەیە کە باشترین جۆری حوکمڕانی ئەوە نیە کە هەیە، کە بەهۆیەوە خەڵک بۆتە کۆیلە و کۆنترۆڵ کراوە. پێویستە ئەم جۆری حوکمڕانیە بەهێز بکرێت تا دەبێتە دەوڵەتێکی قاییم و بەتوانا.

پاشان، لەبەرامبەر شێوازی حکومڕانیی دەوڵەتیشدا، جۆرێکی نوێی ڕەخنە کەوتە قسە: ڕەخنە لە پێناوی ئازادیدا. ڕەخنەگرانی ئازادیی هەر تەنیا پاشا و سەرکردەیان نەدەکردە ئامانجی خۆیان، بەڵکو ڕەخنەشیان لەو شێوازی بەڕێوبردنە دەگرت کە لە ڕێگەیەوە دەست دەخرایە ژیانی تایبەتیی تاکەکەسەکانەوە. ڕەخنەگرانی ئازادیی ئەوەیان ڕەتدەکردەوە، کە سەرکردە یان پاشا مافی ئەوەیان هەبێت

حکومڕانیی ژیانی تایبەت و وردەکارییەکانی ژیانی خەڵک بکەن و بەهۆی یاسا و سیستەمەکانی چاودێریکردنی کۆمەڵایەتیی ڕەسمیی و ناڕەسمییەوە، لە بڕوا و زەوق و سەلیقەیان بپێچنەوە و حەز و ئارەزووەکانیان سنووردار بکەن. بەمجۆرەش ئەم ڕەوتی ڕەخنەگرتنە بەردەوام دەبێت تاکو توانای ئەوە بەدەست دەهێنێت، دەسەڵاتی خەڵک بەهێز و دەسەڵاتی سەرکردایەتی لاواز و سنووردار بکات. هونەری دەسەڵات و سەرکردایەتیکردن، کە لەسەدەکانی ١٦ و ١٧دا سوور بوو لەسەر مانەوەی لە سەرکردایەتیدا، لە سەدەی هەژدەیەمدا بووە هونەری دەستکێشانەوە و کەمکردنەوەی سەرکردایەتیکردن و بەناوی ڕابەرایەتیکردنەوە، دەستخستنە ژیانی هاووڵاتیانەوە.

## ڕەخنە و ڕۆشنگەریی:

لە هەمان کاتدا، فەیلەسووفی ئەڵمانی ئیمانۆیل کانت، کەوتبووە ڕەخنەگرتن لە ڕابەرایەتیکردن و پێگەی سەرکردایەتیکردن و ڕووی دەکردە ڕابەرایەییکراوانی ناکامڵ و پێیدەگوتن: "**ڕۆشنگەریی بریتیە لە ڕزگاربوون لەو بارە هەرزەییەی کە گوناهەکەی لە ئەستۆی خودی خۆتدایە. هەرزەیی، کەم توانایییە لە بەکارهێنانی ئەقڵدا بەبێ ڕابەرایەتیکردنی ئەوانیتر**". (ڕۆشنگەریی چییە؟١٧٨٤).

بەلای کانتەوە وەرگرتنەوەی دەسەڵات لەوانەی ئاراستەی ئەقڵیی خەڵک دەکەن، سەرەتایەکی پێویستە بۆ دروستبوونی سەربەخۆیی تاکەکەس و سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی ئازاد. بەلای کانتەوە، نائەقڵانیەت مەترسیدارە. ئایین، یاسا و زانست لە دەرکەوتنی کۆمەڵایەتیانەی خۆیاندا هەڵگری مەترسین و ئەو مەترسییەش ئەوەیە کە دەتوانن مرۆڤی ملکەچ و ترساو لە دەسەڵات، بەرهەم بهێنن. ئایا کانت دەیویست بەناوی ئازادییەوە هەموو جۆرەکانی نفوز و دەسەڵات تورِ بدات؟ من وەها لەو فەیلەسووفە تێناگەم. "دەبێ"ی کانت لەم گوزارەیەدا بەرجەستە دەبێت: "دەبێت تۆ سەربەخۆت بیت" و ئەم سەربەخۆییەش، کاتێ بەدەست دێت کە مرۆڤ خۆی بەدەست ئەقڵانیەتەوە دەدا و لە نائەقڵانیەت یاخیی دەبێت.

ڕۆشنگەریی یەکێک بوو لە پرۆژەکانی کانت. یەکێکیتر لە پرۆژەکانی بریتیبوو لە توێژینەوە لەوەی ئاخۆ ئەقڵ توانای ئەوەی هەیە یان نیەتی، کە سنووریێ بۆخۆی دابنێ و تا دوا سنوور سوود لە ئەگەر و تواناکانی خۆی وەربگرێت؟ لەلای کانت ئەم پرۆژەیە ناوی: ڕەخنەیە. ڕەخنە لە ئەقڵ وەک توێژینەوەیەک بۆ بەدیارخستنی توانا پەتییەکانی عەقڵ بۆ تێگەیشتن، بەبێ تێکەڵبوونی هەست و ئەزموونەکان. لە هەوڵدانا بۆ ڕزگارکردنی ئەوەی، مرۆڤ ڕەخنەی لێدەگرێت،

ئایا گرنگە سنوورەکانی ئەقڵ ببەزێنرێن و تاقیبکرێنەوە، ئایا ئەقڵ سنوورەکانی خۆی لە ڕەخنەگرتندا دەبەزێنێ بۆ ئەوەی بتوانین بڵێین ڕەخنە تاقیکەرەوە و دۆزەرەوەی سنوورەکانە، بە سنوورەکانی ئەقڵ خۆیشیەوە؟

ڕەخنە ڕزگارکەرەکەی کانت لەسەر ئەوە بەند بوو بتوانێ ئاشکرای بکات ئاخۆ سنووری ئەقڵ تا کوێ بڕ دەکات و چی لەباردا هەیە: ئێمە دەتوانین چی بزانین و دەتوانین هیواخواز بین بۆ زانینی چی و پێویستە باوەڕیشمان بە چی هەبێت؟.

کاتێ ڕەخنە دەبێتە ڕەخنە لە ڕابەرایەتی و سەرکردایەتی و دەسەڵاتی میتافیزیکی، ناوەڕۆکەکەی دەبێتە دەستنیشانکردنی سنووری ئەم دەسەڵاتانە. لەبەر ئەوە ڕەخنە وەک ڕەخنەگرتن لە سیستەم، سیتەمی دەسەڵاتە دنیایی و گەردوونیەکان، مێژوویەکی دێرینەی هەیە. بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەی مرۆڤ بڕوای پێهێناوە، ڕەخنە هەر تەنیا ڕووخێنەر، تێکدەر و ئاڵۆزکەر نیە، بەڵکو هەوڵدانێکیشە بۆ ڕاگرتنی دۆخێکی هاوسەنگ و بیناکردنی سیستەمێکی باش و گونجاوە بۆ ژیان، وەکئەوەی شیاوی ژیانی مرۆیی بێت.

## ڕەخنە و ڕێکخستن:

لە (پاسکاڵ)ەوە ئەم دێڕەمان بۆ ماوەتەوە: "دڵ ئەو بەڵگانەی تێدان کە ئەقڵ نایان ناسێت". بە زمانێکی تر، پێویستە ئەقڵ، خۆی لە دڵ و بڕیارەکانی بپارێزێت. پێویست ناکات پیاوێک بۆ خانمێکی بسەلمێنێت کە ئەوی چۆن خۆشدەوێت. پێویستە ئەو خۆشەویستیی لەگەڵ بکات، نەک خۆشەویستیی خۆی بۆ شیبکاتەوە. گۆشت و دڵ و ئەقڵ سێ جیهانی جیاوازن و هەریەکەیان لۆجیکی تایبەت بەخۆی هەیە. پاسکاڵ بەم جیهانە تایبەتیانە دەڵێت: ڕێکخەرەکان. ئەو کەسەی دەیەوێ ڕێزی پارێزراو بێت، لەبەر ئەوەی زیرەکە، یان لەبەر ئەوەی جوانە یاخود دەسەلاتی هەیە، یان ئەوەتا دەبێتە قۆشمەجاڕ یاخود مەترسیدار. پاسکاڵ لەو کاتەدا دەترسێ، کە ئەقڵ خۆی لە شتێکەوە هەڵدەقورتێنێ کە هیچی لەبارەوە نازانێت! کانت ئەمەش زیاد دەکات و دەڵێت: ئەوەش مەترسیدارە کاتێ ئەقڵ خۆی لەو شتەوە هەڵناقورتێنێ و بێدەنگە، کە شتێکی لەبارەوە دەزانێت. پاسکاڵ دەڵێت نەزانیی پاساوە بۆ بێدەنگی، بەڵام کانت دەڵێت بێدەنگیی داناکان مەترسیدارە. بەمجۆرەش ڕەخنە پێویستە هەوڵدان بێت بۆ هێنانە کایەی سیستەم و ڕێکخستنێکی بەسوود و ڕێکوپێک: ئاشتکردنەوەی ئەقڵ و دڵ.

دەکرێ بڵێین، ڕەخنە و ڕۆشنگەریی دوو هونەری ڕزگارکەرن نەک وێرانکەر. هەردوو ئەم پڕۆژەیە پەیوەستدار و پێکەوە بەستراون، بەڵام هەمان و یەکێک نین. پێویستە ڕەخنە ببێتە ڕزگارکەری ئەقڵ، لەکاتێکدا ڕۆشنگەریی، ڕزگارکردنی چۆنێتی بەکارهێنانی ئەقڵە. لەدوای کانتەوە، ئەم دوو زاراوەیە، ڕەخنە و ڕۆشنگەری، پێکەوە لە زاراوەی ڕەخنەدا یەکیان گرتووە. بەلای کانتەوە، ڕۆشنگەری بریتیبوو لە نافەرمانیکردنی هووشیارانە، پاشانیش ڕەخنە بووە هووشیارییەکی یاخیی لە گوێڕایەڵیکردن بۆ دەسەڵاتەکان. بەمجۆرەش ڕەخنەگرتن لە کۆمەڵگا و دیاردەکانی بووە ڕەخنەیەک بۆ ڕزگارکردن و خاوێنکردنەوەی کۆمەڵگا، نەک بۆ هەڵوەشاندنەوە و ڕووخاندنی. ڕەخنە لە ئەقڵ، نەک بۆ وێرانکردن و بێبایەخ کردنی ئەقڵ، بەڵکو بۆ ئەوەی زیاتر ئەقڵانیی بێت. بەمجۆرەش، ڕەخنە دەبێتە ئەو فۆرمی بیرکردنەوە و چالاکییەی کە ئەرکە هەرە سەرەکییەکەی دەبێتە ڕزگارکردنی ئەو شتەی ڕەخنەی لێدەگرێت. ڕەخنەگرتن پێش ئەوەی بابەتی ڕەخنەلێگیراو، هەڵوەشێنێتەوە، توند گرتوویەتی و چواردەوری داوە، دانی پیاناوە تا بیپارێزێت و چاکیی بکات و بیری بۆ بکاتەوە و داهاتووی بۆ تەئمین بکات.

بەم مانایەش بێت، ڕەخنە ڕزگارکەرە، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕەخنە ڕێپیشاندەریشە. با نمونەیەک بهێنینەوە لە مێژووی سەرمایەداریەتی ئەوروپا و خۆرئاوا. یەکێک لە فاکتەرە هەرە سەرەکیەکانی پێشکەوتن و گەشەکردنی سەرمایەدارییەت لە خۆرئاوا، ڕەخنەگرتن بووە لە سیستەمی سەرمایەداریەت، چونکە ئەم ڕەخنەگرتنە هەمیشە ڕێپیشاندەر بووە تا بەم سیستەمە و بکەرەکانی ناوی بڵێت سەرمایەداریەت چییە و بۆچی هێشتا ئەوە نیە کە دەبێت هەبێت و چۆن دەتوانێت بەوجۆرەی لێبێت کە پێویستە. کاتێ بەرهەم و کەلوپەلە بەرهەمهێنراوەکان ڕەخنەیان لێگیرابێت بەوەی تەندروستیی نین و زیانبەخشن، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی لە تێپەڕینی کاتدا، کواڵیتەی بەرهەمەکان بگۆڕدرێن و مەرجە تەندروستیەکان ڕەچاو بکرێن. کاتێ کۆمپانیاکان ڕەخنەیان لێگیرابێت بەوەی لە مامەڵەکردنیاندا لەگەڵ هێزی کار و کرێکار و کارمەندەکانیاندا، هەڵسوکەوتی بەدەر لە ئەخلاقیی ئەنجام دەدەن، ئەمە بووە بناخەیەک بۆ بیرکردنەوە لە ئێتیکی کار و یاساکانی هەڵسوکەوتی مۆراڵی. کاتێ پۆستەکان دەدرانە کەسانی نەشارەزا و ئەمە ڕەخنەی لێدەگیرا، هەستان پۆستەکانیان بەخشیە ئەو کەسانەی کە شارەزایی و لێهاتوویان لە بواری کاردا هەبوو. بەمجۆرەش ڕەخنە بووە

ڕێپیشاندەر بۆ ئەو شتەی، یان ئەو لایەنەی ڕەخنەی لێدەگرت. لێرەوە، ڕەخنەگرتن لە باڵادەستیی و ڕابەرایەتیی و سەرکردایەتی و سەرۆکایەتی، ڕێپیشاندەرە بۆ خۆ نوێکردنەوەی ڕابەران و سەرکردە و سەرۆکەکان.

## ڕەخنە و ئازادی:

ستایشکردنی هەرزەیی و نەزانی و گەمژەیی، ئەوەیە کە بتەوێ مرۆڤ بەوجۆرەی لێبێت کە دەتەوێ. ئەو کەسەی بیەوێت مرۆڤی سەردەمەکەی خۆی بێت، نابێت کردار و هەڵوێستەکانی بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەوە بن و تەنیا ئەوەندە بەسە ببێتە بکەرێکی ئۆتۆماتیک و گوێڕایەڵ و ملکەچ بە دەست سەردەمەکەی خۆیەوە. ڕەخنە فێرمان دەکات "مرۆڤ" و "کوڕ و کچی" و "پیاو"ی سەردەمەکەی خۆمان نەبین، بەڵکو مرۆڤی داهاتوو بین بە ڕەتکردنەوەی ئەو هەڵوێست و کردار و بیرکردنەوانەی سەردەمەکەی خۆمان بەسەرماندا دەیانسەپێنێ و بەهۆیانەوە دەستەمۆمان دەکات. ڕەخنە واتە دژوەستانەوە لە بەرامبەر ئەو هێزەی کە ئێمەی کردووە بەوەی کە هەین، بۆ ئەوەی ببینە ئەوەی کە پێویستە هەبین.

هێزی ڕەخنە بەشێکی ئەوەتا لە دەستنیشانکردن و قامک خستنە سەر ئەوەی کە لەواقیعدا هەیە و بەسەر مرۆڤەکاندا

و (بەهۆی زانست و ئایین و ئایدیۆلۆژیاکانەوە) سەپێنراوە و ڕەوایەتیی پێدراوە، بەشێکیشی ئەوەتا لە بەرجەستەکردنی توانایی و هاندانی مرۆڤ بۆ ئەوەی گرەو لەسەر بردنەوەی داهاتوو بکات. هەرچەندە ئێستا و واقیع، بابەتی سەرەکیی ڕەخنەن، بەڵام ئامانجی ڕەخنە بریتیە لە گۆڕینی ئەم ئێستا و واقیعە بە داهاتوو، کە پتر شایانی ژیانکردنێکی مرۆڤانە و کەمتر چەوسێنەرانە و ستەمکارانەیە.

ئەمڕۆ ڕەخنەیەکی زۆر هەیە لە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی، گومانێکی زۆر لەسەر ئەمجۆرە سیستەمانە و شێوازی بەڕێوەبردنیان و بەڕێوەبەران و سەرکردەکانیان هەیە. خودی هەبوونی ئەم گومانە و ڕێگەپێدانی لایەنێکی باشی ئەو سیستەمانەیە. لانیکەم ئەمجۆرە ڕەخنەیە دەبێتە هۆی سەندنەوەی هەر جۆرە متمانەیەکی سیستەمەکە لە خۆی و بەڕێوبەر و سەرکردەکانی. چەندساڵێک پێش ئێستا دەبوو هەمووومان بڵێین: کوردستان نمونەی دیموکراسیەتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە! ئەمڕۆ کەس ئەم قسەیە ناکات و قسەکەش بۆتە مایەی گاڵتەجاڕی ئەگەر نەتوانیت چۆن و لە چ کاتێک و بە چ بەڵگەیەک بیکەیت. چونکە هەر کەسێکی لاکۆڵان دەیان نمونەت بۆ دەهێنێتەوە، کە وا نیە و پێچەوانەکەی ڕاستە. چەندساڵێک لەمەو پێشیش

گرەومان دەکرد کە هەرێمی کوردستان دەکەینە (دوبەی)، بەڵام ئەمەش پێچەوانە هاتەوە، هەرێمی کوردستان بەرەو زبڵخانەیەکی گەورە دەڕوات بە لەدەستدانی زیاتری مۆراڵ و کەسایەتی کوردستانیانەمان. ڕەخنە یارمەتیدەر بووە بۆ ئەوەی کەس ئەمڕۆ ئەم قسانە نەکات، بەتایبەتی سەرکردەکانی وڵات و ڕاگەیاندنەکانی حیزب. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین بڵێین ئەوەندە ئازادیی لە هەرێمەکەدا نیە کە نەتوانرێ پراکتیزەی ڕەخنە نەکرێت. ڕەخنەگرتن هەیە و بایی ئەمەش ئازادیی هەیە. لەبەر ئەوە هەمیشە بواری یاخیبوون لە واقیع و ڕەتکردنەوەی ئەگەرێکە لەبەردەمماندا. هەر ئەوەی ئێمە سیستەمێکمان هەیە کە بواری ڕەخنەگرتنی لەخۆی هێشتۆتەوە، شتێکی باشە. ئەم ڕەخنەیە سەرکردە و ڕابەرانی وڵات، لە کارەکان و بڕیارەکانی خۆیان دەخاتە گومانەوە و ناچاریان دەکات دەست لە بیروڕا ئایدیۆلۆژییەکانیان و هووشیاریە چاوبەستەکانیان هەڵبگرن و کەمیان بکەنەوە و بە پشت بەستن بە پێشەکی هەڵە، ئەنجامی تراجیدیانەی هەڵە بەدەست نەهێنن. ئەمەش ئازادیە ئەم کەشەی دروستکردووە و مرۆڤیی ئێمە دەتوانێ نافەرمانیی مەدەنی ئەنجام بدات و لە ئاستی گوێڕایەڵیەکانی کەمبکاتەوە. کانت لەناومان ژیابا، دڵخۆش دەبوو، بەڵام دەیگوت: هێشتا

ماوتانه خۆتان له هەرزەیی خووپێوەگرتووتان ڕزگار بکەن و بڕیاری یەکلاکەرەوە بدەن سەبارەت بەوەی ببنە ڕابەر و ڕێپیشاندەری خۆتان بەبێ گوێڕایەڵیکردن بۆ ئەوانیتر..

ڕەخنە له ئایینی مەسیحی، تاکەکەسی بڕواداری فێرکرد، کە بتوانێ پشت بەخۆی ببەستێ و خوای خۆی له دەرەوەی ڕابەرایەتیکردنی ئەوانیتر و ڕێنماییەکانیانەوە بناسێت. ڕەخنە دەسەڵاتی فیودالیزمی گۆڕی بە دەسەڵاتی دەوڵەت و هەر ڕەخنەش دەسەڵاتی دەوڵەتی سنووردار کرد. ئێمەش دەبێت ئەو کارە بکەین: خودا و ئایین لەدەست دەمڕاستانی ئایینی بستێنینەوە و بیاندەینەوە بە تاکە مرۆڤی بڕوادار. پێویستە حکومەت لە حیزب و میرزادە حیزبیەکان بستێنینەوە و بیدەینەوە دەست یاسا و پێویستیشە کۆمەڵگا لەدەستی ستەمکاری و نادادەوەری بستێنینەوە و بیدەینەوە دەست ئازادی. ئەمانە سێ بواری سەرەکیی ڕەخنەیەکن، لە هەمان کاتدا کە تێکدەدا و هەڵدەوەشێنێتەوە، بینا دەکات و ڕێکدەخات و هاوسەنگیی بەدی دەهێنێت. ئەمانە ئەرکیی سەرەکیی ڕەخنەیەکن کە بە دیدێکی فەلسەفیانەوە، چالاکیی دەنوێنێت و لەو کاتەدا کە زانینە چاوبەستەکان هەڵدەوەشێنێتەوە، عاشق و ئەڤینداری دانایی و حیکمەتە..

# ڕاوی فەلسەفی،
# ڕاوکردنیی فەلسەفە!

دەکرێ بارودۆخی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستان بە سەردەمی ڕاوکردنیی فەلسەفە ناوبەرین. ڕاوکردنی فەلسەفە جگە لە دەرهاویشتنەدەری هزرین لە ژیان چیتر ناگەیەنێت. بەشەکانی فەلسەفە لە ژێر هەڕەشەدان. قوتابییەکانی دانامەزرێن، مامۆستاکانی هاودەنگ نین، بەرنامەیەکی چوونیەک و یەکگرتوو نیە. لە قوتابخانەکاندا وانەی فەلسەفە هەتا ئێستاش کتێبێکی وەرگێردراوی وشکی کۆن بووە و وەزارەتی پەروەردە ئامادە نیە ئەم کتێبە بە مەنهەجێکی داندراوی ئەمڕۆییتر بگۆڕدرێت. کە دەشگۆڕدرێت ئەو کەسانە بەشدارییان پێناکرێت کە لە فەلسەفەدا شارەزان و توانای ئامادەکردنەوەی بەرنامەیەکی وانەی فەلسەفەیان هەیە بۆ خوێندن. شارەزایی پەروەردەییانە لە دانانی بەرنامەی خوێندنی فەلسەفەدا پێویستە نەک تەنیا شارەزاییەکی ڕێژەیی لە مێژووی فەلسەفەدا. ئەمەش کاری فەلسەفەکارانە نەک بوارە پسپۆڕییەکانی دی. لە زۆرینەی بەشە زانستییەکان و کۆلێژەکانیشدا، وانە فەلسەفییەکان لابراون، یان

ناخوێندرێن، یاخود لەوانەش خراپتر: لەلایەن شارەزایانەوە ناگوترێنەوە. ئەمە جگە لەوەی خودی فەلسەفەکاران وێنەیەکی باشی کارایی فەلسەفەیان لە کۆمەڵگا و کایەکانیدا پێشکەش نەکردووە. لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، ئیرادەی سیاسیی ئێمە هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە لە سایەی بنەما فەلسەفیەکانیدا برەو بە ڕەوتی زانستیی و ئەکادیمیکی و پرانسیپەکانی خۆی بدات، کە فەلسەفەیان لە پشتە. ڕاوکردن لەمە زیاتر چی؟

هەڵبەت بەشێک لەم کێشانە دەگەڕێنەوە بۆ سرووشتی فەلسەفە و شارەزاکانی خۆی، ئەمە جگە لەوەی فەلسەفە وەک شێوازێکی بیرکردنەوەی جیاواز، وەک بەشێ لەو کایە مەعریفییەی کە دانایی مرۆڤ کێشەی هەرە سەرەکییەتی، هەمیشە ڕاوکراوە و بۆخۆشی ڕاوچیی بووە. فەلسەفە سەرەتا بە ڕاوکردن و ڕاوەدوونانی پێش فەلسەفە دەستیپێکرد و چوارچێوەی داناییناسیی، ئەفسانەکان، شیعر و ئایینەکانی سنووردارکرد. چەند نمویەک: (تالیس)ی خەڵکی شاری (ماڵتا)، وەک یەکەم فەیلەسووف لە سەدەی شەشەمی پێش زاییندا، بە پەنابردنی بۆ میتۆدێکی ئەزموونی و تێبینیکردن، بە سەرنجدانی لە گۆڕان و دیاردەکان و دۆزینەوەی یاساکانیان، بە دۆزینەوەی خاڵی هاوبەشی نێوانیان و گشتاندنیان بەسەر هەموو دیاردە و

ڕەگەزەکاندا، بناخەی تێگەیشتنێکی ئەقڵانیی لە جیهان دارشت. تاڵیس بەمکارەی دابڕانێکی داناییناسیانەی لەبەرامبەر داناییناسیی ئەفسانەیی و شیعریی و ئایینیدا دروستکرد و بە مرۆڤی گوت: تۆ دەتوانیت بە زەین و هۆش و ئەقڵی خۆت لە جیهان تێبگەیت و ئەوەی کە هەیە ئەزموون دەکرێ و ئەوەی ئەزموون بکرێ شیاوی ناسین و تێگەیشتنە.. ئەم قسەیە بۆمبی ناپاڵم بوو! ئەمە یەکەم ڕاوکردنی فەلسەفیانەی بیرکردنەوە پێش فەلسەفییەکان بوو. بەم مانایەش فەلسەفە بۆخۆی ڕاوچییەکی سەرەتایی و دڵڕەقبووە بەرامبەر شێوازەکانیتری بیرکردنەوەی پێش خۆی.

سوکرات هەر بەمەشەوە نەوەستا و بە ئاشکرا لە گۆڕەپانی شاردا یەخەی تاکەکەسەکانی دەگرت و هەڵیدەپێچان تا بیروڕای خۆیان لەسەر بابەتێکی دیاریکراوی وەک خۆشەویستی، دادەوەری، جوانیی و بەوجۆرە دەرببڕن و پاشانیش ناچاری دەکردن هەر خۆیان گوێ لەو هەڵانە بگرن کە تێی کەوتوون. سوکرات لە فەلسەفە شانۆیەکی دروستکرد، کە تیایدا تاکەکەس دەبوو بەشێک بێت لە نومایشکردنی خۆی و لە هەمان کاتیشدا بینەری ڕیسواییەکانی خۆی بێت. سوکرات پێی وابوو دەتوانێ بە یەکبەیەکی بەرامبەرەکانی بسەلمێنی، کە ئەوان لە ئاستێکی

هەڕەمەکیدا بیر دەکەنەوە و ئەو زانینەی دەیزانن، بایی ئەوە ناکات کە بزانن نەزانن. سوکرات نێچیرەکانی خۆی دەخستە بەردەم دێوی نەزانیی خۆیان و بەمجۆرەش ڕیسوای دەکردن. سوکرات ڕاوچییەکی دڵڕەق بوو، لەوەش ناچێت لەو کاتەدا کە ئەمکارەی دەکرد، زانیبێتی سوپایەک لە دووژمن بۆخۆی و بۆ فەلسەفە تەییار دەکا. پاشانیش لە دادگادا، هەر ئەم سوپایە و دوای ئەوەی نێچیرەکانی ببوون بە داوی بیرکردنەوە هەڕەمەکیەکانی خۆیانەوە، کۆک بوون لەسەر ئەوەی: دەبێت ئەم راوچییە مەزنەی نەزانی، نەزانانە دادگایی بکرێت و ناچار بە خواردنەوەی ژەهر بکرێت. سوکرات، دیسانەوە زانایانە بەرگریی لەخۆی کرد، بەڵام داوای لێبووردنی نەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا نەزانیی گرەوەکەی بردەوە و فەرمانی مەرگیی بۆ دەرکرد.

ئەفلاتوون کۆی ئەم دیمەنەی بینی، یان بیستبووی، بەڵام هیچ وانەیەک لە سوکراتەوە فێر نەبوو: هەر کە مامۆستاکەی ژەهرخواردوو کرا، خێرا ئەسپابەکانی ڕاوکردنی سوکراتیانەی خڕ کردنەوە و کەوتە پەلاماردانی گرووپی سۆفیستەکان و بە هەمان شێوەی کە سوکرات نەزانانی ڕیسوا دەکردن، ئەویش کەوتە خولیای بە نەزان لە قەڵەمدانی سۆفیستەکان و بە هەر چوارلادا بەدناوی کردن. ئەفلاتوون تەنیا ئەو کاتەی دەچووە ڕاوی سۆفیستەکان و

هەندێ لە فەیلەسووفانی سرووشتی لە پێش سوکراتدا، دەیتوانی بیر بکاتەوە و بیرکردنەوەکانی خۆی لە میانەی قسە وتن و سزادانی ئەوانەوە بەیان دەکردن. ئەفلاتوون لە فەلسەفە شمشێرێکی تیژی بە بڕبڕەپشتی بیرکردنەوەی جیاوازدا چەقاند و پلانێکی وەهای داڕشت کە سۆفیستەکان لە شانۆی فەلسەفەی یۆنان بکاتە دەرەوە. ئەفلاتوون هەچەندە شیعە نەبوو، بەڵام لە هەڵوێستیدا بەرامبەر بە غەیرە شیعە، لە مالیکی دەچوو، یان لە هەندێ لە سەرۆک زانکۆکانی هەرێمی کوردستان لە ڕاوکردنی فەلسەفەدا.

چەم بێ چەقەڵ نابێت و خزمخزمێنە و مەنسوبیەت و مەحسوبییەت هەمیشە هەر هەبووە: ئەریستۆتالیس ماوەیەکی زۆر وەک شاگردی ئەفلاتوون لە ئەکادیمیادا مایەوە. بەڵام خۆپەرستیی و چینپەرستیی و خزمخزمێنەی ئەفلاتوون، ئەم قوتابیە زیرەکەی لە میراتی ئەکادیمیا بێبەش کرد و ئەمەش بووە هاندەری ئەریستۆتالیس، تا لە نزیکترین هەلدا لە گرنگترین خاڵی هەستیارانەی بیرکردنەوەی ئەفلاتوون بدات. ئەریستۆتالیس، هەمان هەڵوێستی ئەفلاتوونیی لە دژی سۆفیستەکان، بەسەر ئەفلاتوون خۆیدا تاقییکردەوە. ئەریستۆتالیس، بووە ڕاوچیەکی زیرەکیی مامۆستاکەی بەبێ ئەوەی لە زۆرینەی کاتدا هەمان ئەو ئامرازانەی ڕاوکردنی پێشینەکەی بەکار

بهێنێ. ئەرستۆتالیس ئەوەندە داهێنەر بوو، کە دەیزانیی بۆ ڕەخنەگرتن و ڕاوکردنی مامۆستاکەی، نابێت کەرەستەکانی ڕاوەڕەخنەکەی لەوەوە وەربگرێ، چونکە ئەمە بۆخۆی چوونەوە باوەشی مامۆستایە. بۆیە بەبێ ئەوەی چاوەڕیی ئەوەبێت ناوی لە لیستی داهێنەراندا بێت، کەرەسەتەی داهێنەرانەی بۆ ڕاوکردنی ئەفلاتوون داهێنان و ئەکادیمیایەکی تری کردەوە و ئەسکەندەری مەکدۆنی فێری فەلسەفە کرد، بەڵام ئەسکەندەر ڕاوچییەکی باشی سەردەمەکەی خۆی لێدەرچوو..

فەیلەسووفەکان و فەلسەفەکاران هەمیشە ڕاوکراون، بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست و لەلایەن دەزگای کەنیسەوە. ڕاوکەرانی فەلسەفە هەمە جۆرن، لە خوێندەوار و سیاسیەوە تیایاندایە تا ئەو مامۆستایانەی فەلسەفە کە پسپۆڕییەکەی خۆیان بەکار دەهێنن بۆ پڕکردنەوەی گیرفانیان و هەموو جۆرە سازشێک لەسەر حسابی فەلسەفە دەکەن و بە لۆژیک و ئەقڵیش پاساو بۆ کار و هەڵوێستیان دەهێننەوە. بەڵام ئەمانە هەرچەندە موالیدی خۆشیان بگۆڕن، دواجار خانەنیشینی ڕاویان دەکات..

فەلسەفە لە ڕاوکردنەوە دەستیپێکرد و خۆیشی ڕاوکرا. هەمیشە نەیار و دوژمن بۆی هەیە بە شێواز و ئامرازەکانی خۆت، لە دژت بوەستێتەوە و لەسەر خۆشت تاقییان

بکاتەوە، بۆ ئەوەی بۆت ئاشکرا ببێت، شتێک لە نادادوەریی لە هەموو ڕەفتار و هەڵسوکەوتێکدا هەیە، ئەگەر ئەوەمان لەگەڵ کەسانیتر نەکرد، کە بۆخۆمان پێمان خۆشە لەگەڵمان بکرێت..

ڕاوکردنی فەلسەفە بە هەمان شێوەی ڕاوی فەلسەفی نادادوەرانەیە. ڕەتکردنەوە، وەلانان، بەپەراوێزخستن، کەمکردنەوەی بەها و بێڕێزیی لە هەردوو کردەکەدا ئامادەییان هەیە. ئازادیی بیروڕا، هیچ ڕیزپەڕێکی تیا نیە، تەنیا ئەوە نەبێت کە بیروڕا خزمەت بە شەڕانییەت و بەرژەوەندیی هاوبەشی بوونەوەر و ژینگە بکات و لە دژیی مافی یەکسانیی بوون بێت بۆ هەموو بوونەوەرێک. چونکە بوون هەبوونی خۆی بەسەر بوونەوەردا بە یەکسانیی دابەشکردووە، ئەوە نەبێت کە هەندێک لە بوونەوەرەکان ماوەی ژیان و هەلومەرجی مانەوەیان لەگەڵ ئەوانیتر جیاوازەو نایەکسانیی تێدایە. ئەم نایەکسانییە، نایەکسانییەکی سرووشتیە، چونکە لە بوون خۆیەوەیەتی.

مرۆڤ، گوناهبار نیە لەوەی ئاسکێک لەناو جەنگەڵدا بێچووی دەبێت و پڵنگێک دەمودەست ڕاویی دەکات و دەیخوات!. مرۆڤ ئەوکاتە گوناهبارە کە هەلومەرجی مانەوەی مناڵە تازە لە دایکبووەکەی خۆی لەوەدا ببینێت، کە ڕاوی بێچووە ئاسکەکەی بۆ بکات. لە ڕوانگەی

سرووشتیی بوونەوە، مافی بوونی گورگێک، یان مێشوولەیەک هەمان مافی هەبوونی مرۆڤێکە. نایەکسانیی لە ئاستیی بوونەوەرەوە دەستپێدەکات، نەک لە بوونەوە. بۆیە چ ڕاوەفەلسەفە و چ ڕاوکردنیی فەلسەفی هەردووکیان ناڕەوان، چونکە وێنەی یەکسانیی بوون لە هەبوودا دەشێوێنن. ئەو کاتەی بوونەوەر ڕاوی بوونەوەری تر دەکات لەبەر ئەوەی بیروڕای جیاوازە، یان شێوەژیانێکی جیاوازتری هەیە، نایەکسانیی و شێواندنی بوون لەسەر دەستی بوونەوەر دەستپێدەکات.

ئەم نایەکسانییە سەرەتای شێواندنی ژیان و شیرازەی بەرجەستەبوونی بوونە لە بوونەوەردا. بوونەوەر بوونی خۆی بە پێچەوانەی دادوەریی بوونەوە، لە دژی بوون خۆی بەکار دەهێنێت بۆ ئەوەی بتوانێ بوونەوەریی دیکەی پێ بچەوسێنێتەوە و مافێک بە خۆی ببەخشێت لەسەر حسابی هەبوونی ئەوانیترەوە. لەبەر ئەوە، ڕاوکردن بەناوی فەلسەفەوە لە دژی بیروڕای تر، بە هەمان ئاست ناڕەوایە وەک ڕاوکردنیی فەلسەفە لە پاڵ بیروڕای دیکەدا.

ئەوەی ئەمڕۆ لە هەرێمی کوردستاندا دەکرێت، ڕاوەفەلسەفەیە نەک ڕاوکردنی فەلسەفیی. ڕاوکەرانی فەلسەفە هەمە چەشنن. پێش هەموویان ئەو هێزە ئیدارییەیە کە بەناوی یاسا و دەسەڵاتەوە ڕاوی فەلسەفە دەکات.

لادانی وانەکانی فەلسەفە و وتنەوەی وانەکانی فەلسەفە لە زانکۆکانی هەرێمدا لەلایەن ناپسپۆڕانەوە، ڕاوەڕووتێکی ئاشکرای فەلسەفەیە. بەخشینی بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا لە بواری فەلسەفەی ئەدەب و فەلسەفەی مێژوو، یان فەلسەفەی وەرزش و فەلسەفەی سیاسی، بەبێ بەشداریی شارەزایانی فەلسەفە، جۆرە ڕاوکردنێکی ئاشکرایە. نەبوونی هەماهەنگیی زانستیی و ئەکادیمیک لە نێوان بەشە زانستیەکاندا و سنوور دانەنان بۆ ئەم تاکڕەهەندییەی زانست، شێوەیەکی تری راوکردنی فەلسەفەیە. بەکارهێنانی پسپۆڕانی فەلسەفە لە دژی بەرنامە و بیرکردنەوەی فەلسەفیی و پابەندکردنی ئەم بەشانە، بە وادەی ناڕاست بۆ بەرزکردنەوەی پلەی زانستییان و ناچارکردنیان بە ملکەچبوون بە ڕێنمایی ستۆک بووی زانکۆییەوە، کە بەدەگمەن ڕەچاوی سرووشتی زانستە مرۆییەکان و کۆمەڵایەتیەکانیان تێدا کراوە و بە بێ پێشنیار و ڕاوێژکردن بە فەلسەفەکاران، داڕێژراون، شێوازێکی تری ڕاوکردنیی فەلسەفەیە.

دەستێوەردانی حزبیی و سیاسی لە کاروبارە زانستیی و ئیدارییەکانی زانکۆکانەوە، فۆرمێکی سنووردارکردنی ئازادیی بیروڕا و ئازادیی بیرکردنەوەی فەلسەفیانەیە. نەبوونی بنەوانێکی دادوەرانە لە لیژنەی پەروەردە و لیژنەی

خوێندنی باڵای پەرلەمانی کوردستان بۆ ڕێکخستنی ئازادیی توێژینەوە و ئازادیی چالاکیی زانستیی لە زانکۆکاندا، فۆرمێکی تری راوکردنی بیروڕای جیاواز و بیروڕای فەلسەفەیە. نەبوونی ڕێکخسن و دانانی پرۆگرامی هاوبەشی خوێندن لە نێوان وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا، لە نێوان سیستەمی بنەڕەتیی خوێندنی فەلسەفە و خوێندنی فەلسەفە لە زانکۆکاندا، شێوازێکی تری بێزراندنی فەلسەفە و ڕاوکردنیەتی لە دامودەزگا پەروەردەیی و فێرکارییەکاندا. نەبوونی لیژنەی فەلسەفە لە ئەکادیمیای کوردستان، نەبوونی پسپۆڕانی بواری فەلسەفەی ماف و فەلسەفەی سیاسیی و فەلسەفەی پەروەردە و فەلسەفەی ئاکار لە وەزارەتی داد و وەزارەتی پەروەردە و وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان و ڕاوێژنەکردن لەگەڵ شارەزایانی ئەم بوارانە، جگە لەوەی وەردەرنانی زانستی ئاکاریی پزیشکی و زانستی سیاسیی و پەروەردەییە لە پێکهاتەی ئەم وەزارەتانە، ئاواش هەوڵێکی تری راوکردنی فەلسەفەیە. دەرکردنی فەرمانیی زانکۆیی و کاگێڕی لەلایەن سەرۆکی زانکۆ و ڕاگرەکانەوە بۆ گواستنەوەی قوتابیی لە بەشێکەوە کە تیایدا سەرکەوتوو نیە و بە هۆی واسیتەکردنەوە سەپاندنیی بەسەر بەشەکانی فەلسەفەدا، ڕاوەڕووتێکی فەلسەفەیە بەناوی پۆست و

واسیتە و سەرۆکایەتیکردنەوە. ناردنی لێشاوێک لە قوتابیی لەلایەن ناوەندیی وەرگرتنەوەو بە پیچەوانەی حەز و ویستی قوتابیانەوە بۆ بەشەکانی فەلسەفە، کردنی ئەم بەشانەیە بە شوێنێک بۆ کەڵەکەکردنی قوتابیانی ناڕازیی نەک ڕێزگرتن لە پرانسیپەکانی بەشی زانستیی و لەبەرچاوگرتنی حەزی نەوەی دوارۆژ بۆ هەڵبژاردنی بواری خوێندن لەو بەشەی دەیەوێ تیایدا بخوێنێ. هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی بێ بەهانەی مامۆستا لە نیوەی ساڵدا و دانانی مامۆستای نا پسپۆڕ لە بواری وانەکانی فەلسەفەدا، هەموویان بەشداریکردنن لە ڕاوە فەلسەفەدا. بەپەراوێزخستنی فەلسەفەکاران لە میدیاکاندا و گرنگی نەدان بە بەرهەم و بەشداریی پێنەکردنیان لە دیبەیتی جڤاتیدا و ناوزڕاندنی ئازادەبیران و ڕەخنەکارانی فەلسەفی، هەموویان دەچنەوە بواری ڕاوە فەلسەفەوە. بەو دیوی تریشدا، گەشەسەندنی بیروڕای توندڕۆخوازی و سەلەفیزم و هزریی تەقلیدی و بەهێزکردنی فۆرمەکانی فەندەمەنتاڵیزمی ئایینی و سیاسیی و ئیداری و کولتووری هەموویان دروستکردنی ڕێگرن لەبەردەم هزرینی فەلسەفیدا..

بەمجۆرەش، ئێمە لەسەردەمی ڕاوکردنی فەلسەفەدا دەژین. ڕاوە فەلسەفەیەکی ئاشکرا و ڕوون و دروستکردنی

نایەکسانیی زانستیی لە سایەی پۆست و ئیدارەیەکی زانستیانەی ناڕەوادا. بۆ ئەوانەی ئاگادارن لە مێژوو، بە ئاسانی لەمە تێدەگەن: هەر کات و سەردەمێک ئاسۆکانی دیارنەبووبن و توندڕەوی باڵادەست بووبێت، فەلسەفە و بیرکردنەوەی جیاواز و ئازاد کەوتونەتە بەر شاڵاوی جۆربەجۆر. سوکرات لەوەها زەمینەیەکدا، کە بەناوی دیموکراسییەتەوە چێکرابوو، بەڵام توندڕەوان سوودیان لێوەرگرت، ناچار بە خواردنەوەی ژەهر کرا. ئیبن ڕوشدیش بە هەمان شێوە و چەندانی تر.. بەرەئەنجامی ئەم ڕاوکردنەی فەلسەفە، شتێکی باش نابێت و تەنیا کۆمەڵگا و بواری زانستەکان و ئیدارەکان و نەوەی دوارۆژ باجە قورسەکەی دەدەن.. سەردەمی ڕاوە فەلسەفە سەردەمێکی توندوتیژاویە، سەردەمی بێڕێزیکردنە بە بیرکردنەوە و خۆشەویستیی بۆ دانایی.. فەلسەفە لەم سەردەمەدا، وەک هەر باڵندەیەکی غەمگینی لێدێت کە لە ترسی ڕاوکردنی، لە گۆشەیەکدا هەڵکورماوە، یان بەدەستی ڕاوچییەکانەوە گیانی لەدەستداوە..

ئەم سەردەمە نەک هەر پێشبینی کراو بوو، بەڵکو ڕەنگە ئەمە سەرەتاکەی بێت و شتی دیکەش بەڕێوە بێت و فەلسەفەش وەک هەر شتێکی دیکەی مرۆیی بکرێتە قوربانییەکی تری ئەقڵییەتی بیزنسزمانی و قازانج و بازاڕ..

لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ سەردەمێکی مێژوویی و هیچ کۆمەڵگایەک نەبووە، وەک کۆمەڵگای ئێمە، پێشئەوەی تیایدا فەلسەفە بە مانا تایبەتیەکەی، وەک شایەتێک لەسەر هەبوونی ئازادیی ڕادەبڕین و بیروڕای جیاواز، لەدایک ببێت و کەچی تا سنووری بێدەنگ کردن و لەناو بردن دژایەتی سیستەماتیکیانەی بکرێت. ئەمە نەک هەر سرووشتی ئەو کۆمەڵگایە، بەڵکو سرووشتی ئەو سیستەمە سیاسیەشمان پێدەناسێنێ، کە حوکمی کۆمەڵگا دەکات و لە ئاست دەستدرێژییەکان بۆسەر فەلسەفە بێدەنگیی هەڵدەبژێرێ. چونکە ئەوە ژیریی سیستەمێکی سیاسیی ئاشکرا ناکات کە ڕێگە بە سانسۆرکردن و ڕاوکردن و چەوساندنەوەی بیری فەلسەفیی بدات، بەڵکو ئەوە لە غیابی ژیریی و لە سایەی ئەو سیستەمەدا فەلسەفە ڕاو دەکرێت.. بۆیە ڕاوکردنی فەلسەفە لە هەمان بنەوانی ناهووشیارییەوە سەرچاوە دەگرێت کە سیستەمە سیاسیەکە بەڕێوە دەبات..

# بنەمای فەلسەفیانەی ئومێد

ڕەنگە بنەمای ئومید بەر لەوەی بابەتێکی فەلسەفیی پەتی بێت، وەکئەوەی لەلای ئەفلاتوون و نەریتی ئەفلاتوونی، ئەریستۆتالیسی و ئاگۆستینیدا، تا دەگاتە ئەرنست بلۆخ و ئەوانیتر، دەبینرێتەوە، بابەتی فۆرمەکانی دیکەی بیرکردنەوەی پێش فەلسەفی بووبێت، کە خۆیان لە فۆرمی بیرکردنەوەی ئەفسانەیی و شیعری و ئایینیدا دەبیننەوە.
فەلسەفەش، چ لە مێژووی خۆیدا و لە گەڕانیدا بۆ ڕاستەقینە، چ لەو مژدەیەش کە هەڵگریەتی بۆ گەیشتن بە ڕاستەقینە لە ئەنجامی پرسیارکردن و دووبارەکردنەوەی پرسیارەکانیەوە، بیرکردنەوەیەکە ئومیدەواریی دروستکەرە.
من زۆرجاران بەبێ پەیڕەویکردن لە نەریتێکی فەلسەفیی تایبەت، یان فەلسەفەیەکی تایبەت، بۆچوونەکانی خۆم لەسەر شتی سادە و ئاسایی ژیانی ڕۆژانە دەنووسم و هیچ چاوەڕوانییەکیشم نیە ئەمکارەی من بخرێتە ناو نەریتێکی هزری و ڕۆشنبیریی تایبەتەوە. چونکە نامەوێت پەیوەستبوونم بە نەریتێکی تایبەتەوە، لە نووسین ڕامبگرێت و بموەستێنێت!

لە نووسیندا جۆرێ لە بەردەوامی و ڕزگاریی دەبینم تا بتوانم چێژی ئازادیەکانی خۆم بکەم. ئومێد یەکێکە لەو بارودۆخە زۆر ئاسایی و سادانەی کە هەر مرۆڤێک لە هەر ساتەوەختێکی ژیانیدا بە شێوەیەکی شاراوە یان ئاشکرا لەلای بەرجەستە دەبێت. تەنانەت ئەو کاتانەی تەواو نائومێدیشە، ئومێدی بەیانکردنی نائومێدی بۆی دەبێتە ڕێگایەکی ئومێدەوارانە. من ئەم ڕێگایەم هەڵبژارد و دەمەوێت لەم وتارەدا بوونی ئومێد وەک مەرجێکی بوونناسیانەی مرۆڤ بخەمە ڕوو، کە پێشمەرجە بۆ هەموو بەرگریی و بەرگەگرتنێکی مرۆییانە، لە ژیانی واقیعیی خۆیدا. ئەگەر وا نەبوایە، مرۆڤ هەرگیز نەیدەتوانی بەرگەی ئازار و مەینەتیەکانی ژیان بگرێت و بە وادەی چوونە بەهەشتەوە، دەردەکانی واقیعی ژیانەکی خۆی ئەزموون بکات. لەبەر ئەوە، ژیان لەسەر عەرد بۆ مرۆڤ، بەدیلی بەهەشت نیە، بەڵکو پڕۆڤەکردنە بۆ چوونە دۆزەخ. لەبەر ئەوەش کە لە پلانیی خواییدا، تەمەنی دۆزەخ کورتخایەن و شایانی کۆتایی پێهاتنە، ئەوە مرۆڤ لە دۆزەخیشدا، چجای سەرزەوی و واقیع، ئومێد لەدەست نادات..

مرۆڤ لە بنەمادا بوونەوەرێکی تووڕدراو، دەرکراو، ئاوارەکرا و تاراوگەییە. نیشتیمانی ڕاستەقینەی مرۆڤ سەر

زەوی نیە، ناو گژوگیا و درِک و داڵ و دڕندەکان نیە، بەڵکو ئاسمانەکان و بەهەشت و ناو فریشتەکانە و سرووشتی بەهەشتیانە، کە شیر بە جۆگاکانیدا دێتە خوارەوە، تەواو جیاوازە سرووشتی دنیای فیزیکی و ماتەریاڵیانەی جیهان.
بەڵام بۆچی مرۆڤ بەم چارەنووسە گەیشت و تووڕهەڵدرا و فڕێدرا و ئاوارە کرا؟ ئەمە هیچ پەیوەندیی بە خوداوە، بە مانا میتافیزیکیەکەیەوە، نیە. ئەو خودایە بەرپرسیار نیە لە چارەنووسیی مرۆییانەی مرۆڤ، ئەو تەنیا بەرپرسیارە لە چارەنووسی فریشتەییانە و ئاسمانیانەی مرۆڤ. خودا مرۆڤی لە پلە و پێگەی فریشتە و هەبووە ئاسمانیی و پیرۆزەکاندا ئەفراند. خودا مرۆڤی لە بەهەشتا دانا، خودا متمانەی بە مرۆڤ بەخشی تا ناو بۆ شتەکان بدۆزێتەوە و هەر شتێ مرۆڤ ناوی لێنا، ئەو ناوە بۆی بوو بە چارەنووس. خودا لە ئەفراندندا مرۆڤی کردە هاوبەش و هاوکاریی خۆی و متمانەی بە مرۆڤ بەخشی تا کارەکەی تەواو بکات.
جگە لە هەموو ئەمانە خودا کە بەخۆی تاک و تەنیا بوو، لەکەسنەبووی کەس لێنەبوو بوو، یەک بوو، تاکەیەتی و یەکایەتی بوو، هەستا فرەیی بە مرۆڤ بەخشی و توانای بەردەوامیی و نەوەخستنەوەی پێبەخشی و کردیە سەروەری سەر عەرد و ژێر ئاسمانان. لەسەر و هەموو

ئەمانەشەوە، بەشێ لە خۆی بە مرۆڤ بەخشی تا بەهۆیەوە بەردەوام بواری گەڕانەوەی بۆ بەهەشت و جیهانیی خودایی بۆ بهێڵێتەوە. خودا ڕۆحی بە مرۆڤ بەخشی و ویستی ئازاد و توانای ئاخاوتن و ئەقڵی بە مرۆڤ دا، تا بەهۆیانەوە بتوانێ ئاراستەی گەڕانەوە بۆ بەهەشت و جیهانی ئاسمانان دیاریی بکات.
لێرەشەوە، خودا هەر لەسەرەتاوە نەیدەویست مرۆڤ تەنیا و بێکەس و سەرگەردان بێت، نەیدەویست مرۆڤ نا ئومێد و ئاوارە بێت و نەیشیدەویست هەڵەکانی مرۆڤ بکات پاساو بۆ داخستنی دەرگاکانی بەهەشت و گەڕانەوەی بۆ جیهانی ئاسمانەکان.
خودا بە میزاجێکی مرۆییانەوە، لەگەڵ مرۆڤ مامەڵە ناکات، بەڵکو بە ئیرادەیەکی خواوەندییەوە، کە بەخشین و هەلبەخشینەوە بە مرۆڤ یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی. ڕەنگە لە ساتەوەختێکدا خودا لە دروستکردنی دنیا و کائینات پەشیمان بووبێتەوە، یان نا ئومێد بووبێت، وەکئەوەی لە ساتەوەختی تۆفانەکەدا بە گێڕانەوەی کتێبە ئاسمانییەکان، بیستوومانە.. بەڵام بۆ دەرچوون لەم پەشیمانیی و نائومیدبوونە هەر خودی مرۆڤی سەرپشک کرد تا بەهۆی ئەقڵ و ویستی خۆیەوە، کەشتیی ڕزگاریی بۆ گشت بوونەوەران چێبکات و لەدەست لافاو، کە وەک

سڕینەوەی گشت خراپییەک و پیسییەک بوو بە جیهانەوە، ڕزگاریان بکات.
مرۆڤیش ئەقڵی هەیە و ئیرادەی هەیە. مرۆڤ توانای جیاکردنەوەی خراپ لە چاک و ڕاست لە هەڵەی هەیە. مرۆڤ بەهۆی ئیرادەیەوە، ئازادیی هەیە بۆ ئەوەی بە ئیرادەی ئازادیی خۆی لە میانەی ئەو ژیانەدا کە پڕە لە جیاکردنەوەی ساتەوەختەکانی چەوت لە هەڵە، درۆ، لە ڕاست، ڕەها لە ڕێژەیی، خراپە لە چاکە، ویستی ئازادانەی خۆی بچەسپێنێ بەسەر هەر بڕیارێکدا کە ژیانێکی ئازادانەی لێدەکاتە ژیانێکی ناخۆش و پڕ لە کۆیلایەتی و ستەم.
بە کورتی، مرۆڤ دەتوانێ بیر بکاتەوە و سرووشتی ئەم بیرکردنەوەیەش ویستە بۆ ژیان و بەردەوامیی. مرۆڤ بۆ ئەوەی بژی پێویستە بیر بکاتەوە، چونکە ژیانێکی بێ بیرکردنەوە، ژیانێکە پڕ لە ستەمکاری و ناچارەکی. ئەو مرۆڤەی بیر دەکاتەوە، جگە لە چەسپاندنی ویستی خۆی بۆ بەردەوامیی و ژیان، ئاواش لە دژی ناچارەکی و ستەم دەجەنگێ، چونکە بیرکردنەوە لە بنەمادا مەبەستی بەرجەستەبوونی ئازادیە وەکئەوەی ژیانی مرۆیی پێویستیی پێیەتی و بەهۆیەوە، دەبێتە ژیانێکی ئازاد.

ژیانێکی ئازاد هەمیشە ژیانێکی بەختەوەرانە و ژیانیکی ئومێدەوارانە نیە. ژیان ڕەوتیی مانەوەیەکە لە ناو واقیعێکی دیاریکراودا. مادامەکی مرۆڤ جیهانی ئاسمانیی و بەهەشتەکی ڕەتکردەوە و ویستە جەوهەرییەکەی بۆ ئازادیی و بیرکردنەوە، ناچاری کرد ئەوێ جێ بهێڵێت، پێویستە بشزانێت کە جیگرەوەی ئاسمان و بەهەشت، واقیعە.

واقیع پڕە لە ئازار و مەینەتیی و ناخۆشی. بەڵام شوێنی بیرکردنەوەی مرۆڤیشە، شوێنی بەرجەستەبوونی ویست و خۆسەلماندنیشە. بیرکردنەوەی مرۆڤ لە واقیع، زۆرجار مرۆڤ بە نائومێدی و تەسلیمبوون و تێکشکان دەگەیەنێت. لەبەر ئەوەیە کە بیرکردنەوە هەمیشە خۆشیبەخش نیە، بەڵکو ئازاربەخشە. هووشیاری، کە ئەنجامیی بیرکردنەوەی مرۆڤە لە دۆخی خۆی، هەمیشە مژدەی پێ نیە، بەڵکو گریان و دۆشدامان و رەنجی پێیە. هەموو ئەو بیرکردنەوانەی مژدەی دوورکەوتنەوە لە ڕەنج، بە مرۆڤ دەبەخشن، لە هەمان کاتیشدا دەیانەوێ مرۆڤ لە واقیع داببڕن و بێ هۆشی بکەن.
هەوڵدان بۆ بیربردنەوەی واقیع لەلای مرۆڤ، جۆرێکە لە بیهۆشکردن، چونکە بنەمای سەرەکیی هاتنەخوارەوەی

مرۆڤ لە بەهەشت، بنەمای تاقیکردنەوەی مرۆڤ بۆ ویست و ئیرادەی خۆی و لاساریی لەبەرامبەر پرانسیپە بەهەشتییەکاندا، نیشانەی پێگەیشتوویی مرۆڤی پێوەیە تا ئەو ئاستەی بتوانێ لە نێو واقیعدا بژی.

خودا کە مرۆڤی لە بەهەشتەوە هەناردە خوارەوە، لە دوو شت دڵنیابوو: یەکەم، دەیزانی مرۆڤ بوونێکی یاخییگەرانەی هەیە و یاخیبوون بەشێکە لە شوناسی مرۆڤبوون. خودا مرۆڤی لە مرۆڤ خۆی باشتر دەناسی، چونکە ئەو ناسینەی مرۆڤ لەسەر خۆی هەیەتی و پەیدای دەکات، ناسین و خۆناسینێکی پاشئەزموونیە، کە بەهۆیەوە لە کەموکورپیی و کەمتوانایی و سنووردارپیی دەسەڵاتەکانی خۆی تێدەگات. بەتایبەتی لە ئاست سرووشت و ئاژەڵاندا. ئەو دەزانێت لە هەنگ ئیشکەرتر نیە، بەڵام کار دەکات. دەزانێت لە شێر ئازاتر نیە، بەڵام لەبەرامبەر شێردا ترسنۆکی ناکاتە پیشەی. مێشوولەیەک بەسە بۆ مردنی، بەڵام ئەو خۆی بە دەست مەرگەوە نادات، چونکە لەمەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئیرادە و بەرگەگرتنی مەرگ.

بەمجۆرەش، مرۆڤ لەگەڵ ناسینی خاڵە لاوازەکانی خۆیدا، لاوازیی ئاژەڵانیتریشی بۆ دەردەکەوێت و لێرەشەوە بیر لە بەراووردکاری خۆی بە ئاژەڵان دەکاتەوە. ئەم بیرکردنەوەیە باوەڕداریەکەی پتەو دەکات و بەردەوام

دەبێت لە ژیان. ئەو بۆی دەردەکەوێت، قسان دەکات، ویستی هەیە و باوەڕ و ئەقڵ و ئەمانەش ئومێدی گەڕانەوە بۆ بەهەشتی پێدەبەخشن.

لە لایەکیترەوە، ناسینی خودا بۆ مرۆڤ، ناسینێکی جەوهەری و دەرە ئەزموونیە و بە پێی ئەو ناسینە خوداییەش، مرۆڤ هەم بوونێکی یاخیگەرانە و هەم بوونێکی ئیرادەمەند و بوێرانەی هەیە بۆ ئەوەی لە ژیانیدا خۆی تاقیبکاتەوە. خودا بۆی دەرکەوت، مرۆڤ پێویستی بەو تاقیکردنەوە و خۆسەلماندنە هەیە و چیتر ناکرێت پێگەیشتوویی ئەو لە چوارچێوەی سرووتی پاکیزەیی بەهەشتیانە و پاسیڤانەی ئاسمانیدا، کۆنترۆڵ بکرێت. خودا لە مرۆڤەوە فێربوو، یان دڵنیابۆوە، کە ئەم فریشتەیە پرانسیپە بەهەشتییەکان پێشێل دەکات، بۆیە ئاگایی پێبەخشی، تا سزای بدات و ئاگایی و هووشیاری بکاتە سەرچاوەیەکی ئازاربەخش بۆ فریشتە مرۆڤ.
خودا لەم ئەزموونەوە، لەو ساتەوەختەوە کە فریشتەمرۆڤ، بەهۆی هووشیارییەوە، بەرەو مرۆڤبوون گۆڕا، کە لە جەستەیەکی گۆشتن و بەهۆی شەرم و هەستکردن بە گوناهەوە، خۆی بەرجەستە کرد، نەبووە ڕێگر لەبەردەم سرووشتی ململانێخوازانەی مرۆڤدا. خودا دەروازەی

ژیانێکی عەردیانەی لەسەر مرۆڤ کردەوە، بەبێ ئەوەی دەروازەی عەرشی مەلەکوتیانەی لەسەر دابخات. خودا مرۆڤی لە بەهەشت بێبەریی کرد، بەڵام ئەقڵ و بیرکردنەوە و ئیرادەی لێنەسەندەوە. خودا، مرۆڤی بە خۆی بەخشی و سەربەخۆی کرد تا بەهۆی بیرکردنەوەکانییەوە، ڕاستەڕێی ژیانی خۆی بەرەو ڕاستەقینە بدۆزێتەوە. خودا مرۆڤی بەرپرسیارکرد، بەڵام بەرپرسیاریی سەرەکیی چارەنووس و ژیان و مەرگی ئەم مرۆڤە هەر خۆی بوو.

دووەمیش، خودا لەو ناردنەخوارەوەیەدا، دەیزانیی واقیعێک هەیە لەسەر زەوی، کە مرۆڤ ڕووبەڕووی ویست و بیرکردنەوەی خۆی دەکاتەوە، تا بتوانێت لە میانەی ململانێکانیدا بە ئازادیی بگات. بەهەشت شوێنی ململانێ نەبوو، هەروەکچۆن شوێنی ئازادییش نەبوو، چونکە بۆ ئەوەی ئازادیی هەبێت، پێویستە ململانێ هەبێت و ململانێ زامنکەری ئازادییە. بۆیە واقیع، بەدیلی بەهەشتە و سەرزەوی تاکە پانتاییەکە بۆ ئەوەی مرۆڤ ململانێکانی خۆی بۆ ئازادیی و خۆشبەختی و ئومێد، تێدا بکات. ژیانی عەردیانە ئەزموونکردنیکی پێشوەختیانەی دۆزەخە و دۆزەخیش لە پلانی خوادا تەمەنێکی کورتخایەنی هەیە..

بیرکردنەوە بۆ مرۆڤ ئازاربەخش بووە، چونکە تەنیا بیرکردنەوەیە کە واقیع لەبەردەم مرۆڤدا ئاشنا دەکات. ئەم

ئاشنابوونەی مرۆڤیش بە واقیع، هەم هەستی پەشیمانیی یەکەمین گوناه و هەڵەی لەلا زیندوو دەکاتەوە، هەم ئازاری دەدات و کەڵکەڵەی نائومێدی و تەسلیمبوونی دەخاتە سەرەوە و چەپاندنی تێدا دروستدەکات، هەم ئیمانیش لەم دۆخەدا بەهێز دەبێت و ڕزگاریی دەبێتە خەون. بەڵام ڕزگاریی بەهۆی ئیمانەوە، لە کاتێکدا مرۆڤ دەکەوێتە بەردەم هەڕەشەکانی واقیع، بەهۆی پەنابردن بۆ توندوتیژیی بەدەست نایەت، وەکئەوەی لە واقیعدا دەیبینین. ڕێگای ئیمان وەک ئاگۆستینی قەدیس گوتویەتی، تێگەیشتنێکی ئەقڵانیانەیە لە ئیمان، کە ڕێگای ڕزگاریی مرۆڤە.

لەگەڵ ئەوەشدا چییە وا دەکات مرۆڤ دوای ئاشنابوونەوەی بە واقیع و دەردەکانی، بەردەوام بێت لە ژیان و بەرگریی و خۆڕاگریی؟ وەڵامەکە ئەمەیە: بنەما زگماکەکەی ئومێد لە مرۆڤدا. بەبێ ئومێد مرۆڤ نەیدەتوانی بەرگەی یەک مێشوولە بگرێ، چ جای برسیەتی و ڕەنج. لێرەدا بیرکردنەوە چ وەک ئامراز و ڕێگای ناساندنی واقیع لەبەردەم مرۆڤدا و چ وەک ناساندنەوەی بنەمای ئومێد بە مرۆڤ، بە فریامان دەکەوێت. ئومێد بەشێکە لە مرۆڤ. ئەم بیرکردنەوەیە هەر جۆرە فۆرمێکی بیرکردنەوە نیە، بەڵکو فۆرمی بیرکردنەوەیە لە خۆشەویستیی بۆ زانین. ئەو

فۆرمەیە لە بیرکردنەوە کە سەرسووڕمان و پرسیار لە مرۆڤدا بەرجەستە دەکات. ئەمە بیرکردنەوەی فەلسەفیە کە لەلایەکەوە مرۆڤ ڕزگار دەکات لە بیرکردنەوەی عامییانە و لەلایەکترەوە مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێگای عەودالّبوون و گەڕان بەدوای وەڵامی پرسیارەکانیدا بۆ ئەوەی بگات بە چارەسەر و ڕزگاری. هەر بۆیەشە مرۆڤ لەم گەڕان و عەودالّبوونە ناوەستێ و بەردەوامە، چونکە دەزانێت ڕاستەقینە لەو دیو ئەو واقیعەوەیە کە ئەو تووشی ئازار و نەزانیی دەکات. هەر بۆیەشە فەلسەفە هەگیز دانوستان و مفاوەزات لەسەر ڕاستەقینە ناکات. مرۆڤ تەنیا لە گەیشتنیدایە بە ڕاستەقینە، دەبێتە مرۆڤێکی دانا. فەلسەفەش ڕێگای گەیشتنە بە دانایی، یان ڕێگای خۆشویستنی داناییە، دانایی ڕێگای ڕاستەقینەی گەیشتنە بە ئازادی. بەمجۆرەش فەلسەفە هیچ نیە لە ڕێگایەک کە ئومێدی ڕاستەقینە لە مرۆڤدا بێدار دەکاتەوە، تا بیگەیەنێت بە ئازادیی ڕاستەقینە. جگە لەم جۆرە ئازادییە، فەلسەفە لەبەرامبەر هەرجۆرە ئازادیی و ڕزگاری و مژدەیەکی ساختەکارانەدا، کە لە واقیعێکی دیاریکراودا مرۆڤیان پێ چاوبەست دەکرێت، هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانەی هەیە.

ئازادی، نیشتیمانی ڕاستەقینەی مرۆڤە و هەتا مرۆڤ ئەم نیشتیمانەی خۆی نەدۆزێتەوە، بوونەوەرێکی تووڕدراو، دەرکراو، ئاوارەکرا و تاراوگەکراوە..

# لەدایکبوونی فەلسەفیانە

لەدایکبوونی فەلسەفیانە مانایەکی مەجازیانەی هەیە لەو دیو وشەی لە دایکبوون و فەلسەفەوە: لەدایکبوون، دەربڕینێکی فیسۆلۆژیانەیە کە ئاماژە بە جیابوونەوەی منداڵ لە داییک دەکات لە ڕووی فیزیکیەوە، ئەم دەربڕینە بۆ هەموو گیاندارە شیرەخۆرەکانیش ڕاستە و دەربڕی ئاستێکی هاتنە جیهانی بوونەوەرەکانە بە جەستەی خۆیانەوە. ئەم دەربڕینە لە زمانیی شیعریشدا باوە و بۆ هاتنەدنیای بەرهەم و بیرۆکە و خەیاڵێک بەکار دەهێنرێت، کە پێشتر نەبووبێت، یان بیر و خەیاڵی لێنەکرابێتەوە.

لە ئایینەکانیشدا ساتەوەختی لەدایکبوون ئاماژەیە بە جیاکردنەوەی دوو زەمەن لە یەکتری کە مێژوو دابەش دەکەنە سەر پێش و پاش ئەو ساتەوەختە و ئەمەش ساتەوەختی لەدایکبوونی پێغەمبەران و ساتەوەختی هاتنەخوارەوەی سرووش و ساتەوەختی وەرچەرخانی ڕۆحیی مرۆڤی پەیامبەرە. بەپێی ئەم تێڕوانینە کات دابەش دەبێت و ئەو بەشە لە کاتی هەنووکە دەکەوێتە پاش دەمەکانی تری کاتەوە، کە لە پێشدا هەبوون. کاتی پێشوو کاتی تاریکایی و نەزانیی و کاتی پیس و نەهامەتی و

سەرلێشێواویی مرۆڤ و کائیناتە و کاتی پاش لەدایکبوونیش، زەمەنی پیرۆز و ڕووناکایی و مژدەیە.

لە زانستیشدا لەداییکبوون هەیە. لەدایکبوونی زانستیانە پەیوەندیی هەیە بە بیرۆکەی تێگەیشتنێکی ماتماتیکیانەوە لە بوون، کە تیایدا کات دابەشدەکرێت بۆ بێکۆتا و بێسنووری یەکەی زەمانیی، کە هەریەکەیان نیشانەن بۆ سەرهەڵدان و دۆزینەوەیەکی زانستی. لە زانستدا هیچ کاتێک پیرۆز نیە و پیرۆزیی لە زانستدا لە کات دەسەنرێتەوە. تەنانەت هزری زانستی ساتەوەختی دۆزینەوە و داهێنانە زانستیەکانیش بە پیرۆز تەماشا ناکات و تەنیا ژمارەیەکیان لە ساڵ و ڕۆژ و مانگ پێدەبەخشێت کە بۆی هەیە بەهۆی ساڵ و ماگ و ڕۆژی دیکەوە پووچەڵ بکرێنەوە و جێگەیان بگیرێتەوە. لە زانستدا، بە پێچەوانەی ئایین و شیعرەوە، ڕەوتی کات بازنەیی و دەورانیی نیە و هەموو وەرچەرخانێک و تێپەڕینێکی کات ناگەڕێتەوە سەر هەمان ئەسڵی پیرۆزی خۆی کە ساتی دەستپێکردنی بووە، بەڵکو لە زانستدا، کات بەشێوەیەکی ئاسۆیی تێپەڕ دەبێت و بەردەوامیی بەرەو بێکۆتا وەردەگرێت.

مرۆڤ و گیانداران لە کۆمەڵگاشدا لەداییک دەبن. لەدایکبوونی کۆمەڵایەتی پەیوەستە بە وەرگرتنی ڕۆڵ و پێگە لە کۆمەڵگادا. مرۆڤ لە تەمەنی خۆیدا و لە قۆناغگەلی

جیاوازدا ئەرک و پێگەی کۆمەڵایەتیانەی خۆی وەردەگرێت و ئەمەش بۆی دەبێتە لەدایکبوونی کۆمەڵایەتی. لەدایکبوونی کۆمەڵایەتی مرۆڤ، پەیوەستیشە بە هووشیاری و بەشداریی کۆمەڵایەتیەوە، کە میکانیزمگەلێکی دەسەلاتن بۆ لە چوارچێوەگرتنی تاکەکەس لەناو جەبری نۆرمە کۆمەڵایەتیەکاندا و بە چاودێریی دەسەلاتە کۆمەڵایەتیەکان. بۆیە زۆرجار لە کۆمەڵگا داخراوەکاندا، کە تاکەکەس تەنیا بەو ملکەچیەیدا بۆ نۆرمە کۆمەڵایەیەتیەکان و دەسەلاتە کۆمەڵایەتیەکان، هەڵدەسەنگێنرێت، ئەم لەدایکبوونە کۆمەڵایەتیە مانایەکی پێچەوانە وەردەگرێت و بۆ تاکەکەس وەک لەبارچوونی لێدێت. لەبارچوونێکی هزری و ڕۆحی و کولتووری تاکەکەس. بەم مانایەش، لەو کۆمەڵگایانەدا کە پێوەری کۆمەڵگا بۆ هەڵسەنگاندنی تاکەکەسەکان، ڕاددەی ملکەچی و ئیتاعەیان بێت بۆ دەسەلاتە کۆمەڵایەتیەکان، تاکەکەس وێڕای بوونە جەستەییەکەی لە کۆمەڵگادا، پێویستی بە لەدایکبوونێکی کولتووری و هۆشمەندانەش هەیە، کە بتوانێت بەهۆیەوە خودی خۆی ڕزگار بکات لەو نۆرمانەی کە لە پای چەپاندنی ڕەهەندە خودیەکانی کەسایەتیدا، لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە دانی پیادەهێنێت و هەرکاتێکیش بیەوێت وەک ڕانەمەڕ، هانیدەدات بۆ ئەو

چالاکیە پەرچەکرداریانەی کە نە دەربڕی خودێکی تەندروست و نە ئەنجامی بیرکردنەوەن.

مرۆڤ بوونەوەرێکی تاک و تەنیاشە. تەنیایی بەشێکی هەرە سەرەکی ئێمەیە کە هەندێجار لە دەستی ڕادەکەین و هەندێجاریش تیایدا دەپووکێینەوە و کەمەکێکیش تیایدا دەژین. ئێمە لەدایکبوونێکی سایکۆلۆژیانەشمان هەیە و ئەمەش لە پەنهان و دوورەدەستەکانی کەسایەتی و ناخی تاک بە تاکماندا ڕوو دەدات و بۆ هەندێکمان دەبێتە پشتیوان و بۆ هەندێکمان شێتی و بۆ هەندێکیشمان تێکەڵێک لە هەردووکیان. گەشەی دەروونیانەی مرۆڤ شتێکە لە دەرەوەی دەسەڵاتی خۆی و لەناو دەسەڵاتی کۆمەڵگادا و بەپێی مەرجە بۆماوەیی و کولتووریی و واقیعیەکان ئێمە جڵەو دەکات. ڕەهەندی دەروونیانەی کەسایەتی ئێمە ڕەنگدانەوەی واقیعێکی کۆمەڵایەتی و میراتێکی بۆماوەییە و جێدەستی ئەو دەسەڵاتانەیە کە بەناو ئێمەدا و بەهۆی ئێمەوە درێژە بە خۆیان دەدەن و هەندێ جار لە سەرکەوتن نزیکمان دەخەنەوە و هەندێک جاریش لە شێتی و تێکشکان. ئێمە لە ڕووی دەروونییەوە ئەو کاتە لەداییک دەبین، کە هۆکارەکان و هەلومەرجەکان و ئەزموونەکانی ژیانی تایبەت و گشتیمان، لە قۆناغگەلی جیاوازیی تەمەنی بایۆلۆجی و کۆمەڵایەتیماندا ڕێگری قورس و کارەساتی

سارپێژ نەبوویان بەسەردا نەهێنابین. لەدایکبوونی سایکۆلۆژیانەی مرۆڤ، یان تاکەکەس بە شێوەیەکی تەندروست، هەموو کات و سەردەمێک بە ئاسانی ڕوونادات، ئەگەر بێت و کۆی هۆکار و هەلومەرجە بۆماوەییەکان، هەلومەرجە بابەتیەکان و ئەزموونەکانی ژیانی تایبەتمان بۆ ئەو لەدایکبوونە ئامادە نەکرابن. تەنیا پێوەرێک بۆ لەدایکبوونی سایکۆلۆژیانەی تاکەکەس، ڕەنگە بڕ و ڕادەی ئەو ئاسوودەیی و لەخۆڕازیبوونە بێت، کە تاکەکەس لە قۆناغەکانی ژیانی تایبەتی خۆیدا هەستی پێدەکات و لەوێوە هاوسەنگیی و ئارامیی بۆ ژیانی دەگەڕێتەوە.

لەدایکبوونی فەلسەفیانە لەدوای هەموو ئەمانە دێت: هەرچەندە پرسیارە فەلسەفیەکان تایبەت و پابەندی قۆناغەکانی تەمەنی جۆریی و ڕەگەزی و تاکەکەسیانەی مرۆڤ نین و بۆی هەیە لەهەر تەمەنێکی نەوعیانە و ڕەگەزیانە و تاکەکەسیانەی مرۆیەکاندا پرسیاری فەلسەفیی بۆ مرۆڤ بێنە پێش، بەڵام لەدایکبوونی فەلسەفیانە ئەزموونێکە لە ژیانی کۆمەڵایەتیانەی تاکەکەسانێکدا ڕوودەدات کە ئەو لەدایکبوونە لە جەستەیەکی ترەوە، لەسەرچاوەیەکی دیکەوە نەبێت و جیابوونەوەیەکی بایۆلۆژیانە و کۆمەڵایەتیانە و لە ئەنجامی هاوسەنگیە

سایکۆلۆژیەکانیشەوە نەبێت. من لەسەرەتاوە کاتێ نووسیم: لەدایکبوونی فەلسەفیانە مانایەکی مەجازیانەی هەیە لەو دیو مانای لە دایکبوون و فەلسەفەوە، مەبەستم ئەوە بوو بڵێم ئەم لەدایکبوونە تەنیا بەو مانایە لەدایکبوونە لە کات و شوێنێکدا، کە هەر تاکەکەس بۆخۆی دایکە سکپڕەکە و منداڵەکە و هۆکاری سکپڕیەکەشە. سوکرات یەکەم کەس بوو، خستنەڕوویەکی مەجازیانەی بۆ فەلسەفە فێرکردین و پێیگوتین: کاری فەیلەسووف مامانیکردنی هزرە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تەندروست لەدایک ببێت، هەروەکچۆن کاری مامانەکانیش یارمەتیدانی دایکانی سکپڕە بۆ ئەوەی هەم کۆرپەکانیان و هەم بۆخۆیان تەندروستانە بژین. بەم مانایەش بێت لەگەڵ هەموو هزرێنێکی فەلسەفیدا دەکەوینە بەردەم لەدایکبوونێکی نوێ و ئەمەش پێویستی ژیانە بۆ بەردەوامیی خۆی. کۆرپەی فەلسەفە بیرکردنەوە و پرسیارکردنە. ئەوەی کە فەیلەسووفێکی وەک سوکرات وەک کۆرپە مامەڵە لەگەڵ بیرکردنەوەدا دەکات، چییەتی بیرکردنەوە دەبەستێتەوە بە بەردەوامیی نەرێتی ژیان خۆیەوە هەروەک چۆن بەردەوامیی نەوەی مرۆڤیش وەک بیرکەرەوەیەک، بەندە بە لەدایکبوونی بەردەوامی نەوەی نوێوە.

لەدایکبوونی فەلسەفیانە ساتەوەختی جیابوونەوەی هزرە لە ناو بیرکردنەوەدا و بەدەنگهاتنی و خۆمانیڤێست کردنیەتی لە پرسیاردا. پرسیار دەنگی ڕۆح و بەرجەستەکەری زیندوێتی هەبووە لە فۆرمی تایبەتی خۆیدا. هەبوو لەناو بووندا بەبێ پرسیارکردن، بەبێ ڕاڕایی و گومانکردن، بەبێ سەرسووڕمان و هەڵوسەتەکردن، ڕەهەندە پاسیڤ و پەرچەکردارییەکەی بوون دەژی بەبێ ئەوەی بتوانێ ئەم بوونەی خۆی هەڵگێڕێتەوە بۆ بوونێک، کە ئەو تیایدا بکەرێکی خاوەن ویست و پرسیارە.. لێرەشەوەیە کە مرۆڤ بەبێ پرسیارکردن ژیانێکی کۆمەڵایەتیانە و سایکۆلۆژیانە و کولتووریانەی سەپاو دەژی و هەرگیز ناتوانێت فەلسەفیانە لەداییک ببێت و سیستەمی ئەقڵانیانەی ژیان و ڕۆحیانەی هەستکردنی خۆی، ڕێکبخات. ئەمەیە مرۆڤە تەنیا و بێکەسەکەی کانت بەزەیی پێیدا دێتەوە و پێیدەڵێت، دەبێت خۆی لەو بارە هەرزەییەی تێیکەوتووە، ڕزگار بکات و هۆشی خۆی بەکار بهێنێت.

لە فەلسەفەدا هەموو شتێک هەموو بابەتێک وەکخۆی و لەخۆیدا جێگەی پرسیارکردنە، چونکە فەلسەفە بەرلەوەی پرسیار بکات، تێبینی دەکات و گوێدەگرێ و هەستەکان دەخاتە کار. پرسیار بەردەوامیی و درێژبوونەوە خودە لە دەنگیی پرسیاردا، نەک لە ماتیی و پەرچەکرداری

هەستەکیدا. بۆیە خود کاتێ هەست دەکات، بوونی بایۆلۆجیانە و غەریزەییانەی خۆی دەسەلمێنێ و کاتێکیش پرسیار دەکات و هەستەکانی دەکاتە دەنگ، بوونی فەلسەفیانەی خۆی ڕادەگەیەنێ و وەک بەردەوامیدان بە ژیان و بوون، کۆرپەی هزرین دەخاتەوە. بۆیە ئەگەر فەلسەفە ساتەوەختێکی (پیرۆز)ی هەبێت، ئەو ساتەوەختە دەبێت ساتەوەختی پرسیارکردن بێت و لە دەرەوە و لە پێشەوەی پرسیارکردن، ئاستەکانی دیکەی لەدایکبوون و ژیانکردن و هەستکردن و ئەزموونکردنمان هەیە. مرۆڤ تەنیا بە پرسیارکردن لە چییەتی بوون و بە گۆڕینی بێدەنگیی و ماتیی بە دەنگ و پرسیار و بە گۆڕینی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ جیهان و بابەتەکان، لە پەیوەندییەکەوە، کە تیایدا جیهان و بابەتەکان کاریگەریی هەستەکیی دەکەنە سەر و داگیریی دەکەن، بۆ پەیوەندییەک کە تیایدا ئەو لە ڕێگەی پرسیارەکانیەوە، چییەتی شتەکان دەگۆڕێت و دووبارە پێناسەیان دەکاتەوە، فەلسەفیانە لەدایک دەبێت.

لە دەرەوەی پرسیار جەهەندەم چاوەڕێی مرۆڤ دەکات و پەلکێشی دەکاتە ناو ئاگرە سوتێنەرەکەی خۆیەوە، کە ئێمەی نەزان بە درۆ و بۆ خۆهەڵخەڵەتاندن و چاوبەستکردنی خۆمان و نەوەکانمان، پێیدەڵێین: واقیع..

واقیع هیچ نیە لە دەسەڵاتی دۆزەخێک، کە بە دەستە شاراوە و درێژەکانی لەکاتێکدا ڕاپێچی ناو حەقیقەتی خۆیمان دەکات، بەسەرماندا دەقیژێنێ: من پیرۆزم و دەبێت ملکەچ و تەسلیمم ببن و بمپەرستن. لەدایکبوونی فەلسەفی بەدیارکەوتنی ئەو مرۆڤە ڕیوەڵەیەیە، کە ئەم ترسە لە پیرۆزیی واقیعە دۆزەخیەکە ڕەتدەکاتەوە و دەڵێت: ئەمە حەقیقەت نیە! وەکئەوەی منداڵەکە هاواری کرد: پاشا هیچی. لەبەردا نیە!

# فەلسەفە و شەڕ

پێش چەند ساڵێک، کە هێشتا ئەو کتێبەی فەیلەسووفی نەرویجی، (لارس سڤینسن) (*Ondskabens filosofi*, Klim 2001)م نەخوێندبۆوە، کە بەناوی فەلسەفەی شەڕانییەت، یان خراپییەوە بڵاوی کردەوە و من لە بەشێکی تری ئەم باسەدا دەگەڕێمە سەری، ئەم پرسیارەم لە خۆمدەکرد: شەڕانییەت چییە؟ ئایا شەڕ تەنیا گرژبوونەوەی جەستە و خۆ ئامادەکردنێتی بۆ هێرشکردنە سەر ئەوانیتر، یاخود پلاندانان و نەخشەکێشانێکی عەقڵانیانەی مرۆڤە بۆ بەکارهێنانی هەموو هێزەکانی خۆی تا بەو شتە بگات کە دەیەوێ، بەبێئەوەی بۆخۆی بدۆڕێت؟ ئایا شەڕانییەت خەسڵەتێکە تایبەت بە ڕەگەزی مرۆڤ، یاخود سرووشت و ئاژەڵەکانیش لە ڕێگەی کارەسات و هێزە وێرانکارییەکانی خۆیانەوە مۆدێلێکی شەڕانییەتمان دەخەنە پێشچاو؟ ئایا بەرلەوەی من پەلاماری منداڵی هاوسێکەمان بدەم و قیژە لە پشیلەکەی ماڵمان هەستێنم، پێشتر نەمدیوە و هەستم نەکردووە گەورەکان چۆن پەلاماری خۆمیانداوە و چۆن پشیلەکەش بە چنگوڕ پەلاماری مشکەکانی داوە؟

وەڵامی هەموو ئەمجۆرە پرسیارانە ئەرێییە. ئەمانە دیاردە و نیشانەی جۆرەکانی شەڕانییەتن لە دەوروبەری ئێمەدا و

کاریگەرییشیان بۆسەر پێکهاتە و گۆڕان لە سرووشتی مرۆڤانەماندا هەیە. لەم نمونە پرسیارانەوە تێدەگەین شەڕانییەت دیاردەیەکی بەتەنیا مرۆیی نیە، لە سرووشتدا و لەلای گیاندارەکانی دیکەش ئەم دیاردەیە دەبینرێ و هەیە. بەڵام کاتێ قسە لەسەر (شەڕانییەت وەک دیاردەیەکی مرۆیی) دەکرێ، ئیدی ئەوەی قسەی لەسەر دەکرێ (مرۆڤە)، نەک دەوروبەرەکەی. ئەو شەڕانییەتەی لە چنگوڕی پشیلە و هێزی ڕەشەبا و هالاوی گەرما و کزەی سەرمادا هەستیپێدەکەین و دەیبینین، دواجار شتێکمان لەسەر سرووشت و خەسڵەتەکانی پشیلە و ڕەشەبا و گەرمای هاوین و سەرمای زستان، پێدەڵێن. وەلێ هەموو قسەکردنێ لەسەر شەڕانییەتی مرۆیی، دواجار دەمانباتەوە بۆ قسەکردن و تێڕامان لە (مرۆڤ) خۆی و ئەمەش ئازار بەخشە، بەتایبەتی ئەگەر ئێمە لەوانە بین کە حەزناکەن کەس ئازار بدەن، یان بڕوایەکی پاکیزەمان بە مرۆڤ هەبێت کە بوونەوەرێکی بێزیان و بەدوورە لەهەموو بەدخووییەک.

بەڵام (جۆن هایک) وا ناڵێت، ئەو دەنووسێت: (شەڕ بە (ڕەنج و دەردی جەستەیی)، بە (ئازاری ڕۆحی) و (خراپەی ئەخلاقی) دەگوترێ. خراپەی ئەخلاقی یەکێکە لە هۆکارەکانی دروستبوونی دوانەکەی یەکەم، چونکە بەشێکی گەورەی ئازارەکانی مرۆڤ لە دڕندەیی و بێبەزەییبوونی

ڕەگەزی مرۆڤەوە سەرهەڵدەدەن. ئەم جەور و ئازارانە بەڵاگەلێکی گەورەی وەکو هەژاری، ستەم و سەرکوتکاری، ئازاردان و سزا، جەنگ و جۆرەکانی نادادپەروەری، تۆمەتبارکردن و کۆستخستن و نایەکسانی دەگرێتەوە، کە لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا ڕوو دەدەن).

ئەگەر ئەم پێناسەیەمان لەسەر شەڕانییەت بە گرنگ وەرگرت، دەبینین کە ئەم چەمکە زۆر بەرفراوانترە لەوەی لە کردەی تیرۆریستیانەدا بچووکی بکەینەوە. شەڕانییەت چەمکێکە نەک هەر لە کردەی تیرۆریستیانەدا، بەڵکو لە (شێوە ژیان)ی مرۆییدا خۆی بەرجەستە دەکات. لە خەباتیدا کاتێک ئەم خەباتە دەبێتە شەرعییەت بۆ نایەکسانی و نەبوونی عەدالەت و گەندەڵییە بە کولتووریکراوەکان..

بۆیە پێویستە بەوردبینانەترەوە و لە شوێنێکەوە بیر لە شەڕانییەت بکەینەوە و تیۆریزەی فۆرمەکانی بکەین. کاتێ لە ناوجەرگەی بازاڕ و شوێنە گشتییەکاندا، کاتێ لە سەیرانگا و مزگەوت و مەیدانەکانی شاردا، شەڕانییەت هەڕەشەی مەرگمان لێبکات، ئیدی بوارێک و پاساوێک نامێنێ بۆ بیرنەکردنەوە لەو دیاردەیە. کاتێ قوربانییەکان تا دێن زۆرتر و خەسارەتەکان مەزنتر و ڕووداوەکان چەندبارە دەبنەوە، ئیدی پاساوێک نامێنێ بۆ بیرنەکردنەوە و کورتکردنەوەی هەموو تراژیدیاکانی پاش کارەسات لە

هەواڵێکی ڕۆژنامەنووسیدا کە زۆرجار لە جیاتی ئەوەی جەوهەری دیاردەکەمان پێ بناسێنن، ڕۆڵی دەرمانێکی بێهۆشکەر دەگێڕن و هەستیاریی ئێمە بەرامبەر بە مەترسییەکان هێور و دەستەمۆ دەکەن، ئەویش بەجۆرێ کە وابزانین پێویست ناکات بیر لە دیاردە شەڕانییەکان بکەینەوە. بەڵام بەردەوامیی ئامادەیی ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا پێماندەڵێت: شەڕانییەت لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەبووە، هەیە و هەتا بە جیدی بیری لێنەکەینەوە و بەرەنگاربوونەوەی نەبێتە بەشێ لە پلانی ڕەسمی دەسەڵات و دیاردەکە نەبێتە بەشێ لە هووشیاریی گشتیی هاولاتیان، هەر دەمێنێ.

شەڕانییەت لەسەر ئاستی تاکەکەس بەشێکە لە ژیانی ڕۆژانەمان و مەترسییەکی گەورەیشە لەسەر بوون و مانەوەی کۆمەڵایەتیمان. بیرکردنەوە لە شەڕانییەت، شێوازێکی بەرەنگاربوونەوەی ئەم دیاردەیەیە، چونکە یەکێ لە ئامانجەکانی شەڕانییەت بریتیە لە بێدەنگکردن و بێبەهاکردنی بیر و هزرین. بۆی هەیە بتوانین بە شێوازی جۆراوجۆر لەدژی شەڕانییەت بوەستینەوە و کۆی ئیمکانییەتە تەکنیکی و سەربازییەکانمان لەدژی شەڕانییەت بخەینە کار، وەلێ ئەگەر نەمانتوانی بیری لێبکەینەوە، ئەگەر نەمانتوانی لەبارەیەوە بدوێین و توێژینەوەی لەسەر بکەین،

شەڕانییەت لەبەرگێکی دیکە و لە فۆرمێکی تر و بە هێزێکی گەورەترەوە دێتەوە ناومان بۆ ئەوەی دوایین دڵنیاییەکانمان لێبستێنێتەوە و بە سەرگەردانیمان بسپێرێ.
کەواتە ئێمە لەبەردەم جەنگێکی تازەداین، کە بەر لەوەی جەنگی سیستەم و دەسەڵات و دەزگا ئەمنییەکان بێت لە دژی شەڕانییەت، جەنگی تاکەکەس و ئەندامانی کۆمەڵگایە لەگەڵ ئەم دیاردە وێرانکەرە. ئەوەش ئەرکی سەرەکیی لایەنە ڕەسمی و دەزگاکانی کۆنترۆڵ و سەنتەرەکانی بڕیاردانە کە هەموو ئیمکانیەتێک بۆ تاکەکەس و ئەندامانی کۆمەڵگا بڕەخسێنن تا خۆیان بە خاوەنی ئەم جەنگە لە دژی شەڕانییەت بزانن و ڕووبەڕووی ببنەوە.

## دژواریی پێناسەکردن:

بۆیە پێویستە هەمان پرسیار دووبارە بکەینەوە: شەڕانییەت چییە و بەڕاستیی ئەم زاراوەیە چی دەگرێتەوە؟ لە مێژووی ئایینەکان، فەلسەفە و تیۆلۆژیادا پێناسەکردنێکی ستاندارد و هاوشێوە، کارێکی ئاسان نەبووە. بەشێوەیەکی گشتی دوو ئاقاری شەڕانییەتی مرۆیی دەبینینەوە، کە هەندێ لە توێژەران بە ئاراستەی (ڕەشبینانە) و (گەشبینانە) پۆلێنیان دەکەن. خاڵی جیاوازی بنەڕەتیی لە نێوانیاندا ئەوەیە کە گرووپی ڕەشبینەکان بڕوایان وایە مرۆڤ لە سرووشت و

جەوهەری مرۆییانەی خۆیدا شەڕانییە و بەلای یەزدانناسە مەسیحییەکانیشەوە، بەتایبەتی (ئاگۆستین و مارتین لۆتەر)، هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ (گوناهی یەکەم). بەڵام لەلای گرووپی دووەم ئەوەی شەڕانییەت دروستدەکات ژیانی کۆمەڵایەتی و پەیمانی کۆمەلایەتییە و مرۆڤ بەپێی ئەم بۆچوونە لە جەوهەری سرووشتیانەی خۆیدا نە شەڕانییە و نە ناپاک. بەڵکو ئەوە کۆمەڵگا و هەلومەرجە مرۆکردەکانن کە لە مرۆڤ بوونەوەرێکی مەترسیدار دروستدەکەن. وەک مژدەیەکی ناخۆشیش دەبێ ئەوە بگوترێ کە گرووپی ڕەشبینەکان لە گەشبینەکان زۆرترن! بەڵام بۆ ئەوەی بەم مژدەیە نەڕەنجێین، ئێمە لە باسکردنی چەند نمونەیەک لە یەکەمین گەشبینەکانی مێژووی فەلسەفەوە دەستپێدەکەین:

## فەلسەفەی کلاسیک:

## سوکرات، ئەفلاتوون و ئەریستۆتالیس:

لە یۆنانی دێریندا سوکرات (دەوروبەری: ٤٧٠-٣٩٩ پ.ز) بڕوای وابووە شەڕانییەت هیچ نییە لە سیمایەکی دیکەی نەزانین و نەزانییش تا ئەو کاتەی لەبەرامبەریدا هوشیار و ئاگاین، مەترسیدار نییە، وەلێ مەترسیی هەرە گەورە لە نەزانییەوە بەرامبەر بە نەزانی دەسپێدەکات و ئەمەش ڕاپێچمان دەکاتە ناو شەڕانییەتەوە.

بەلای ئەفلاتوونەوە بوونی شەڕانییەت پەیوەستە بە (بوونی جیهان)ەوە نەک بە (بوونی یەزدان)ەوە. بوونی جیهان لە تێڕوانینی ئەفلاتووندا بەر لەهەر شتێک بوونە لە ئاستێکی ماتەریالّی و مادییانەدا. هەموو شتێکی مادییش زیاد لە پێکهاتەیەکی هەیە و فرەییە، تەنیا ڕۆح نەبێت کە بوونی خۆی لە خۆیدایە و سادەیە و دابەش نابێت و هەر بۆخۆیشی سەرچاوەی وزە و بەردەوامیی و نەگۆڕیی خۆیەتی. ئەمەش بە پێچەوانەی ماددەوە کە بەردەوام لە گۆڕاندایە و لە دۆخێکەوە دەچێتە دۆخێکی دیکەوە و سەقامگیر نییە و شیاوی لەناوچوونە. کەواتە هەر شتێ سەقامگیر نەبێت، بوونێکی ساختەی هەیە، نەک کامڵ. بوونی ڕاستەقینە بوونێکی کامڵە و ئەمەش تەنیا لە جیهانی نمونەییدا هەیە، نەک لە جیهانی دیاردەکاندا. بۆیە شەڕانییەت بەڵگەیە لەسەر کەموکوڕیی و نقوستانییەک لە بوونی جیهاندا، چونکە بوونی نمونەیی بوونێکی کامڵە. بەمجۆرەش شەڕانییەت هەر لە جیهاندا دەمێنێتەوە و ڕێگای چوونە دنیای نەمریی نیە، چونکە نمونەیەکی نیە تا لە دنیای نمونەییدا پێوەی پەیوەست ببێتەوە.

لەلایەکیترەوە، بە بڕوای ئەفلاتوون شەڕ چ لە دنیای مرۆڤەکان و چ لە دنیای سرووشتەکیدا ئامادەیە. لە دنیای مرۆڤدا شەڕانییەت لە کەچڕەفتاری و کەموکوڕیی ئەخلاقیدا

بەرجەستە دەبێت و لە جیهانی سرووشتەکیشدا خۆی لە بێتوانایی و لاوازیی شتەکاندا بەرجەستە دەکات. بۆ نمونە لە لای بوونەوەرە هەستەوەرەکان شەڕانیەت لە ڕێگەی نەخۆشی و ئازار و بەڵاو نەهامەتی و دڕندەییەوە خۆی دەردەبڕێ. لە شتە بێگیانەکاندا لەو کەمایەسییەدا خۆی ئاشکرا دەکات کە ئەو شتانە نیانە بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆیان. لە دنیای سرووشتەکیشدا شەڕانییەت بریتیە لە ڕوودانی ئەو جموجووڵ و ڕووداوە نارێک و لەپڕانەی کە دەبنە هۆی ڕوودان و دروستکردنی پشێوی و سەرلێتێکچوون و سەرگەردانی..

فەیلەسووفێکی دیکەی دنیای کۆن ئەریستۆیە (٣٨٤-٣٢٢پ.ز)، کە بڕوای وایە سرووشت (فیزیک) پەیڕەوی لە یاسا و ڕێکخستن و نەزمێکی تایبەت دەکات کە لە خزمەتی مانەوەی خۆیدایە، بۆیە ناکرێت سرووشتی مرۆڤ لە جەوهەردا شەڕانی بێت چونکە ئەمە لە دژی ئەو ئامانجە ئەخلاقیەیە کە مرۆڤ لە ژیانی کۆمەڵایەتیانەی خۆیدا خەباتی بۆ دەکات و ئەویش خۆشبەختییە. واتە خۆشبەختی وەک ئامانجێکی سرووشتی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤ، ڕێدەگرێ لەوەی مرۆڤ ڕێگای شەڕانییەت هەڵبژێرێ.

لەبەرەبەیانی بیری کلاسیکیی یۆنانەوە تا دوا ساتەکانی هزری یەزدانناسی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، گەردوون وەک یەکەیەکی وەستاو و نەگۆڕ دەخرێتە ڕوو، کە مرۆڤ تیایدا لەنێوان (چاکە) و (خراپە)دا گیری خواردووە .
لەم تێڕوانینەدا ژیانی مرۆڤایەتی لەناو کەشوهەوایەکی تایبەتدا کە پێکهاتووە لە (خێر) و (شەڕ)، دابەشبووە و قەدەری مرۆڤیش ئەوەیە لە نێوان ئەم دوو هێزەدا یەکێکیان هەڵبژێرێت و لەگەڵیدا هەڵبکات. بەپێی ئەم جیهانبینیە پێویستە مرۆڤ بەرەو خێر و چاکە هانبدرێت و بە ڕاستیی ڕەها بگات کە دوور و ناکۆکە لەگەڵ خراپە و شەڕانییەتی ڕەهادا.

## لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە بۆ دواتر:

دەساڵ ڕاکردن و خۆشاردنەوەی ژان ژاک ڕۆسۆ (١٧١٢-١٧٧٨) لە دووژمنە ڕاستەقینە و وەهمییەکانی، خوێندنەوە گەشبینەکەی ئەوی بۆ مرۆڤ نەگۆڕی. ڕۆسۆ لەسەر ئەو باوەڕە بوو مرۆڤ لە قۆناغی سرووشتیدا، کە قۆناغێکی فەنتازیکراوی ئەو بوو بۆ خوێندنەوەی مێژووی مرۆڤایەتی، لە هەموو کاتێکی دی زیاتر نەرمتر و ئارامتر بووە. ئەوە تەنیا کۆمەڵگایە لە مرۆڤ بووەنەوەرێکی گەندەڵ و شەڕانی دروستدەکات .

بەپێچەوانەی ئەمانیشەوە ڕەشبینەکان لەو بڕوایەدان شەڕانییەت بەشێکی جەوهەری و جیا نەکراوەیە لە سرووشتی مرۆڤ خۆی. با چەند نمونەیەکیش لەوانە باس بکەین: فەیلەسووفی ئینگلیز، تۆماس هۆبس (١٥٨٨-١٦٧٩) ئەمەی دەگێڕایەوە بۆ ئەو نایەکسانییەی سرووشت لە نێوان تاکە مرۆیەکاندا دروستیدەکات و هەندێ توانا دەبەخشێتە کەسانێک و لە کەسانێکی دیکەی بێبەش دەکات. لەم نێوانەدایە کە شەڕانییەتی مرۆیی سەرهەڵدەدات و خۆوێرانکردن دنەمان دەدات بۆ وێرانکردنی ئەوانیتر.

شۆپنهاوەر (١٧٨٨-١٨٦٠) لە سەدەی نۆزدەدا بڕوای بەوە هەبوو کە جیهان لە جەوهەری خۆیدا شەڕانییە و ئەمەش شتێ بوو نیتشە (١٨٤٤-١٩٠٠) قەبووڵی نەدەکرد، چونکە بەلای ئەوەوە پرانسیپی یەکەم لە جیهاندا بریتیە لە ئیرادە بۆ ژیان و چەمکەکانی وەک چاکە و خراپەش هیچ نین جگە لە تەفسیرکردنێکی هەڵە بۆ ئەو پرانسیپە.

سیگمۆند فرۆید (١٨٥٦-١٩٣٩) کە بۆخۆی لە نزیکەوە ئەزموونی شەڕانییەتی جەنگی یەکەمی جیهانیی کردبوو، بیروڕایەکی ڕوونتری دەخستە ڕوو کاتێ دەیگوت: مرۆڤ لە جەوهەردا بوونەوەرێکی شەڕانییە و مرۆڤایەتی بە (کۆمەڵە جرجێکی بکوژ) لەقەڵەمدەدا کە لەودیو دروستکردنی ژیارەوە خۆیان شاردۆتەوە.

هەموو ئەم نمونانە ئاشکرای دەکەن، نووسین و قسەکردن لەسەر شەڕانییەت کارێکی ئاسان نییە، ئەمەش زیاتر لەبەر ئەوەی دەستنیشانکردنی سنووری بابەتەکە زەحمەتە. چونکە بەڕاستی شەڕانییەت چییە؟

ئایا دایک و باوکە ناکۆکەکان کە ماڵەکەیان پڕکردووە لە ئاژاوە، شەڕانین لەبەر ئەوەی منداڵی و گەنجایەتی منداڵەکانیان لەناو ئاژاوەکانی خۆیاندا نغرۆ کردووە؟ ئایا شەڕانییەت ئەوەیە کە ڕێگە بدەیت نزیکەی دووسەد ملیۆن منداڵ لە جیهاندا هەفتانە تاکو نزیکەی حەفتا کاتژمێر بە کەمترین مووچە کار بکەن؟ داخۆ بەستنەوەی مرۆڤێک بە پشتی پیکابێکەوە و ڕاکێشانی بەشاردا تا ئەوکاتەی ملی لێیدەبێتەوە، وەک ئەوەی مولازم تەحسین لە سلێمانیی هەشتاکاندا، دەیکرد، شەڕانییەتە؟ سەبارەت بە ئابلۆقەی بازرگانی بڵێین چی، کاتێ ڕێگە دەگرێ لەوەی وڵاتێک دەرمانی پێویست بۆ نەخۆشەکان بکڕێ و دەستی نەگات بەو کەرەستانەی کە پێویستن بۆ خاوێنکردنەوەی ئاوی خواردنەوە؟ ئایا ئەو یاریدەدەری پزیشکەی منداڵێکی ساوای دەبەیتە لا بۆ ئەوەی دەرزی لێبدات، مرۆڤێکی شەڕانییە؟ ئایا ئێمە کە زۆربەمان لە منداڵیماندا بە بۆق و قرژاڵ و چۆلەکە کوشتن دەستمانپێکرد، شەڕانین؟ چییە

وادەکات کچ و کوڕەکەمان هەموو شتێ بکەن بۆ ئەوەی دڵی دایک و باوکییان ڕابگرن و دەستلەملیان بن، کەچی هەر بەو دەستانەشییان نقۆڕچی جەرگبڕ لە یەکتر و لە بچووکترەکان بگرن؟

ئایا شەڕانییەت شەرعییەتدانە بە مانەوەی گەندەڵ و چەتەکان لە فۆرمێکی دەسەڵاتدا و سزدان و مووچەبڕینی کۆمەڵگایە بۆ ئەوەی ئەمانە بەهرەمەندی هەمیشەیی بن لە سوود و بەرژەوەدیەکان؟ شەڕانییەت چیە لە میدیایەک کە بەردەوام چاوبەست دەکات و سەپاندن و زۆر و توندوتیژی فیزیکی دەکاتە شتێکی ڕەمزیی و دەیخاتە ناو سیستەمێکی پەروەردەوە و یاسای بۆ دادەڕێژێت؟؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە جۆراوجۆرن و پەیوەستن بەوەی تۆ کێیت و بەرگری لە چ جۆرە بەهایەک دەکەیت. کاتێ بە شتێ دەڵێین شەڕاوی و بە کەسێ دەگوترێ مرۆڤێکی شەڕانی، گوزارشمان کردووە لە حوکمدانێک کە پەیوەستە بەوەی ئێمە چ بەهایەک بە بەهای باش و چاک دادەنێین. هەر لەبەر ئەمەش پێناسەکردنێکی گشتی و ستاندارد بۆ شەڕانییەت کارێکی ئەستەمە، چونکە پێویستە ئەو پێناسەیە پەرچکەرەوەی ئەو بەهایانە بێت کە بوونەتە بناخە بۆ شێوازی داڕشتنە زمانییەکەی. بۆیە گرنگە لە کاتی قسەکردنماندا لەسەر شەڕانییەت، هووشیاربین بەو

سنوورانەی ڕێگەمان پێدەدەن ئەم پێناسەیە بۆ دیاردەکە بکەین و ئەوانیدیکە پشتگوێ بخەین. کە ئەمەمان گوت، ئیدی هەر بەڵگە و پاساوێک هەبێت بۆ زنجیرە تەقینەوەکانی یەکی شوبات لە هەولێر و پاشان لە سلێمانی و کەرکووک و خانەقین، تەقینەوەکانی بەغدا و لەندەن و ڕووداوەکانی زاخۆ و سیمیل و سلێمانی و شوێنەکانی دی، ئەوە ئەو کارانە کارگەلێکی شەڕانیانەن. ئەوە شەری داعش شەڕانییەتە بەڵام لەوە شەڕانیتر ئەوەیە کە بەپرسی پەیوەندییەکانی دەرەوە بە بەرچاوی پێشمەرگە و خانەوادەکانیانەوە، بێ شەرمانە پێشوازیی لە پێشکەکەشکارێک دەکات و جۆری پێکەنین و ئەتەکیەتەکەی جەنابیان شەبەقێکی ئەخلاقی و نێرانە بەیاندەکات.. ئەو جۆرە پەلامارانە هەرگیز پاساوێکیان نییە و کەسە شەڕانییەکان بە هیچ شێوەیەک ناچار نەبوون ئەو کارانە بکەن، بەڵکو ئەوان بە ئارەزووی خۆیان و خۆبەخشانە ئەنجامیان داون بەبێئەوەی بەرپرسیار بن بەرامبەر بە ئەنجامی پەلامارەکانیان.

## جۆرەکانی خراپە و شەڕ

شەڕ لە ئەفسانەکان و حەکایەت و گێڕانەوەکاندا خۆش و سەرنجڕاکێشە، بەڵام لە واقیعدا ناخۆش و تراژیدیانەیە. لە

ژیانی واقیعیدا، شەڕ سەرنجڕاکێش نیە، بەڵکو کاولکارانەیە و ڕووخێنەرە، ئەمەش نەک لەبەر ئەوەی لە پشت شەڕەکانەوە، دەعبای حەوتسەر و ئەژدیهای ئەفسانەیی هەن، بەڵکو لەبەر ئەوەی مرۆڤی تەواو ئاسایی وەکخۆمان ئامادەن و خراپە بەرهەم دەهێنن. لەم ئاستەدایە، کە فەیلەسووفی نەرویجی، لارس ف. سڤینسن ، کتێبێکی لەبارەی فەلسەفەی شەڕەوە نووسیوە و ئەو خاڵە دەخاتە ڕوو، کە تێگەیشتن لە شەڕانییەت و شەڕخوازان لە ئێستادا بڕیاردەرە بۆ تێگەیشتنی ئێمە لە خودی خۆمان و ئەرکمان لە ئاست مرۆڤی دیکەدا.

هاندەر و بنەمای کارەکەی سڤینسن، کارەساتی هۆلۆکۆست و ئەو هەموو توندوتیژییەی کە لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بەرهەمهات، ئەمە جگە لە ئاگاداریی تەواوی ئەو، لە قەیرانە سیاسی و ئەخلاقیەکانی سەدەی بیستەم و ئەو میراتە فەلسەفییەش، کە لە سەدەی بیستەمدا لەبارەی شەڕ و خراپەوە نووسراوە. بەڵام دەبێت ئەوەمان لەیاد بێت، سڤینسن بۆخۆی زیاتر پەیوەستە بە بیروڕاکانی فەیلەسووفی ئەڵمانی (ئیمانۆیل کانت) و هەروەها (هانا ئارێنت)ەوە.

هانا ئارێنت، لە ساڵی ١٩٤٥ نوسیبووی، شەڕ و خراپە دەبێتە بابەتێکی سەرەکی بۆ ڕۆشنبیرانی دوای جەنگی

دووەمی جیهانی. ئەم قسەیەی ئارێنت لەکاتی خۆیدا زۆر دەنگدانەوەی نەبوو، بەڵام گرنگیدانەوەی پاشتری فەیلەسووف و توێژەران بە هۆلۆکۆست و جەنگە یەکبەدوای یەکەکانی تر، بایەخێکی زۆری بۆ قسەکەی ئارێنت پەیداکرد و چەندین کۆنفرانس و سیمیناری، بۆ نمونە لە پراگ و مەکسیکۆسیتی و کۆپنهاگن، بۆ سازکرا. ئەم کتێبەی سڤینسن، لەناو ئەو کەشوهەوا ڕۆشنبیرییەی خۆرئاوادا نووسراوە، بەڵام بە پێچەوانەی زۆربەی بەکارهێنانەکانی ئێمە بۆ زاراوەی شەڕ(Evil) ، ئەم فەیلەسووفە دێت و پۆلێنبەندییەک بۆ چەمکەکە دەکات، تاکو بۆمان ڕوونبکاتەوە، بۆچی ئێمە شەڕانین و ئەمەش گرنگترین بەشی کتێبەکەیەتی. ئەو لەم بەشەدا، چوار جۆر شەڕ لە سرووشتی مرۆڤ و کرداری مرۆییدا لێکتر جیادەکاتەوە، ئەویش بەمجۆرەی خوارەوە:

## یەکەم: شەڕانییەت لە پێناوی شەڕانییەتدا:

ئەمە ئەو جۆرەی شەڕانییەتە کە هیچ مەبەستێکی نییە جگە لەوەی کە شەڕانییەت و خراپە بنوێنێ. لە توێژینەوەکانی پاشتری هۆلۆکۆستدا، وەک سڤینسن ڕوونیکردۆتەوە، دەرکەوتووە کە زۆرینەی هەرەزۆری ئەو کەسانەی هەستاون بە نواندنی خراپە و شەڕ لە دژی مرۆڤەکان، هەر

مرۆڤی سادە و ئاسایی خۆی بووە. بەمجۆرەش شەڕانییەت لە پێناوی شەڕانییەتدا توانای تاکەکەسیی مرۆڤە بۆ نواندنی خراپە بەبێ ئەوەی بیری لێبکاتەوە. لە ئەدەبیاتیشدا نمونەی ئەم جۆری شەڕانیەتە دەبینرێتەوە. دیستۆفسکی لە ڕۆمانی (برایانی کارامازۆف)دا نمونەیەکی ئەمجۆرەی شەڕانییەتمان پێدەناسێنێ. لە شوێنێکدا (ئیڤان کارامازۆڤ) کە بڕواداریکی مەسیحییە، هەڵوەستە لەسەر ئەوە دەکات چۆن منداڵان لە جیهانێکدا کە لەژێر دەسەڵاتی یەزداندایە، ئازار دەچێژن و نمونەیەکیش بۆ ئەم ناعەدالەتییە باسدەکات: کۆمەڵێ جەندرمەی تورک لە شەمەندەفەرێکدا بەرەو ڕووسیا چاویان بە منداڵێک لە باوەشی دایکیدا دەکەوێت. تورکەکان دەکەونە ختووکەدانی منداڵەکە و دەیهێننە سەر پێکەنین و شنە شن. پاشان یەکێ لە جەندرمەکان دەمانچەکەی ڕووە و منداڵەکە ڕادەگرێت و ئەویش بە هەردوو دەستی شاڵاو دەهێنێ تا دەمانچەکەی لێوەربگرێ، بەڵام لەم کاتەدا جەندرمەکە بەلەپیتکەی دەمانچەکەی دەترازێنێ و هەر لە باوەشی دایکەکەیدا سەری منداڵەکە هەڵدەبێژێ.

نمونەیەکی دی بۆ ئەمجۆرەی شەڕانییەت کە لەواقیعەوە وەرگیراوە، بریتیە لە بەسەرهاتی مرۆڤکوژی ئەمەریکی (هێنری لی لووکاس): کاری ئەم پیاوە ئەوە بوو ژنان بگرێت و بیانبەستێتەوە و پێیان بڵێ کە ئەوان بەم زووانە

ڕۆحیان دەردەچێ و دەمرن. پاشان لووکاس یەک لەدوای یەک دەکەوتە قرتاندن و لێکردنەوەی پەنجەی قاچ و دەستەکانیان و بەوجۆرەش قوربانییەکان بۆیان دەردەکەوت تازە ژیانی ئەوان وێرانبووە، تەنانەت ئەگەر بە زیندوویش ڕزگاریان ببێت.

یەکێ لەو کەسانەی بەشێوەیەکی ڕوونتر کاراکتەری ئەمجۆرەی شەڕانییەتمان بۆ ڕووندەکاتەوە، (هیگڵ)ە. هیگڵ لە باسکردنی ناکۆکی و ململانێی نێوان (ئاغا و ڕەعیەت)دا، ئەوە ڕووندەکاتەوە کە توندوتیژی بەکارهێنان لەدژی کەسێک و بەکۆیلەکردنی، بۆ ئەوەیە دانمان پێدا بهێنێ و لەوێشەوە هەستبکەین کە ئێمە بەهایەکمان هەیە، شوناسمان هەیە و دەسەلاتمان بەسەر کەسانێکی تردا دەشکێ. بەڵام هاوشان بەم دەستکەوتانە، ئەوەندەی پێناچێ هیچ ڕێزێکیشمان بۆ ئەو کەسە نامێنێ کە خستومانەتە ژێر ڕکێفی خۆمانەوە. بۆیە ئیعتیراف و دانپیانانی قوربانییەکە بە ئێمە هیچ مانایەکی نامێنێ و ئەمەش وادەکات بەزوویی بکەوینە ئاوێزە و بەقوربانیکردنی مرۆڤێکی دیکە و بەوجۆرەش بەردەوامبین لە شەڕانییەتی خۆمان.

## دووەم: شەڕانییەتی ئامرازگەرا:

شەڕانییەتی ئامرازگەرا ئەو شەڕانییەتەیە کە تیایدا مرۆڤ سوور دەزانێت ئەوەی دەیکات خراپەیە، بەڵام هەر دەیکات

و وەک هۆکار و ئامرازێک تەماشای دەکات بۆ گەیشتن بە شتێکی باشتر و گرنگتر. لەمجۆرەی شەڕدا، ئەوەی گرنگە ئامرازەکەیە، نەک ئامانجەکە. بۆی هەیە ئامانجەکە باش بێت، بەڵام ئامرازەکە هەمیشە خراپە. نمونەی دیاری (سڤینسن) بۆ ئەمجۆرەی شەڕانییەت لە نێوان ساڵانی (١٨٨٠-١٩٢٠) زیاتر لە ١٠ ملیۆن هاووڵاتی کۆنگۆیی لە ئەنجامی سیاسەتی حکومەتی بەلژیکی لە (زائیر)ی پایتەختی ئەو وڵاتە کوژران. سیاسەتی بەلژیکییەکان لەو ماوەیەدا ئەوە بوو کە وەرچەرخانێکی ئابووری دروستبکەن و بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش پێویستی دەکرد شەڕانیانە مرۆڤی کۆنگۆیی بکەنە ئامراز.

لە شەڕانییەتی ئامرازگەرادا، شتێکی ئاساییە خۆویستی و خۆپەرستی ببێتە خولگەی سەرەکی و هەرئەمجۆرەشە لە شەڕانییەت کە فەیلەسووفی ئەڵمانی، (کانت) بە بونیادیترین و قووڵترین جۆری شەڕانییەتی دادەنێت لەلای مرۆڤ. لە ژیانی ڕۆژانەی تاکەکاندا ئەمجۆرەی شەڕانییەت بەزۆری لەو کاتانەدا ئاشکرا دەبێت، کە دەبینین ئەوانیتر بەناوی ئەوەی خۆشیان دەوێین دەستدرێژیمان دەکەنە سەر، یاخود دەستدرێژیمان دەکەنەسەر چونکە خۆشیاندەوێین. بەمجۆرەش ئێمە دەتوانین خراپە بکەین چونکە دەمانەوێت وڵاتەکەمان لە "ئەوانیتر" پاک بکەینەوە، لە منداڵان دەدەین

چونکە دەمانەوێ "پەروەردە"یان بکەین. ئەمەش سەرەتایە بۆ جۆرێکی تری شەڕ و خراپە، کە سڤینسن ناویدەنێت: شەڕانییەتی ئایدیالیستی.

## سێیەم: شەڕانییەتی ئایدیالیستی:

بەلای سڤینسنەوە ئەمە خوێناویترین جۆری شەڕانییەتە چونکە شەڕانییەت دەنوێنێ بەو بڕوایەوە کە گوایە شتێکی باشە.. لە مێژوودا زۆر نمونەی شەڕانییەتی ئایدیالیستی دەبینینەوە: پشکنینەکانی کەنیسەی کاتۆلیکی، سوتاندنی جادووگەران لە سەدەکانی ناوەڕاست، جۆرەکانی تیرۆریزم هەر لە نمونەی تیرۆری نازییەکانی ئەڵمانیا، فاشییەکانی ئیتالیا، کۆمۆنیستەکانی ڕووسیاوە بگرە تا ڕێکخراوی ئەلقاعیدە بە تێپەڕین بە بەعسییەکاندا و مووچەبڕین و نانبڕاوکردنی کۆمەڵگا وەکئەوەی حکومەتی هەرێم کردی. خاڵی هەرە بەرجەستەی ئەم شەڕانییەتە ئەوەیە کە ئیش لەسەر بە دووژمنکردنی ئەوانیتر دەکات و بەپێی دوانەی (ئێمە) و (ئەوان)، (جەللاد) و (قوربانی)، (باوەڕدار) و (بێباوەڕ)، (ڕەش) و (سپی)، (پاک) و (پیس)، (ئاریایی) و (یەهوودی)، (مسوڵمان) و (مەسیحی) و (شیعە) و (سوننی)، (دەوڵەمەند) و (هەژار)، بیر دەکاتەوە. بەپێی ئەم بیرکردنەوە و دابەشکردنە، (ئەوانیتر) هەردەم دەخرێنە بەرەی مرۆڤی

مەترسیدار و دووژمنەوە، کە پێویستە لە پێناوی یەزدان و چاکە و ڕاستیدا بکوژرێن و لەت و پەت بکرێن.

## چوارەم: شەڕانییەتی بێباکانە:

ئەمجۆرەی شەڕ و خراپە لەلایەن ئەو کەسانەوە بەرهەمدێت کە هەرگیز بیر لەوەی دەیکەن و دەیلێن و هاندەرین، ناکەنەوە و گوێنادەن بەوەی ئایا ئەو گوتە و کردار و هاندانەی ئەوان، چۆن کاریگەریی لەسەر بەرامبەر دادەنێت. لە شەڕانییەتی بێباکانەدا، جۆرێ لە بێموبالاتی و گەمژەیی ئامادەیە و بکەری خراپەکار بیر لە خراپی و کاریگەریی شەڕانیانەی گوفتار و ڕەفتاری خۆی ناکاتەوە.

**ئایا دەتوانین خراپە بوەستێنین؟**

وەڵامی کتێبەکەی سڤینسن بۆ ئەم پرسیارە، وەڵامێکی ڕەتکەرەوەیە. جیهان پڕە لە شەڕ و خراپە و ئەمەش لەلایەن مرۆڤەکانەوە بەرهەمدێت. مرۆڤ هەر تەنیا قوربانیی شەڕ و خراپەیەکی میتافیزیکیانە و سرووشتیانە نییە، بەڵکو گیرۆدەی خراپە و شەڕێکی بەردەوامی ناخەکیی خۆشییەتی. بۆیە شەڕ تەنیا ئەو کاتە لەناو دەچێت، کە لانیکەم توانای مرۆڤ بۆ خراپەکردن و خراپەکاری نەمابێت، یان هیچ مرۆڤێکی خراپەکار نەمابێت، کە ئەمەش دەمانخاتەوە بەردەم پرسیارێکی ئیتیکی، کە پێماندەڵێت

چۆن دەکرێ شەڕ بەهۆی خراپەوە لەناو بەرین؟ بانگەشەکردن بۆ لەناوبردنی خراپەکاران بۆخۆی پێویستی بە خراپەکردن و شەڕ هەیە لە دژیان و ئەمەش دەچێتەوە خانەی شەڕانییەتی ئامرازگەراوە. هەرچەندەش مەبەست و ئامانجەکەمان باش بێت: (نەهێشتنی شەڕ)، ئاواش ئامرازەکەمان خراپە: بەکارهێنانی شەڕ لە دژی خراپەکاران. بەمجۆرەش دەکرێ بگوترێ: شەڕ کۆتایی پێنایەت، بەڵام بۆی هەیە سنووردار بکرێ و ڕێگریی لەبەردەم ئەنجامدانیدا دروستبکرێ. لەو شێوازانەش کە دەکرێ لەبەرامبەر شەڕ و خراپەدا، چ وەک تاکەکەس و چ وەک گرووپ و کۆمەڵ، بەکاربهێنرێن، بریتین لە بیرکردنەوە و وەبیرخۆهێنانەوەی هەندێک بیرۆکەی ئیتیکی و ئەخلاقی و سیاسی: (چۆن بەوجۆرە ڕەفتار بکەم، کە ڕەفتارەکەم ببێتە جێی پەسەند و لاساییکردنەوەی کەسانی دی و ببێتە یاسایەکی گشتی؟) چونکە ئێمە وەک تاک و وەک کۆمەڵ ئەو ئەرکەمان لەسەر شانە کە پێویستە لەبەرامبەر خراپە و شەڕدا، هەڵوێست و بۆچوونی خۆمانمان هەبێت. بۆ نمونە پرۆتێست و نافەرمانیی مەدەنی و مانگرتن و ملکەچنەبوون بۆ خراپەی سیاسی، لەو ڕێگرانەن کە سنوور بۆ هەر شەڕێک دادەنێت کە ئەنگیزەی سیاسی و ئایدیۆلۆژیی لە پشتەوەیە. وەک بەشدارینەکردن لە ڕاگەیاندن و ئەو

کەناڵانەی بەرهەمهێنەری شەڕن، بە تایبەتی لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا.

بە دیوێکی تریشدا ئەوە ئەرکی حکومەت و دەزگا ئەمنیەکانییەتی کە سنوور بۆ هەر خراپەیەک دابنێ کە گرووپێک لە پێناوی مەبەستێکی تایبەتی خۆیاندا، لە دژی بەرژەوەندیی گشتی ئەنجامی دەدەن. هەروەها هەر جۆرە بەشدارینەکردنێکی تاکەکەس، لە بەدناوکردن، لەبەرچاوخستن و لەکەسایەتی داماڵینی کەسانیتردا، بەشدارییەکی باشە بۆ کەمکردنەوەی شەڕانییەت و خراپە، بە تایبەتی ئەو خراپە و شەڕەی بەناوی ئایینەوە لەدژی کەمینە، ژنان و غەیرە دینەکان بڵاو دەکرێتەوە. ئەمە جگە لەوەی بەشدارینەکردنی تاکەکەس لە گوتنەوە و گواستنەوەی قسەوقسەڵۆک، تەشهیر، ناوزڕاندنی کەسانێک دەچێتە خانەی دژ بە خراپەوە. بەکارنەهێنانی تاکە مرۆڤ بۆ زمانی نایەکسانی و قووڵکردنەوەی جیاوازییە جێندەرییەکان و بەرهەم نەهێنانەوەی زمانی پیاوسالاریی و دینسالاریی ڕەگەزپەرستانە، وەک ناوهێنانی ئایینەکانی تر و بیروڕای جیاواز لەوەی خۆمان، بە خراپە، بۆخۆی وەستانەوەیە لە دژی شەڕ و خراپە، بەبێ خراپەکردن.

# هونەری ڕەخنەگرتن لە خود..

مرۆڤ هەمیشە مەیلێکی هەیە بەلای دۆزینەوەی عەیب و عار لە ئەوانیتر و گەورەکردنی مێشێک بە گایەک! ئەمە تەنیا لە ئاستی زماندا مەیسەر دەبێت، چونکە زمان کاتێ شان لە ئەرکە لۆژیکیەکەی خۆی خاڵیی دەکات، کاتێ پشت دەکاتە دادوەریی و گوتنی ڕاستەقینە، دەکەوێتە سەر سکەی ناڕاستیی و بەشدارییکردن لە پەرەپێدان بە ناڕەوایی. ئەفلاتوون لێرەوە دژی هونەری گوتاربێژی و بەتایبەتی ڕیتۆریکی سۆفیستەکان بوو، چونکە لەو بڕوایەدابوو، سۆفیستەکان ڕاستیی هەڵدەگێڕنەوە و ئەوەی کە خودی و میزاجیی و تاکەکەسیە بەوجۆرە پیشاندەدەن و دەیگشتێنن، وەکئەوەی ڕاستەقینە بێت.

ڕۆژانە ئەو کەسانە دەبینینەوە، کە بە خەروار و لۆری باس لە عەیب و کەموکورییەکانی ئیمە دەکەن. وەک ئەوەی هیچ ئیشێکی تریان نەبێت و پسپۆڕی دۆزینەوەی دزێوییەکانی کەسایەتی ئێمە بن. ئەوانە بەوجۆرە قسان لەسەر کەسانیتر دەکەن، وەکئەوەی دڵنیابن لەوەی کە دەیڵێن و ئەوەی کە دەیڵێن (ڕاستەقینە)یە. مرۆڤ وا ئەزانێت راستەقینە بە ئاسانی خۆی بەدەستەوە دەدات، بۆیە بە دڵنیاییەوە قسەی

لەسەر دەکات، بەڵام ئەوەی زەحمەتە قسەکردن نیە، بەڵکو ڕاستەقینەکەیە. ئەمپادۆکلیس (٤٩٢-٤٣٢پ.ز) لە دژی ئەوەبوو، کە ئەوەی دەیبیستین، یان دەیبینین، یان هەرجۆرە هەستپێکردنێکی تر بەس بێت بۆ گەیشتن بە ڕاستەقینە. چونکە ڕاستەقینە بەرهەمی توێژینەوەیە، نەک هەستکردن. لەبەر ئەوە ئەم فەیلەسووفە ئامۆژگاریمان دەکات: هەستەکان لە نرخ و بەهادا سەبارەت بە تێگەیشتن لە ڕاستەقینە هیچیان لەویتریان باشتر نین، نە بینین لە بیستن باشترە و نە دەنگهەڵبڕین لە نوسین و خوێندنەوەی دۆکیۆمەنتەکان و دەستلێدان. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە مرۆڤ لە ژیانی خۆیدا و لە پێناوی تێگەیشتن لە ڕاستەقینە، بتوانێ لە هەمان کاتدا سوود لە زیاتر لە هەستێکی خۆی وەربگرێت.. ئەمەش بەمانای ئەوەیە کە هیچکامێک لە هەستەکانتان ڕەت مەکەنەوە، بەڵام هیچیان بەتەنیا مەکەنە پێوەر بۆ بڕیاردان. چونکە پێویستە بڕیاردان لە ئەنجامی تێگەیشتنەوە بێت، نەک هەستکردن بە تەنیا. تێگەیشتن کار و ئەرکی بیکردنەوەی ئەقڵییە نەک هەستەکی، بەتایبەتی کە هەستەکان بەردەوام دەکەونە ژێر کاریگەریی کارلێکە دەرەکییەکانەوە. ئێمە پێویستە لە تێگەیشتندا بە هەمان شێوەی کە دوو ژمارە پێکەوە کۆدەکەینەوە و ئەنجامەکەی

دەبینین، ئاواش لە قسەکردنماندا لەسەر ڕاستەقینە دڵنیا بین و ئەنجامی دەستنیشانکراومان دەستبکەوێ.
دۆزینەوەی ساتەوەختێک، یان خەسڵەت و هەڵسوکەوتێک لە کەسایەتیی دۆست و هاوڕێ و تەنانەت خۆشەویستەکەشمادا، کە مایەی تووڕەیی و ناخۆشیمانە و زویر و بریندارمان دەکات، یان خۆزگە دەخوازین، ئەو کەسانە ئەم سیفاتەیان تێدا نەبوایە، کارێکی ئاسانە.. ئێمە لە کاتی هەڵسوکەوت و ژیانماندا لەگەڵ نزیکەکان، زۆر شتی ورد و قسە و هەڵوێست لەسەر یەکتر تۆمار دەکەین، کە پاش هووشیاربوونەوە، حەزمان نەدەکرد لەو کەسانە و خۆماندا هەبوونایە، چونکە کەسایەتیمان ناشیرین دەکات و ئێمەش ئازاری پێوە دەچێژین کە خۆشەویستەکانمان هەڵگری ئەو خەسڵەتانە بن، یان لەوانەیە ئێمە ببینە مایەی ئازاری ئەوانەی خۆشیان دەوێین. بەڵام زەحمەتە، ناخۆشە و مەترسیدارە ئەوەی دەمانەوێ و دەیزانین و پێویستە بگوترێ، بە یەکتری بڵێین! زەحمەتە بە خۆشەویستێک بڵێی: بنباڵت، یان دەمت بۆنی لێدێت. قورسە وتنی ئەوەی: بڕۆ قاچەکانت بشۆ.. دەترسین بڵێین: قسەکەت درۆیە، یان ڕاست نیە. دێینەوە ماڵەوە، یان ناو ناخی خۆمانەوە و ئاوات دەخوازین کە ئەو کەسەی هاوڕێ و خۆشەویست و دۆستمانە لەکاتی نانخواردن و چا خواردنەوەدا، لرفەلرف و

ملچەملچی نەکردایە و قسەی نەکردایە، تا پرژنگەکانی و ناو دەمی بە رووخسارماندا نەپژایە.. زەحمەتە ژنێک بە بە پیاوەکەی بلێت فلان شتی ئازاری دەدات..

هاورێکان، ژن و مێردەکان، قوتابی و مامۆستاکان، سیاسییەکان، گۆرانیبێژەکان، بازرگانەکان، دکتۆرەکان و رۆشنبیرەکان، کۆچەرەکان، تاراوگەییەکان، هاوپۆلەکان و هاوخەباتەکان، کاتێ لەیەکتر دەتۆرین و جیا دەبنەوە، دەکەونە تەماشاکردنی رقاویانەی ئەویتر و گێرانەوەی پۆخلەواتەکانی، بەتایبەتی باسی ئەو کاتانەی پێکەوە بوون.. ئێمە نازانین، بەم کارەمان، پێش ناشیرینکردنی ئەویتر، خۆمان ناشیرین دەکەین و بێرێزیی بەو کاتە دەکەین، کە تیایدا پێکەوە ژیاوین..

ئەوەی ئاسانە، هونەر نیە. چونکە هونەر بەرئەنجامی داهێنانە. داهێنان بوێریی و چاونەترسیی و ئامادەییە بۆ گۆرینی جیهان و واقیع. ئاسانە چاودێریکردنی هەڵەی ئەوانیتر و دەستنیشانکردنی کەموکورپیی و خاڵە دزێوەکانیان و لەپاش جیابوونەوە و زویریی و پەیوەندیی پچران، دەستی چەوریان پێبسرین. بەڵام ئاسانیی کردەیەکی هونەرمەندانە نیە. ئەوەی هونەرە، دۆزینەوەی خاڵە دزێو و لاواز و ناشیرینەکانی کەسایەتیی خۆمانە. هونەر، تەماشاکردنی ئاوێنەیە بۆ بینینەوەی ناشیرییینیەکانی خۆمان

و شۆڕشیش بریتیه له هەوڵدان بۆ گۆڕین و کەمکردنەوەیان..

هەموو کەس کەموکوڕیی هەیە، بەڵام هونەرمەند ئەو کەسەیە لە پێش هەموو شتێکدا، کەموکوڕییەکانی خۆی دەستنیشان دەکات.. کورد گوتویەتی: (دەرزییەک لە خۆت ڕۆکە، ئەمجا سووژنێک بە خەڵکدا بکە).. بەم مانایە بێت، پێویستە هەمیشە ڕەخنەگرتن لە خۆمان بخەینە پێش ڕەخنەگرتن لە ئەوانیتر. کارێک لەم زەمەنەی ئێستاماندا قورسە و کەسایەتیی و خودێکی بوێری دەوێت..

ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئەوەیە، کە ڕەخنەگرتن خاڵی دەستپێکردنە نەک (ئەنجام)، (خود) بابەتی ڕەخنەیە پێش (ئەویتر)، (ئێستا) زەمەنی ڕەخنەیە، نەک (پاشان).. ئەوەی لە بابەتی ڕەخنەگرتنەکەدا گرنگە و چاوی لەسەرە، خود خۆیەتی کاتێ دەبێتە بابەتی ڕەخنەگرتن و بەمەش یەکەم هەڵوێستی خود لە ئاست خۆیدا ئەوەیە، کە پەیوەندیی خۆی بە خۆیەوە لە پەیوەندییەکی سرووشتەکیەوە کە فێریکردووین وەک ئەوەی کە هەین، بێ عەیبین و چاک و باشین، هەڵدەگێڕێتەوە بۆ پەیوەندییەک کە تیایدا خود ڕەخنەگرانە خۆی هەڵدەسەنگێنێ و خۆی بە شایانی مانەوە لە دۆخە سرووشتیەکەیدا نابینێ و یەکەم هەنگاوەکانی دەنێت بۆ خۆدروستکردن. خود هەنگاوێک لە خۆی دوور

دەکەوێتەوە و لە مەودایەکەوە خۆی دەکاتە بابەتی خۆی و لێرەشدا ڕۆڵی بیناکەرانەی ڕەخنە و ڕۆشنبیریی رەخنەیی بۆ خود دەردەکەوێت.

خود ئەو زاتەیە کە پەیوەندییەکی ڕەخنەگرانەی لەگەڵ خۆیدا هەیە، لە ئێستای هەمیشەییدا.. لە هەر ئێستایەکدا، کە لە ڕابردوو و داهاتووشدا، وەک ئیستا، خۆی بەرجەستە دەکات. خود هەمیشە بوونی خۆی لە (ئێستا)دا دەسەلمێنێت.. خود هەمیشە دەڵێت: (من هەم)، نەک بڵێت: (هەبووم)، یان (دەبم).. خود جەوهەرێکی بەتوانا و چییەتیەک و هەوێنێکی نەمرە لە بوونی مرۆیی ئێمەدا. هەندێکی کەم دەیدۆزنەوەو داهێنەرانە دەژین، کەسانێکیش هەرگیز بۆی ناگەڕێن و ژیانێک دەژین بەبێ ئەوەی خۆیانی تێدا بدۆزنەوە.. ئەوەی بەدوای خۆیدا دەگەڕێت، پێویستی بە گەڕان بەدوای بەهەشت و ترسی لە دۆزەخ نیە، چونکە خود، بەهەشت و دۆزەخ پێکەوە، لێرە و لەسەر عەرد، لە بیرکردنەوەدا، ئەزموون دەکات.. بیرکردنەوە، واقیعی خودە.

# خراپەی مەترسیدار

## (لەبارەی سەرچاوەکانی ڕەگەزپەرستی لە کۆمەڵگای کوردیدا)

لە زمانی کوردیدا دەربڕینێک هەیە بەناوی (پیاو خراپ، یان پیاوخراو)، کە وەک دیارە خراپە دەخاتە پاڵ پیاو، یان نێرینە. مەرج نیە خراپە ڕەگەزمەند بێت، چونکە لە سرووشت و لەناو ئاژەلانیشدا ئەو شتە هەیە کە کاریگەریی و ئەنجامەکەی وەک خراپە دەکەوێتەوە، ڕەگی وشەکە دەچێتەوە سەر خەراپ، خەرابە، خرابات، کە مانای تێکدان، نغرۆبوون، وێرانکردن و داڕماوی و هێنانەخوارەوەش دەدات. بەمجۆرەش گوزارەی پیاوخراپ، هەم مانای پیاوی بە سرووشت خراپ و هەم مانای پیاوی خراپکاریش دەدات..

خراپە پێش هەموو شتێک هێزێکە، نادیارە و وزەیەکی کۆنترۆڵ نەکراوە. هەرچەندە بە گشتی خراپە، ***خراپە***، بەڵام خراپ هەیە تا خراپتر و لەناو خراپەکانیشدا خراپترینیان ئەوەیانە کە لە گێلێتییەوەیە و ئەنجامی بیرنەکردنەوەیە. ئەمجۆرە خراپەیە نە ئاژەڵییە و نە غەریزەیی و زگماک، بەڵکو خراپەیە لە ئەنجامی تێنەگەیشتن و نائەقڵانییەتی مرۆییەوە. خراپترین خراپ ئەوەیانە کە دەیکەین و نازانین

خراپەیە و دووبارەی دەکەینەوە و تێناگەین خراپترینە..
ئەمە جیاوازە لەو خراپەیەی کە مارێک بۆقێک دەخوات، یان بەردێک لە ژێر لاقمانەوە تلدەبێتەوە و کەسێک لە دامێنەوە بریندار دەکات، یاخود لەپڕ بەسەر شارەمێرووولەیەکدا دەڕۆین و مێرووولەکان پان دەکەینەوە و هتد، یان کەسێک لەپڕ لە ماڵ دێتە دەرێ و وەژێر ترومبێلەکەمان دەکەوێت..
نە بە یاسای ویژدانیی و نە بەیاسای دادەوەریی هیچکام لەمانە خراپەی ئەنقسەت، یان خراپەی مەبەستدار نین.
کەچی خراپە لە نەزانییەوە، جیاوازە لەمانە و نەزانیی پاسا و نیە بۆ خراپەکردن..
خراپە لە گێلێتی و تێنەگەیشتنەوە، شایەتە بەسەر ساتەوەختێکەوە کە تیایدا مرۆڤ وەک پێویست بیری نەکردۆتەوە و بیرکردنەوە نابێتە سەلمێنەری بوونی ئەو و بەدیارخەری جیاوازیی ئەو لە ئاژەڵان و خشۆک و باڵندەکان. تەنیا لەم ساتەوەختەدایە، کە مرۆڤ بوونی خۆی دەخاتە گرۆی پاسیڤێتی و دەستەوەستانییەوە لە ئاست ئەوەدا کە دەبوو مرۆڤ بیکات وەک مرۆڤ، نەک وەک ئاژەڵی غەریزەمەند.
ڕەگەزپەرستی جۆرێکە لە خراپە و هەرگیز باش نیە و ڕۆڵێکی گرنگیی لە مێژووی زەین و بیری نەتەوەکان و گرووپەکاندا نەگێڕاوە. بۆیە ئەوەی کە باش نیە،

مەترسیدارە، چونکە نازانین خراپە لە کوێوە سەرهەڵدەدات و کەی دەتەقێتەوە و باجەکەی چەندەیە. خراپە هەمیشە مات و خامۆش، بێدەنگ و پەنهانی و شاراوەیە و تەنیا ئەو کاتە بەرجەستە دەبێت کە مرۆڤ خۆی لەبیر دەکات، یان بیر ناکاتەوە و نەزانیی و تێنەگەیشتن، هایدەگەر گوتەنی، دەبێتە فۆرمێکی ژیانی نارەسەن.

ڕەگەزپەرستی خراپەیەکی مەترسیدارە. خراپەی مەترسیدار بە زیاد لە زمانێک و لە زیاد لە کەلێنێکەوە دێتە ناو مرۆڤەوە. چ لە ژیانی ڕۆژانەدا و چ لە خوێندن و چ لە میدیاکان و سیاسەتەوە.. خراپەی مەترسیدار شتێکە خۆی لە زمانەوە دەگلێنێ و بەجۆرێک لەناو وشەکاندا جێی خۆی دەکاتەوە کە بۆ بیرکردنەوە ئاسان نابێت دەستنیشانی بکات و ناوەڕۆکە مەترسیدارەکەی بەرجەستە و ئاشکرا بکات.

خراپەی مەترسیدار زۆرجار لە چوارچێوەی نەرم، دەربڕینی توانج ئاسا، نوکتەئامێز، شۆخیی و گاڵتە و گەپ و لە شێوەی خوازە و بەراووردکاریدا، لە بڕیاردان، لە وەسف و تەنانەت لە پەروەردە و سیاسەت و ئایین و نووسینیشدا خۆی دەشارێتەوە و وەک جۆرێ لە بیروڕای پاکژ خۆی مات دەدات و کۆی کولتووری باو داگیر دەکات.

سرووشتی ڕەگەزپەرستی، زۆرجار لەشێوەی بەرگریی، دڵسۆزی، لەخۆڕازیبوون و خۆکردن بە قوربانیی و

مەزڵووم و شانازیی نەتەوەیی و ئایینی و سیاسیدا خۆی بەرجەستە دەکات. کاتی دەرکەوتنی ئەو ساتانەیە کە بکەر، گۆکەر، یان ئاخێوەر بەبێ ئەوەی بیر بکاتەوە کە خراپەی مەترسیدار چۆن خۆی خزاندۆتە ناو زمان و بیرکردنەوەیەوە، دووبارەی دەکاتەوە، دەیهێنێتە گۆ و قسەی پێدەکات و ڕەواجیی پێدەدات..

خراپەی مەترسیدار ڕێگاخۆشکردنێکی مەعنەویی بەبێ مەعنەویەت، کولتووری بەبێ کولتوور و دەربڕینێکی زمانییە بە بێ مانا و ناوەڕۆک و مەبەستی زمان. هەموو ئەمەش بۆ ئەوەی مەترسیی لە توانایییەکی هێزەکییەوە، ببێتە توانایییەکی کردەکی، وشەی دەستدرێژی، چەوساندنەوە، جیاکارەیی، ببنە ڕووداوەکانی لاقەکردن، ماف پێشێلکردن و ڕەگەزپەرستی جێندەریی و ئەتنیکی و تەنانەت کوشتن و سڕینەوە و قەڵاچۆکردن و جینۆساید.

لەبەر ئەوە پێویستە ڕووبەڕووی ئەم خراپەیە ببینەوە کە زۆر جار زمانی ڕەیسیزم و نەژادپەرستی، زمانی فەتوا و حوکمدانی ڕەها و ئایدیۆلۆژی بەسەر ئەوانیتردا، ببێتە زمانی سەردەستە. بۆیە مەترسیدارە بێدەنگ بوون لە ئاست ئەم دیاردە شاراوەیەدا کە بۆی هەیە ڕۆژگارێک وڵات و شار و ماڵ و تەنانەت ناخیشمان داگیر بکات و ئێمە وەک سۆژە، یان خودیی ڕاسیستت بەرجەستە ببین..

لە ڕوانگەی مرۆیی و کوردیانەوە، ئەم بابەتە گرنگییەکی تایبەتی هەیە. ئێمە میللەتێکین تاڕاددەیەکی زۆر، خۆمان لە توانەوە و جینۆساید و نەمانی یەکجارەکیی پاراستووە، ئیتر نۆرەی خۆپارستنە لە خراپەی مەترسیدار و ناوەڕۆکە ڕەگەزپەرستانەکەی. لێرەوە چەند وێستگەیەک بەسەر دەکەمەوە، کە ئەگەری هاتنەژوورەوەی فۆرمەکانی خراپەی مەترسیدار و ڕەگەزپەرستی لێیانەوە لە ئارادا هەیە.

بۆیەش لە سیاسەتەوە دەستپێدەکەم، چونکە ئەمە ئەو بوارەیە هەم دەتوانێ خراپەی مەترسیدار بەرهەمبهێنێ و هەم دەشتوانێت برەوی پێدات و ئاراستەی بکات.

## سیاسەت و خراپەی مەترسیدار:

پێدەچێت خراپەی مەترسیدار بەشێک بێت لە (پۆتێنشیاڵ)، یان توانایی سیاسەتی تیۆری، بەڵام لە سیاسەتی کردەییدا زیاتر بەرجەستە دەبێت. بۆیە گرنگیی سیاسییەکی زمانپاک و هزرپاک، کەمتر نیە لە سیاسییەکی دەستپاک و داوێنپاک. ئەمانە یەکتری تەواو دەکەن و پێشمەرجی بوون و مانەوەی یەکترن.

زمانی سیاسەت زۆر شت لەخۆی دەگرێت، بەڵام هەمیشە پڕە لەو کەلێنانەی کە ڕەگەزپەرستی و خراپەی مەترسیدار لێیانەوە دێنەوە ناو کۆمەڵگاوە. زۆرجار لە زمانیی

سیاسیەکانەوە فێری ئەو جیاکارەیی و شێوە وەسفە دەبین، کە مامۆستاکانی ڕەگەزپەرستی حەزی پێدەکەن. سیاسییەکان لەو کاتەدا کە قسە بۆ گرووپ یان میللەت و جەماوەری خۆیان دەکەن، زیاتر مەست و خرۆشاو و ئیغرابووی ئەو ساتەوەختەن کە تیایدا دەیانەوێت سەرنجی لایەنگرانیی خۆیان و جەماوەرەکەیان ڕابکێشن و هەڕەشە لە نەیارەکانیان بکەن. گیرۆدەیی ئەوان بەو ساتەوەختەوە و چڕبوونەوەیان لەو قسانەدا کە دەیکەن، ئەوان لە بیرکردنەوە بۆ خۆپاراستن لە ڕەهەندەکەی خراپەی مەترسیدار دابڕ دەکات.

بۆیە کاتێک لە زمانی سیاسیەکان، یان لایەنەکان و گرووپەکان ورد دەبینەوە، هەمیشە (ئەوانیتر) لە مەترسیدان، چ لە ئاستی گرووپەکانیتر و چ لە ئاستی نەتەوەکانیتر و چ لە ئاستی جێندەری و تەنانەت تەمەنیشدا. زمانی سیاسیەت بەهۆی ڕەهەندە گوتاربێژییەکەیەوە، کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر وەرگر هەیە، بۆیە ئەگەر ئەم زمانە بارگاوی بێت بە خراپەی مەترسیدار، ڕەنگدانەوەکەی لە لای تاکەکەس وەک جۆرێ لە ستایشکردنی ڕەگەزپەرستی دەردەکەوێ. لەم ڕوانگەیەوە زمانی سیاسەت، مەترسیدارترین و قورسترین جۆری زمانی دەربڕینە، چونکە بەبەردەوامی کار لەسەر

وەسفکردنی (ئێمە) وەک باش و (ئەوانیتر)، وەک دوژمن، یان خراپ دەکات. بەم پێیەش، پێگەی گوزارەی (ئێمە) لە زمانی سیاسیدا پێگەیەکی پاکژ، بێگوناه و مەزلووم و بەدوورە لە هەڵە، لە کاتێکدا پێگەی گوزارەی (ئەوان) یەکسانە بە خراپە، بە چەپەڵی و دەسیسە و پیلانگێڕی.
لەبەر ئەوە زمانی سیاسیی هەمیشە لەبەردەم ئەو مەترسییەدایە کە ببێتە زمانێکی ڕەگەزپەرستانە و وێنەیەکی نێگەتیڤ بۆ بوونی ڕەسەن و شەرافەتمەندانەی ئەوانیتر دابتاشێ و بەهۆی میدیا و ڕێوڕەسمە ئایدۆلۆژییەکانەوە بیخاتە ناو ناخی تاکەکانەوە و گوتارێکی باڵادەست لە ئاستی کۆمەڵگادا بۆ ئەوانیتر دابتاشێ کە پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی بە بوونی ئەوانیترەوە نەبێت و دەربڕی ڕاستەقینەی ئەو ژیانەش نەبێت..
ئەم نەریتە لە زمانی سیاسیی ئێمەشدا ڕابردوویەکی بەرچاوی هەیە. لە زمانی میدیایی حزبە کوردستانیەکاندا بە ئاشکرا تۆنی زمانێکی ڕاسیستیانە دەبینرێتەوە، کە ڕەوایەتی خۆی لەو پێگەیەوە وەردەگرێت کە کورد لەبەرامبەر ئەوانیتردا (بەعسییەکان)، ئۆپۆزیسیۆنە و شەڕی مان و نەمانیان لەگەڵدا دەکات. لەو دیو ئەم وەسفەوە، لەو دیو ئەم ڕەوایەتیەوە، بە خستنە بری ئەوەی (بەعسییەکان عەرەبن)، وەسفێکی گشتێنراویش لە بەعسیەکانەوە بۆ

عەرەب بە گشتی ڕوویداوە، کە خراپەی مەترسیدار کاری خۆی تێدا دەکات. هەروەکچۆن لە هاوینانیشدا ئەم وەسفە گشتێنراوە لە ئاست ئەو گەشتیارانەدا خۆی بەرجەستە دەکاتەوە کە سەردانی هەرێمی کوردستان دەکەن.

مەرج نیە ئەو گوتارەی (ئێمە) لەسەر (ئەوانیتر) بەرهەمی دەهێنێت، هەمیشە ئەتنیکسەنتەرانە بێت، یان ڕەگەزسەنتەرانە و بەرژەوەندیی گرووپێکی ئەتنیکی، یان کولتووری لەبەرچاو گرتبێت، واتە مەرج نیە گۆشەنیگای بینین بۆ ئەوانیتر لە ڕوانگەی ئێمەی جیاوازە ڕەگەز و ئەتنیسیتیەوە بێت، بەڵکو بۆی هەیە ئەو وێناکردنە بۆ ئەوانیتر، تەواو جێندەرسەنتەرانە و پیگەخوازانەش بێت و جەختکردنەوەی تێڕوانینی نێرینە بۆ مێینە، یان بە پێچەوانەشەوە بێت. هەروەکچۆن دەشکرێت ڕوانگەی کۆمەڵایەتیانەش بێت بە بەرجەستەکردنەوەی پێگە، ئەسڵ و فەسڵ و تیرە و نەسەبی عەشیرەیی، یان ئاغا و مسکێنی، یان هەژاری و دەوڵەمەندیی، یان لادێیی و شاری، یان خوێندەوار و نەخوێندەوار و دینداری و بێدینی، یاخود بچووکی و گەورەیی، یان ئاقڵیی و کەریی..

## پەروەردە و خراپەی مەترسیدار:

ئایا تا چەندە پەروەردە ئاراستەکەری خراپە و فۆرمە دەمارگیر و مەترسیدارەکەی خراپەیە؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە لێوەی دەچینە باسەکەوە.

پەروەردە وەک شێوازێکی بیرکردنەوە لە مرۆڤ، ڕەهەندێکی کولتووری و کۆمەڵایەتی قووڵیی هەیە. مرۆڤ لەو ڕوانگە کۆمەڵایەتیەوە بیر لە فۆرمێکی پەروەردەیی، یان ئامادەکارییەک بۆ داهاتووی مرۆڤ لە ڕێگەی پەروەردەوە دەکاتەوە، کە تیایدا دەژی و تا ڕادەیەک بە میرات بۆی ماوەتەوە. ئەو کاتەی ئێمە بیر لە شێوازێکی گونجاو، یان باش و پێویستی پەروەدەیی دەکەینەوە، لە چوارچێوەی ئەو پرۆسە پەروەردەیی و کولتووریی و کۆمەڵایەتیەدا بیری لێدەکەینەوە، کە ڕوانگەی ئێمەی دەستنیشان و سنووردار کردووە. بۆیە ئەوەی کە هەیە، تێکەڵ دەبێت لەگەڵ ئەوەی کە دەمانەوێت هەبێت و ئەوەش کە دەبێت، بەشێکی زۆری دەبێتە دووبارە بەرهەمهێنانەوەی ئەوەی کە هەبووە، بەڵام بە میکانیزمی تر. هەرچەندە ئەمە میکانیزمێکی ناچارەکی و جەبریانە نیە و هەمیشە ئاست و ڕێژەی دووبارەبوونەوەی ڕابردوو و مەوداگرتن لە نەریتەکان ئەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسانەی کە بواری پەروەدەییدا پلان دادەڕێژن و بیر دەکەنەوە و پراکتیزەی بیرۆکە پەروەدەییە نوێیەکان دەکەن.

لەم ڕوانگەیەوە، سیستەمێکی پەروەدەیی، یان تەنانەت دادوەریش لەدەرەوەی ئەو پرسپێکتیڤ و ڕوانگە کولتووری و کۆمەڵایەتیە نیە کە ئێمە تیایدا دەژین. ئەوەی جیاوازیی دروستدەکات بریتیە لە ئاستی ڕەخنەگرتنمان لەوەی کە هەیە و بیرکردنەوەمان لە چوارچێوەیەکی داهاتووانەدا بۆ ئەوەی کەمترین کەلێن بمێنێتەوە بۆ دووبارەکردنەوەی ئەوەی کە نابێت دووبارە ببێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا بواری پەروەردەش زەمینەیەکی باش دەڕەخسێنێت بۆ دووبارەبوونەوەی نێهنی و نادیار و ئاشکرای ئەو بیرۆکانەی کە لە بنەمادا هەڵگری تووخمەکانی خراپەی مەترسیدارن. واتە ئەوەندەی هەڵگری ئاسۆیەکی نوێن بۆ فراوانکردنی بیری منداڵان لەناو فێرگە و پۆلەکان و کۆمەڵگادا، ئەوەندە زیاتر هەڵگری ئەو توخمانەن کە خراپەی مەترسیدار لە سرووشت و خووی مرۆڤدا دەچێنن. ئەمەش ئەو لێکدانەوەیەمان زیاتر لەلا ئەچەسپێنێت کە پێماندەڵێت، خراپەی مەترسیدار یەک سەرچاوەی نیە و فرە سەرچاوەیە، دروستدەکرێ و بە میراتیش دەمێنێتەوە، بەشێکە لە نەریت و بۆی هەیە ببێتە بەشێکیش لە ئاراستەی نەریتشکێنی، دیار و ئاشکرایە لە ڕەفتاردا و نادیار لە بیرکردنەوە و زەییندا.

له بواری پەروەردەدا، دەکرێ دەستنیشانی دوو سەرچاوەی سەرەکیی بکرێ، کە بە هۆیانەوە خراپەی مەترسیدار، یان جەهلی ڕەگەزپەرستانە دزە بکاتە ناو تیۆریی و پراکتیکی پەروەدەییەوە. یەکەمیان بریتییە لە کەرەستە پەروەردەییەکان و دووەمیان بریتیە لە ئەکتەرە پەروەردەییەکان.

## یەکەم: کەرەستە پەروەردەییەکان:

لە کتێبەکانەوە بگرە تا هەر مەتریاڵێکی تر، کە لە پرۆسەی پەروەردەیی و فێرکرندا بەکار دەهێنرێن، وەک ڕەنگەکان و قەبارەکان و شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵیان و بەخشینی سیفاتی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ بە هەندێکیان و کردنی ئەوانیتر بە سیمبوولی خراپە و ترس و بەدیی. هەروەها چۆنێتی بەکارهێنانی وێنەی مرۆڤ و ئاژەڵ لە نمونەی ڕوونکارییە زانستیەکاندا و دەستنیشان نەکردنی ئامانج و مەبەستی ئەو بەکارهێنانە بە شێوەیەکی ڕوون و ورد. ئەگەر ئامانج بە ڕوونیی دەستنیشان نەکرێت، هەمیشە ئەگەری بەستنەوەی، یان تێگەیشتنی دیکە لەلایەن منداڵەکەوە و بەهۆی میکانیزمەکانی هزرینەوە، لە ئارادا هەیە. وەکئەوەی لە کاتی پیشاندانی وێنەی خراپکارێک،

وێنەی ڕەشپێست، یان قژ ڕەش و بۆ پیشاندانی مرۆڤێکی میهرەبان سپیپێست، یان قژ زەرد بەکار بهێنرێت.

من لە ئەزموونێکی چەند ساڵ لەمەوپێشمدا لەگەڵ گرووپێک لە منداڵانی باخچەی ساوایان، کاتێک چەندین وێنەی بەدەستدروستکراوی مرۆڤم لە هەموو ڕەنگ و ڕەگەز خستنە بەردەستیان و داوام لێکردن ئەو نمونەیەم بۆ جیا بکەنەوە کە ئەوان خۆشیان دەوێ، زۆربەیان ئەو وێنانەیان پیشاندەدام کە بە قەبارە گەورە بوون و سپی پێستیش بوون. ئەمەش لە کاتێکدا وێنەی مرۆڤی ڕەشپێستی لەوانەش گەورەتر هەبوون. کاتێکیش پرسیارم لێکردن ئەوان کامانە بە مرۆڤی خراپ دەزانن، زۆربەیان دەستیان بۆ ڕەشپێستەکان دەبرد. هۆکاری ئەمەش ئەوە نەبوو ئەوان ئەزموونی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ مرۆڤی ڕەشپێستدا هەبوو، بەڵکو هۆکارەکە ئەوە بوو کە ئەم منداڵانە فێرکرابوون (لە ماڵ و فێرگە و باخچە و پاشتریش لە فێرگەکان)، کە تاریکیی و ڕەش وەک یەک ببینن و ئەمەش لەلایان ببێتە حوکمێکی پێشینە لەسەر تاریکیی و ڕەشیی و بەستنەوەیان بە ترسەوە. بۆیە بەشێوەیەکی خۆبەخۆ، گشتاندنێکی دەروونیی ڕوویدەدا بەوەی کە هەر شتێکی ڕەش، یان تاریک، (ترس)ی بیر بخاتەوە.

له نمونه‌ی قاره‌مانه باش و خراپه‌کانی ناو حه‌کایه‌ته‌کانیشدا ڕووبه‌ڕووی ئه‌م حاڵه‌ته ده‌بینه‌وه. فیگه‌ره هه‌ره دیاره‌که مام ڕێوی بۆ فێڵبازی و شێر بۆ ئازایه‌تی به‌کار ده‌هێنرێت. ئه‌م نمونانه ڕوانگه‌به‌خشن به منداڵ و فێری جۆرێ له بیرکردنه‌وه‌ی تایبه‌ت و له هه‌مان کاتدا هه‌ڵوێستوه‌رگرتنی تایبه‌تی له‌سه‌ر ئاژه‌ڵ و خشۆکی ده‌که‌ن و بواری وه‌کیه‌کیبوون له نێوان منداڵ و ئه‌و قاره‌مانه‌نانه‌دا ده‌ڕه‌خسێنن. به‌ڵام ئه‌م خستنه‌ڕووه‌ی شێر و ڕیوی، له بنه‌مادا هه‌ڵگری حوکمی پیشینه‌ن و له ئه‌نجامی ئه‌زموون و داناییه‌وه نین. ئه‌مه جگه له‌وه‌ی له چه‌سپاندنی (نێرێتی) شێر و (مێیه‌تی) ڕێویدا، که دواجار جێگه‌ی فیگه‌ری باوک و دایک، یان پیاو و ژن ده‌گرێته‌وه، کاریگه‌ریی هه‌یه و به‌مه‌ش گشتاندنێکی دیکه بۆی هه‌یه بێته ئاراوه که مناڵ فێر ده‌کات هه‌موو مێینه‌یه‌ک، ژنێک وه‌ک فێڵباز، سیحراوی و جاودگه‌ر ببینێت و هه‌موو نێرینه‌یه‌کیش وه‌ک شێر و قاره‌مان و پاشای دارستان..

له‌به‌ر ئه‌وه ئه‌م شێوه په‌روه‌رده‌یی و فێرکردنه به سه‌ندنه‌وه‌ی ئه‌زموون له تاکه‌که‌س، ده‌بێته هۆی هه‌ژارکردنی مه‌عریفیانه‌ی منداڵ و به‌رهه‌مهێنانی مرۆڤێکی گه‌وره، به‌ڵام (که‌م توانا و که‌مئه‌ندام) له ڕوانگه‌ی جیهانبینی و دانایی و تێگه‌یشتنه‌وه. به‌رهه‌مهێنانی ئه‌مجۆره مرۆڤ و

زەینییەتە، بۆ نمونە کاتێک لە گەورەییدا دەبێتە یاسادانەر، بۆی هەیە ڕەنگدانەوەی نێگەتیڤی لەسەر بۆچوونە یاساییەکانی هەبێت و بەناوی ئەوەی پسپۆڕیی یاسایە، بە جۆرێک بیر لە یاسا، بۆ نمونە (یاسای پاراستنی مافی ئاژەڵان)، یان مافی جیابوونەوەی هاوسەرگیریی بکاتەوە، کە ڕەنگدانەوەی حوکمە پێشینەکانی خۆی بن، لەسەر ڕوانگەیەکی تایبەت بۆ ئاژەڵان و ئەو زنجیرە گشتاندنەی بۆ مرۆڤ لەوێوە وەریگریتوون..

دەستهەڵگرتن لەم حوکم و دانایییە پێشینەییەش بۆ مرۆڤ کارێکی ئاسان نابێت و ئەمەش بۆی دەبێتە ڕێگرێکی هەرە سەرەکی لە بەدەستهێنانی دانایی زانستیانە لەسەر دەوروبەری خۆی و نەناسینی ڕاستەقینەی شتەکان و بووەکان و ئەوانیتر.

شێوازی بیرکردنەوە لە چەمکەکانی (گەورەیی) و (بچووکی)، (ڕووناک و تاریک)، (ڕەش و سپی)، (کورت و درێژ)، (پاک و پیس)، (بینا و نابینا)، (کوێر و شەل)، (کەڕ و لاڵ) و.. بەکارهێنانیان لە ڕوونکاریی پەروەردەیی و فێرکاریدا، یان وشەکانی وەک: بەرزیی و نزمی، یان چۆنێتی وەسفکردنەکانی وەک هەژاری، تاوانباریی، جوانیی و هتد.. هەموویان ئەگەری چوونەوە بەردەم خزمەتکردنیان هەیە بە چەسپاندنی خراپەی مەترسیدار و فۆرمەکانی

ڕەگەزپەرستی. خستنەڕووی (گەورە) بەو جۆرەی کە هەمیشە گەورە باشە، دانایە، توانایە، جوانە و ڕێزدارە و هتد. ئەمانخاتە بەردەم ئەوەی کە (بچووک) کەمووکوڕیی هەیە و بچووک بێدەسەلات، نەزان، ترسنۆک و بەوجۆرەیە. لەم بارەشدا خەسڵەتەکان بەسەر چییەتی گەورەیی و بچووکیدا زاڵ دەبن و ئیتر ناسینی منداڵ بۆ ئەم دوو چەمکە ئەوە نابێت کە لە خۆیاندا هەن، بەڵکە چییەتی گەورەیی و بچووکی لەو خەسڵەتە پێشوەختیانەدا کورتدەکرێنەوە، کە لە ڕوانگەیەکی تایبەتەوە دراونەتە پاڵیان.. ئەمە بۆ ڕووناک و تاریکیش هەر ڕاستە، هەروەکچۆن بۆ درێژ و کورتیش هەر وێکدێتەوە. لەبەرئەوە هەرچەندە لە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردندا، فێرکردن و ئاشنایی چەمکەکان پێش ئەزموونی تاکەکەس خۆی لەگەڵ ناوەڕۆک و بابەتی چەمکەکان، بکەوێت، ئەوەندەش مەودا لەنێوان زەین و بابەت، یان منداڵ و دەوروبەردا دروستدەبێت و ئەوەندەش ناتێگەیشتن زیاد دەبێت و ناسینی شتەکان وەکخۆیان، یان نزیک لەو ڕاستییەی کە هەن، شکست دەخوات و ئەمەش بە هەژاریی دانایی مرۆڤ لە ئاست واقیع و دیاردە کۆتایی پێدێت.

ئەم هەژارییە داناییناسیانەیە کە لە پەروەدەو کەرەستەکانیەوە دێت، لەو هەژارییە پێشزانستیی و

نازانستیە زۆر مەترسیدار ترە، کە مرۆڤ ئەزموونی هەیە بەڵام خوێندەواریی نیە، پەیوەندیی لەگەڵ واقیعدا هەیە بەڵام ناتوانێت شرۆڤەی بکات و هتد.. چونکە ئەو هەژارییەی سیستەمە پەروەردەییەکە بەرهەمی دەهێنێت نەک هەر بیرۆکە و هزری زانستی لە خۆیدا بێبەها دەکات، بەڵکو دەبێتە چەترێکیش بۆ دزەکردنی هەر جۆرە بیرۆکە و هزرێکی دژە زانستیی و پەروەردەیی لە خودی دامەزراوە زانستیی و پەروەردەییەکاندا، لەوانەش بیرۆکەی ڕەگەزپەرستی و خراپەی مەترسیدار خۆی، بە هەر ناوێکەوە بێت.

## دووەم: ئەکتەرە پەروەردەییەکان:

جیاوازییەکی بچووک، بەڵام زۆر گرنگ لە نێوان پەروەدەکار و ئەکتەری پەروەدەییدا هەیە: پەروەردەکار وەک پیشە و پرانسیپێکی پیرۆز تەماشای پرۆسەی پەروەدەیی و بنەماپەروەردەییەکان دەکات لەو ڕوانگەیەوە، کە هاوکاریی دەکەن بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە مرۆڤ. بەڵام ئەکتەری پەروەردەیی کە هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی ئاکت و ئەرکێک لەبواری پەروەدەدا، بەبێ ئەوەی مەرج بێت خۆی باوەڕی پێیبێت. یەکەمیان پەروەردە وەک ئامرازێک بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ و لە هەمان کاتیشدا دروستکردنی ئەو

مرۆڤە تەماشا دەکات، بەڵام دووەمیان پەروەردە و ئەرکەکەی خۆی وەک ئامرازێک بۆ وەبارهێنانی مرۆڤ بەو ئاراستە ئایدیۆلۆژی، ئایینی و سیاسیەی بۆخۆی بڕوای پێیەتی، بەکار دەهێنێت و مرۆڤەکە لە خۆیدا ئامانج نیە. بۆیە یەکێک لەو نەخۆشییە مەترسیدارانەی هەر سیستەمێکی پەروەدەیی دووچاری دەبێت، بریتیە لە پشتگوێخشتنی بیرۆکە و پرانسیپە پەروەردەییەکان و چەشەکردن و تێکەڵکردن و جێگرتنەوەیان بە بیرۆکەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئایینی و میزاجیی ئەکتەرە پەروەدەییەکان. نەک هەر لەبواری پەروەردەیی و فێرکردندا، بەڵکو لە بواری یاسا و ئاکاریشدا ئەم جۆرە لەڕێلادانە پرنسیپیانەیە خەسارەتی زۆری لێدەکەوێتەوە، چ لە ئاستی ڕەوتی کارەکە خۆی و چ لە تێکدان و شێواندنی ئەو سۆژەیەی پەروەردە و فێر دەکرێت. لێرەوەیە کە تاکڕەهەندیی بەسەر فرەڕەهەندیی و ڕەهاییگەریی بەسەر لێبووردەیی و فرەییدا باڵادەست دەبێت و ئەمەش مرۆڤێکی دەمارگیر بەرهەم دەهێنێت. بە بڕوای من و لە ئەنجامی چاودێریکردنمەوە بۆ ئەم دیاردەیە، ئەوە چەند ساڵێکە ئێمە بەدەست ئەم کێشەیەوە دەناڵین. خودیی سیستەمی فێرکاریی و پەروەدەیی ئێمە لە ئاستی پرانسیپە زانستیی و ستانداردەکانی خۆیدا پاشەکشەی بەردەوام دەکات و تادێت

بارگاوی دەبێت بە بیروڕای تایبەتی ئەکتەرە پەروەردەیی و فێرکارەکان و ڕەنگدانەوەی جیهانبینی ئایدیۆلۆژی، سیاسیی و ئایینی و ئایینزایی و عەشیرەیی خۆیان لە ئەرک و کارەکەیاندا. تەنانەت وابەستەییان بە کەسایەتی و ڕێبەر و سەرۆکی ڕەوتی خۆیانەوە، ڕەنگدانەوەی بەسەر شێوازی وانەوتنەوە، یان جەختکردنەوەیان لەسەر هەندێ بابەت، لادانی هەندێ بابەتی دیکە و بردنە ناوەوەی بابەت و ماتەریاڵی دیکە بۆ ناو پۆل، هەبووە. ئەمە جگە لەوەی پێدەچێت شێوازی شیکردنەوەکانی ناوپۆل و نمونەکانیشیان هەر بەو ئاراستەیەدا بووبێت.

ئەکتەریی پەروەدەیی، پەیوەندیی جەوهەریانە و مەبەستگەرایانەی نێوان پرانسیپە پەروەدەیی و فێرکارییەکان وەک بەرهەمهێنانی تێگەیشتنێکی تایبەت لە سەر مرۆڤ نابینن. بەڵکو پەیوەندییەکی ئامرازگەرایانەی نێوان پێگەی خۆیان لە بواری پەروەردەیی و فێرکاریدا دەبینن.. ئەم کێشەیە پێویستی بە چارەسەرکردن و سنووردانانی یەکجارەکیی و خێرا هەیە. بەشێکیشی لە ڕێگەی زۆرکردنی پەروەردەکاران و کەمکردنەوەی ئەکتەری پەروەردەیی و بەشێکییش لە ڕێگەی گۆڕینی ئەکتەری پەروەردەییەوە بۆ پەروەردەکار دەبێت. پێویستە ئەو پرانسیپە کانتیانەیە بکرێتە پێوەر کە فێرمان دەکات لە

بواری خزمەتکردنی پانتایی گشتیدا بەوجۆرە کار بکەین، کە ئەرکەکەمان دەیخوازێت، ئەمە لە کاتێکدا لە دەرەوەی کار و پیشەکەمان، ئازادبین لەوەی خۆمان بڕوامان بە چیی هەیە. کانت لە (ڕۆشنگەریی چییە؟)دا، نمونەی قەشەیەک دەهێنێتەوە لەو کاتەدا کە وەک قەشە دەردەکەوێت پێویستە وەفادار بێت بە بنەماکانی ئەو ئایین و کەنیسەیەی کە ئەوی تەرخانکردووە بۆ ڕوونکردنەوەی بنەماکانی ئایینی مەسیحی، بەڵام بۆی هەیە لە دەرەوەی کەنیسە خۆی بڕوای پێیان نەبێت.

## لەبارەی ڕەگەزپەرستییەوە
## (هونەری ژیان لەناو جەنگدا..)

**بنج و بنەوان:**

جەنگ تەنیا هەڵگێڕانەوەی دۆخی ئاساییش نیە بە نائارامیی و جیاکردنەوەی جوگرافیای نیشتیمان نیە لەسەر بنەمای (بەرەکانی پێشەوە و دواوەی جەنگ)، بەڵکو خۆئامادەکردنیشە بۆ تێگەیشتنێکیتر لە واقیع، لە چەمکەکان و جۆری ژیان و مامەڵەکردن و هاتنەئارای ئەخلاقێکی نوێشە کە بەهۆیەوە مرۆڤ تێگەیشتنی خۆی لەسەر ئەوانیتر و واقیع نوێدەکاتەوە و هەڵوێستی خۆی دیاریی دەکات.. جەنگ تاقیکردنەوەیەکی گرنگە بۆ مرۆڤ تا بتوانێت فێری هونەری ژیانکردن ببێت و هاوسەنگیی ڕۆحیی خۆی نەدۆڕێنێ..

یەکێک لەو دیاردانەی جەنگ دروستیدەکات، دەیچەسپێنێ و وەک حەقیقەتێکی پێویست و ئاسان دەیخاتە ڕوو، مەسەلەی بەرهەمهێنانی وێنەی دوژمن و ڕقبەخشینەوە و ڕەگەزپەرستییە لە کۆمەڵگادا.

هەمیشە تێکەڵبوونەکان، کۆچ، پەنابەری، کارەساتە مرۆیی و

سرووشتییەکان، بڕیارە پێشینەکان، نەزانی، نەبوونی زانیاریی ڕاستەقینە، نەچوونە بنج و بناوانی شتەکان، میدیا نابەرپرسیارەکان، کولتووریی زارەکیی و گێڕانەوەی دەماودەم، دەمخستنەبناگوێی یەکتر، مۆنۆلۆگ و خۆدوادندن، نەبوونی ڕاشکاوی، تێنەگەیشتن و هتد...، پێشزەمینەیەکن بۆ دروستبوونی فۆرمێکی ڕەگەزپەرستی. لەبەر ئەوە ڕەگەزپەرستی هیچ ڕاستەقینەیەکی نیە بەهۆی پرۆسەیەکی بیرکردنەوە و هزرینەوە پێی بگەین و لێیتێبگەین. بەهەمان شێوەش هیچ مەعریفەیەک بەرهەمناهێنێ تا بە هۆیەوە بگەینە ڕاستەقینەیەک کە پێشتر نەماندەزانی.

## ڕەگەزپەرستیی و (ئەوانیتر):

ڕەگەزپەرستی گەیشتن بە ڕاستەقینەیەک نیە لەسەر ئەویتر، یان تێگەیشتنێکی مەعریفەتناسانە نیە لە ئەوانیتر، بەڵکو دۆخێکی سایکۆلۆژییە کە (من)، یان (ئێمە)، بەهۆیەوە (ئەویتر)، یان (ئەوانیتر) دەکاتە بابەت و بەوجۆرە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، وەکئەوەی ئەو دۆخە سایکۆلۆژییە بەیانکەریی ڕاستەقینەی ئەوانیتر بێت. بۆیە ڕەگەزپەرستی ڕاستەقینیەکمان لەسەر ئەوانیتر پێناڵێت، ئەگەر ڕاستەقینیەکیش هەبێت ئەوە ڕاستییە لەسەر خودی خۆمان.

ئەوە ئێمەین خۆمان وەک ڕەگەزپەرست بەرجەستە دەکەین، نەک ئێمەیەک کە ڕاستەقینەیەک لەسەر ئەوانیتر دەڵێین.
ڕەگەزپەرستی پێویستی بە ئامادەیی (ئەوانیتر) نیە لە دنیای ئێمەدا تا هەمان ئەو شتانەیان لەسەر بڵێت و بهۆنێتەوە، کە لە ئامادەییاندا دەیانڵێت و دەبێتە شایەتحاڵ بەسەریانەوە. ڕەگەزپەرستی لە دووریشەوە، لە مەوداشەوە، لە نادیاریی و نائامادەیی ئەوانیتریشدا هەمان ئەو قسانە، ئەفسانانە، وێناکردنانە بەرهەمدەهێنێتەوە و دەیانجوێتەوە، کە لە ئامادەییاندا دەیانکاتە بەڵگە لەسەر ڕاستییەکانی خۆی..
ڕەگەزپەرستی، وەستاندنی هزرینە بۆ بەرهەمهێنانی حەقیقەت، چونکە لە پشت بەرهەمهێنانی ڕاستەقینەوە، هەمیشە هزر وەک بکەری ڕاستەقینە بەدیار دەکەوێت. ڕەگەزپەرستی پێویستی بە بکەری بیرکەرەوە نیە. ئەو خۆی لە جێگەی بیرکردنەوە و حەقیقەت دادەنێت و بکەر ڕەتدەکاتەوە. هەر بۆیەشە ڕەگەزپەرستی لە بنەمادا بەشێکە لە سیستەمە تۆتالیتارییەکان و ستەمکارەکان، چونکە بە خولڵقاندنی دۆخێکی سایکۆلۆژیی ڕەگەزپەرستانە، (نەک توێژینەوە بەهۆی زانستەکان و هزرینەوە)، گشت چالاکییەکی مرۆیی کە تیایدا بیرکردنەوەی ڕۆشنگەرانە بەرەو ڕاستەقینەمان دەبات، دەخاتە لاوە و وێناکردن و

وەهم و بوختانە بەڵگەکانی خۆی دەخاتە جێی هەر ڕاستەقینەیەک، کە لە ئەنجامی توێژینەوەی زانستیی و بیرکردنەوەی دروستەوە بەدەستبێت..
بۆیە ڕەگەزپەرستی چاندنی توخمی ملکەچییە لەلای مرۆڤ، چونکە ئەو کاتەی مرۆڤ، یان تاکەکەس ناتوانێت بیر بکاتەوە و بیرکردنەوەی لێدەدەزرێت، دەبێت ملکەچ بێت. ئا لێرەوە، ڕەگەزپەرستی یەکەم ئازادیی لە بکەر زەوت دەکات، کە ئازادیی بیرکردنەوەیە، یەکەم چالاکییشی لێزەوت دەکات کە چالاکیی بەدواداگەڕانیی ڕاستەقینەیە. لەبەر ئەوە، مرۆڤ، تاکەکەس، بکەر، لە ڕەگەزپەرستیدا وەکخۆی نابێت هەبێت، بوونی ئەو بچووکدەکرێتەوە لە بوونیدا بۆ دۆخێکی سایکۆلۆژیی کە تیایدا زەخیرە دەخرێت بۆ ئاستێکی ئایدیۆلۆژیی ڕەگەزپەرستانە.

## ڕەگەزپەرست وەک قوربانیی:

ئەوانەی بەم دۆخەوە دەبن و تەسلیمی ئەم ئایدیۆلۆژیایە دەبن، لە پیشە و بیرکردنەوە و تەمەن و ڕەگەزدا جیاوازن.. بەڵام هەموویان هاوبەشن لە چاوبەستێکدا کە توانیویەتی ڕاستەقینە وەک بەرئەنجامی بیرکردنەوە، لە پێناوی ڕاستەقینە وەک کۆمەڵێک وێناکردنی پێشوەخت، بخاتە لاوە

و حەقیقەت وەک شتێکی لە پێشەوە ئامادە بکاتە دیاریی بۆ هاویارانی.. بە مانایەکیتر، خاڵی هاوبەشی هەموو ڕەگەزپەرستەکان لەوەدایە کە بە ڕەتکردنەوەی ئەو ڕاستەقینانەی تەنیا و تەنیا لە ئەنجامی توێژینەوەی زانستی و عەقڵییەوە، بەدەست دێن و مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانیان وەک بکەرێکی بیرکەرەوەی چالاک، خۆی بەرجەستە دەکات، ڕەگەزپەرستی دێت و خۆی وەک ڕاستەقینەیەکی ئامادە و حازربەدەست بۆ سایکۆلۆژیای مرۆڤ بەرجەستە دەکات. ئەم ئاسانکاریی و سادەکردنەوەیەی بوونی مرۆیی، لە بوونێکەوە کە دەکرێ تیایدا چالاکانە و دانایانە و بیرمەندانە خۆی دەرببڕێ، بۆ بوونێک کە تیایدا تەنیا گرمۆڵەبوویێکی سایکۆلۆژیی و پەرچەکردارییانە بێت، ئامادەسازییە بۆ پێکەوەنانی سوپایەک لە مرۆڤ، کە نەک هەر (ئەویتر)ی جیاڕەگەز و زمان و کولتوور ڕەتکاتەوە و دەیەوێ فڕێیداتە دەرەوە، بەڵکو ئیتر ناتوانێت هاوڕەگەز و هاوچەشنەکانی خۆیشی قەبووڵ بکات و بەهەمان شێوە لە هەوڵیی فڕێدانە دەرەوەیاندا دەبێت.

ڕەگەزپەرستی هیچکات نەیتوانیوە بەدیهێنەری خۆشگوزەرانیی بێت، هیچکاتیش نەیتوانیوە پاکژکەرەوە بێت، هیچکاتیش سەرکەوتوو نەبووە لە وەدیهێنانی بەختەوەرییدا بۆ مرۆڤەکان.. ڕەگەزپەرستی تا

خۆشگوزەرانیی ماتەریالّی بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکات، ناخی دەڕزێنێت و مرۆڤایەتییەکەی لێدەمژێت. تاکو وڵات لە بێگانەکان پاکژ دەکاتەوە، پاکێتی مانای نامێنێت و هەموو وەکویەک تێوەگلاون.. خودیی بانگەشەی (پاککردنەوە)، پیسبوونە بەو ژەهرەی ڕەگەزپەرستی دەرخواردمان دەدات. تاکو بەختەوەرییش دابین بکات ئیتر کەس نامێنێت بەختەوەر بێت و بەختەوەریی مانای خۆی لەدەستدەدات..

بۆیە بەهەر نیازێک سەرمایەدانان لە ڕەگەزپەرستیدا، مایەپووچانەیە و ئیفلاسکردن ئامانجەکەیەتی. سەرەتا، ئیفلاسیی ئەخلاقی، چونکە ئیتر مرۆڤ هاوچەشندۆستی، هاوڕییەتی، مرۆڤایەتی، ئەویترویستی، لێبووردەیی و گشت شتێکیتیری بۆ گەیشتن بە پەیوەندییە مرۆییەکان و بەها نیوانمرۆییەکان لەدەستداوە.. پاشان ئیفلاسیی سیاسیی، چونکە سیاسەت بەبێ ئەخلاق هیچ مانایەکی نیە و دامەزراندنی سیاسەت بەبێ بنەمای ئەخلاقی، وەکئەوەیە ماڵێک لەسەر بۆشایی دروستبکەین. لەسەروو ئەمەیشەوە، ئیفلاسکردنی ویژدانی، چونکە ڕەگەزپەرستی بەرژەوەندیی لە بێویژدانیدایە.. لەسەرووی هەموو ئەوانەشەوە، هیچ سیستەمێکی ڕەگەزپەرستیی لە مێژوودا نەیتوانیوە دادوەر و یەکسانخواز بێت، چونکە دادوەریی دۆخێکە تەنیا ئەو

کاتە ڕەوایە کە لەناو جیاوازیدا ڕەوایەتی وەربگرێت. بەبێ بوونی جیاوازیی و هەمەڕەنگیی، دادوەریی مانای نیە.

## کورد و ڕەگەزپەرستی:

ڕەنگە یەکەمین سەرهەڵدانەکانی فۆرمێک لە ڕەگەزپەرستی بە هۆکاری ئایینی، بریتبێت لە داگیرکردنی کۆمەڵگای کوردی لەلایەن لەشکری مسوڵمانانەوە، کە پاشتر ئەم داگیرکارییە بیچمێکی ئەتینکیی نەتەوەیی و سەردەستەیی فارسی، عەرەبی و و تورکی وەردەگرێت. ئەوە بابەتێکی مێژوویی زۆر سەرنجڕاکێشە، بەتایبەتی کاتێک سەرنج دەدەینە بزووتنەوەی خەواریج و جێبوونەوەی لە وڵاتی شارەزوور و بەشداریی کورد لەو بزووتنەوەیەدا. لەم سەرەتا مێژووییە بترازێت، کە پێویستە بە وردی توێژینەوەی لەبارەوە بکرێت، فۆرمە کۆمەڵایەتیەکانی کوردستان و جیاوازیی و فرەیی کولتووری لەم وڵاتە و زمانی کوردیی بە هەموو شێوەزارەکانییەوە، مێژوویەکی هەژارانەی ڕەگەزپەرستیمان بۆ دەگێڕنەوە. پێشینەی کوردەکان بەوجۆرە نیە کە خەسڵەتی ڕەگەزپەرست بخرێتە پاڵیان. جگە لە ئەدەبیاتی نوکتە و کولتووریی زارەکیی و هەندێ وێناکردنی پێشوەخت لەسەر ئەوانیتر (کە لێرەدا ئەوانیتر، تیرەو و هۆز و تایفە و عەشیرەت و خێڵەکان)ی

ناوخۆ و نەتەوە بێگانەکانیش دەگرێتەوە، هەموو ئەمانەش لەلای گەلانیتر دەبینرێنەوە، ئەوە هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆی ڕەگەزپەرستانەمان لەلای کوردەکان بۆ نادۆزرێتەوە.

ڕەگەزپەرستی پێشینەکەی ئەوەتا لە ناو ئەو سیستەمە سیاسیە داخراو و سەرکوتکارانەدایە کە ڕەگەزپەرستیی بەشێکە لە بنەماو پێکهاتەیان.. لەبەر ئەوە دیاردەکە نوێیە، بەڵام بایی ئەوەش مەترسیدارە.. چونکە ئەوەی لە ئێستادا وەک نوێ خۆی بەدیار دەخات، بەبەراوورد بە سەردەمەکانی پێشوو، زۆر زیاتریش بڵاو دەبێتەوە و کاریگەریی خۆی دادەنێت.

سەردەمیی ئێمە سەردەمێکی تەواو جیاوازە لە سەردەمەکانی پێشووتر. ئێمە چ وەک کورد و کوردستانی و چ وەک بەشێک لە بەرەی مرۆڤایەتی، هیچ شانسێکمان لە هەڵبژاردنی هێڵی ڕەگەزپەرستیدا نیە. ڕۆحیی دژە دانایانەی ڕەگەزپەرستی بۆی هەیە بە ئاسانی جێی خۆی بکاتەوە، بەڵام هیچ خەونێکی ئێمە ناهێنێتە دی. ڕەنگە بەشێکی زۆری بیرکردنەوە ڕەگەزپەرستییەکان لە ئێستادا ڕەوایەتی خۆیان لەو ناعەدالەتییەوە وەربگرن کە لە وڵاتەکەماندا هەیە. بەڵام ئەمە بەمانای ئەوە نیە ڕەگەزپەرستی لە خۆیدا بەدیلێکی باشترە بۆ ئەو ناعەدالەتیە.

حکومەتی هەرێم لەم بوارەدا بێئەزموونە. ئەوەی ئەو ناعەدالەتییەی خوڵقاندووە نەبوونی سیاسەتێکی ناوخۆیی و دەرەکییە بۆ نیشتەجێکردنی ئاوارەکان و ئەمەش بۆتە سەرچاوەی خۆراکبەخشیی هەرجۆرە ڕەگەزپەرستییەک.. دەتوانین بڵێین: نەبوونی پسپۆڕ و نەبوونی ئەزموون و پلانێکی پتەو بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئاوارەکان لە لایەن حکومەتی هەرێمەوە، بۆخۆی هاندەریی ئەوەیە کە ئەم دۆخە سایکۆلۆژییە پەرچەکردار ئامێزە بۆ زۆرێک لە کەسەکان بخولقێنی کە خۆیان هووشیارییان بەوە نەبێت ئەوان بوونەتە ڕەیسیست. بۆیە هاووڵاتیان پێویستییەکی زۆریان بە هووشارکردنەوەی دژە ڕەیسیستیانە هەیە و ئەمەش کاری ڕێکخراوە خۆبەخش و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە بە پشتگیریی وەزارەتی پەروەردە، کاروباری کۆمەڵایەتی و زانکۆکان.. ڕەواندنەوەی ئەم بیرۆکە زیانبەخشە لە دنیای ئێمەدا ئەرکی هەموو لایەک و بە تایبەتی میدیاکان و پسپۆڕانە لە بواری فەلسەفە، دەروونناسی، کۆمەڵناسی و مرۆڤناسی و شارەزایانی سیستەمە سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەکان..

من لەو بڕوایەدام ئاپۆرە هەروەکچۆن بە زوویی ئاوەز و عەقڵیی خۆی دەخاتە بندەستی ئەوانیترەوەو بەو جۆرە بیر دەکاتەوە کە ئاراستە دەکرێت، ئاواش ئاپۆرە زوو لە ژێر

باڵی ئەم ئاراستەکردنە دێتە دەرەوە، ئەگەر میدیاکان و پسپۆڕان پێکەوە پلانێکی هاوبەشیان هەبێت بۆ هێنانەدەرەوەی ئاپۆرە و عاممەی خەڵک لەژێر دەسەڵاتی بیرۆکە ڕەگەزپەرستییەکاندا. ئەوەی کە تاوانباریی سەرەکیی و جێی مەترسییە، ئەوانەن کە خەڵک و ئاپۆرە ئۆرگانیزە دەکەن بۆ ئەوەی ببنە ڕەگەزپەرست. ئەمانە بەو کارەیان جگە لەوەی کارێکی نایاسایی ئەنجامدەدەن، ئاواش کارێکی دژە مرۆیی دەکەن و کۆمەڵگای ئێمە دەهێننە ڕیزیی ئەو سیستەمە سیاسیانەی بە شێوەیەکی ئۆرگانیزەکراو تاوانی ڕەگەزپەرستانەیان ئەنجام داوە..
چ ڕۆشنبیران، چ پیاوانی ئایینی، چ سیاسەتوانی پۆپۆلیست و چ میدیاکان دەتوانن هاندەریی ئەم تاوانانە بن. بۆیە لە ئێستادا پێویستییەکی زۆرمان بەوە هەیە کە بزانین چۆن لەسەر کێشە ناوخۆییەکان بەهۆی هەر ڕووداوێکەوە کە ڕوودەدەن، هەر لە هەڵەی ئاوارەیەکەوە کە لەسەر جادە ئەیکات، تا تەقینەوەی بۆمبێک، قسان دەکەین و چۆن بەوجۆرە ئەدوێین کە خۆراک نەدەینە ڕەگەزپەرستی. من زۆر گوێم لێدەبێت کەسانێک هەمیشە گوزارەیەک دووبارە دەکەنەوە و دەڵێن: (من ڕەگەزپەرست نیم، بەڵام..). ئەم گوزارەیە بۆخۆی ڕەگەزپەرستانەیە و شفاعەت بۆ ناڕەگەزپەرستیی بێژەرەکەی ناکات. گوزارەی (من

ڕەگەزپەرست نیم، بەڵام)، پێشدەستی و پێشەکیەکە بۆ ئەوەی هەندێ شتی ڕەگەزپەرستانە بگوترێ. ئەمە ڕەگەزپەرستییە لە فۆرمێکی ڕەتکراوەدا، کە لە هەمان کاتیشدا ڕەگەزپەرستانەیە.

بەجێی ئەوەی ڕێگای ڕەگەزپەرستی بکەینەوە، پێویستە بیر لە بەرەنگارییکردنی بکەینەوە. سیاسەتی حکومەت لە پەیوەندیی بە ئاوارە عەرەبەکانەوە زۆر بێ سەرەو بەرەیە. ڕێژەی زۆری ئاوارە و تێکەڵکردنیان بە کۆمەڵگا، کارئاسانی فەرمانگەکانی ئاساییش و کەفالەتکردنی بە لێشاو، کە ئەوەش بۆتە هۆی فۆرمێکی تری گەندەڵیی و پارەخواردن، هەروەها بەخشینی مۆڵەتی مانەوەی بێمەرج و بەکارهێنانی ئۆتۆمبێلی تایبەت، نەبوونی مەرج بۆ ئاوارەکان و نەبەخشینی هیچجۆرە بەرپرسیارییەک لەسەر شانیان، کە ئاساییترینیان بریتیە لە چوونە دەورەیەکی زمانی کوردی، تێوەنەگلاندنی یارمەتیی نێونەتەوەیی و ڕێکخراوە بێسنوورەکان وەک پێویست و بەکارنەهێنانی ئەم کەیسە گەورەیە لە میدیای جیهانیدا و نەبوونی پسپۆڕی دەروونی و کۆمەڵایەتی و نەشارەزایی ئێمە لە شێوازی نیشتەجێکردنی ئاوارە و پەنابەران و هتد، لەو کەموکوڕیی بێ سەرەوبەرەییانەی سیاسەتی حکومەتی هەرێمن. چاکسازیی و ڕێکسختنەوەی ئەم سیاسەتە و دامەزراندنی

فەرمانەگەیەکی تایبەت بەو ئاوارانە و کردنەوەی کەمپی تایبەت بە هاوکاریی دەوڵەتانی بە ئەزموونی هاوپەیمان لە بواری پەنابەری و نیشتەجێکردنی ئاوارەکاندا، گووشارێکی زۆر لەسەر حکومەتی هەرێم و سایکۆلۆژیای خەڵکی ئێمە هەڵدەگرێت.

ڕێگایەکیتر بریتیە لە هووشیارکردنەوەی هاوڵاتیان بەشێوەیەکی ڕێکخراو و پشتبەستوو بە هەندێ چەمکی وەک (لێبووردەیی، خۆشەویستی، پێکەوەژیان، کەرامەت، ئاکار، بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی، دۆستیی، میوانداریی، جەنگ، قوربانی.. ) لە پێناوی چەسپاندنی بنەماکانی ناتوندوتیژییدا.

تێبینیکردنە زانستییەکان و داتا و سەرژمێریی زیانە مادیی و ڕۆحیی و کولتوورییەکانیش بەهۆی ڕەگەزپەرستییەوە لە شوێنەکانیتری جیهان کۆکراونەتەوە، زۆر بەسوودن. مرۆڤ لە کاتی پێوەبوونی بە داوی ڕەگەزپەرستییەوە، وەک قوربانییەکی لێدێت، بۆیە پێویستیی زۆری بە هاوکاریی و وەبیرهێنانەوەی ئاکام و زیانەکانی ئەم ڕەوتە هەیە لەسەر دەروون و جەستە و کولتووری خۆی.

سیستەمی خوێندن و پەروەدە، لە ئاستی بنەڕەتییەوە تاکو پلەی زانکۆ، پێویستە چ بە زیادکردنی وانەی ئیتیک و فەلسەفە بە جەختکردنەوە سەر کولتووریی ناتوندوتیژی و

لێبووردەیی و ڕێزگرتن لە کەرامەتی مرۆیی، لەم بوارەدا چالاک بکرێن و وەک ئەرکێکی خۆیان تەماشای بەرەنگاربوونەوەی ئەم بابەتە بکەن. ئەمە جگە لەوەی هەر بابەتێکی ڕەگەزپەرستانە لە پرۆگرامی خۆیان وەدەربنێن کە بۆنی ڕەگەزپەرستی لێدێت یان بۆی هەیە خزمەتی پێبکات.. ڕەگەزپەرستی هەر بۆیە نایەت تا نوێیەتی خۆیمان بیر بخاتەوە، بەڵکو بۆیەش هاتووە تا پێمانبڵێت کە پێشتریش لە فۆرمی دیکەدا هەبووەو ئێمە نەمانزانیوە و نەمانناسیوەتەوە..

ئێمە هەر تەنیا لە بەرەکانی جەنگدا لەدژی دڕەندەیی داعشیانە ناجەنگین، بەڵکە دەبێت لەبەرەکانی کولتوور و ژیانی ڕۆحیی و ڕۆشنبیریشماندا لەدژی کولتووریی داعشیانە بجەنگین، کە ڕەگەزپەرستییش یەکێکە لەوانە، بەڵام پێویستە ئەم جەنگەیان جەنگێکی فیکری و ڕۆشنبیریی مرۆییانە بێت، نەک درووشمدان و دەمی خەڵک داخستن بە بەڵگەی ئەوەی ئێمە بەشێکین لە عێراقی فیدراڵ..

# گەشتیاریی و ڕەگەزپەرستی

ڕەگەزپەرستی بە هەر ناوێکەوە بێت، مەترسیدارە، بەڵام ڕەگەزپەرستانەترین ڕەگەزپەرستی ئەوەیانە کە دەیشارینەوە. هەرێمی کوردستان ساڵەهایە خۆی بە هەرێمێکی دیموکراتیک پێناسە دەکات و ئەوانەی ڕەخنەیەکی شەرمنانەیان لەم دیموکراسیەتە بانگەشەبۆکراوە گرتبێت، بە دوژمنی ئەزموونەکە ناوزەد کراون. ئەگەر گریمانەی ئەوەمان کرد کە ئەزموونەکە دیموکراسیانەیە و ڕەخنەگرەکانی ڕاست ناکەن، پێویستە ئەو ڕاستییە بەبیری لایەنگرانی ئەم ئەزموونە دیموکراسیە بهێنینەوە، کە سەرەتاییترین پرانسیپی دیموکراسییەت بریتیە لە ڕێزگرتن لە مرۆڤ و مافەکانی تاکەکەس و پێشێل نەکردنی کەرامەتی مرۆیی مرۆڤ.

کەرامەت وشەیەکی فەلسەفییە بۆ قسەکردن لەسەر جەوهەری مرۆڤبوونی مرۆڤ وەکئەوەی کانتی فەیلەسووف دەستنیشانیکردووە و بۆتە بنەمای فەلسەفییانەی جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ و هەر جارنامە و ڕێککەوتنێکی نێونەتەوەیی و نێودەوڵەتی لەبارەی مرۆڤ و کولتوورەکانیەوە.

کانت، ڕەهەندی کەرامەتی مرۆیی بەو جەوهەرە نەگۆڕەی بوونی مرۆیی ئێمە پێناسە دەکات، کە ڕێگەمان لێدەگرێت وەک ئامراز هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤدا بکەین، چونکە مرۆڤ هەمیشە ئامانجە. بۆچوونەکەی کانت شایانی ڕەخنەیە، چونکە لەسەر بڕوابوونی ئەو بە پیرۆزیی ڕەگەزیی مرۆییەوە دامەزراوە و مافی ئاژەڵ و ڕووەک و ژینگە و زیندەوەر بە گشتیی ناگرێتەوە. بەلای کانتەوە تەنیا مرۆڤ شایانی ئەوەیە وەک ئامانج و غایەتی گەردوون و سرووشت تەماشای بکرێ و ئەمەش دەستنیشانی یاسای نەگۆری ئەخلاقیانەی ئێمە دەکات. کانت گوتویەتی: هەرکەس پێویستە بەو جۆرە ڕەفتار بکات، وەکئەوەی بیەوێ ڕەفتارەکەی ببێتە یاسایەکی گشتی و لەهەر شوێنکاتێکدا شیاوی گشتاندن و پراکتیکردن بێت. ئەم قسەیە ئەوەش دەگرێتەوە، کە پێویستە هەر تاکەکەسێک بەو جۆرە ڕەفتار و هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوانیتردا بکات، کە بیەوێت ئەوانیش بە هەمان شێوە هەڵسوکەوت لەگەڵ خۆیدا بکەنەوە.

بکەری پشتەوەی ئەم شێوە ڕەفتارکردنەی کانت داوای دەکات، بکەرێکی گەردوونیە کە هەمیشە و لە هەموو شوێنێک بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتە ئاکارییەکانی، نەگۆڕن. کانت دەیەوێت بڵێت، بنەماکانی ڕەفتاری ئێمە لەگەڵ یەکتر

نەگۆڕن و سنوورەکانی جیاوازیی کولتوور و ئایین و سیاسەت و میزاجی تایبەت و تەنانەت شوێنکاتیش، نابنە هۆی، یان ڕێگری جێبەجێ نەبوونیان. ئەگەر ئەم بنەمایەمان کردە پێوەر ئەوە هاتنی هاوولاتییەکی سوننی یان شیعەی خواروو، بۆ هەرێمی کوردستان کە ڕەنگە لە ڕژێمی پێشوودا هاوکار بووبێت و ئەمێستاکەش کە بە گەشت دێتەوە کوردستان و هێشتاکەش کورد و ئایین و کولتوورەکەی خۆشناوێ، شایانی ئەوە نیە لەبەر ئەو هەڵوێستەی هەیەتی و ئەو کولتوورەی هەڵگریەتی و ئەو سیاسەتەی پەیڕەوی دەکات و هتد، بەهیچ بەڵگەیەک و لە هیچ شوێنێکدا بێڕێزیی پێبکرێت، چونکە هیچکامێ لە تایبەتمەندیە کەسیەکانی، بیروڕای سیاسی و بنەماکولتوری و مەزهەبییەکانی، پێوەری مرۆڤبوونی ئەو نین. ئەو وەک هەر مرۆڤێکی تر کەرامەتی هەیە و ئەگەر کەرامەتی مرۆییمان شکاند، ئەو هووشیارە بەرامبەر بەم کەرامەت شکاندنە. بە مانایەکی تر هیچ کامێ لە تایبەتمەندیە کەسییەکانی و بیروڕا و رابردووی هەڵوێستی ئێستای، ڕێگەی ئەوەمان پێنادات کەرامەتی مرۆیی ئەو بشکێنین، چونکە کەرامەتی مرۆیی ئەو بەشێکە لە کەرامەتی ئێمە خۆشمان و ئەمەش پلانی گەردوونە کە پێگەی مرۆڤبوونی ئێمەی خستۆتە سەرووی پێگەی هەر بوونەوەریکی ترەوە.

کاتێ ئێمە بانگەشە بۆ ئەزموونەکەمان وەک ئەزموونێکی دیموکراسی بکەین، ویستوشمانە تێگەیشتنی ئێمە لە مرۆڤ لە ڕوانگەیەکی دیموکراسیانە و بە پشتبەستن بێت بە بنەماکانی مافی مرۆڤ و کەرامەتی مرۆیی. یەکێک لە بنەماکانی جێگربوونی دیوکراسیەت، پرۆڤەکردنە لەسەر رەفتاری دیموکراسیانە و یەکتری قەبوولکردن و ڕێزگرتن لە جیاوازیی و فرەیی. باشترین بوارێک لەو بوارانەی ئەم پرۆڤەکردنە تیایدا بە باشترین شێوە تیایدا ڕوودەدات، بریتیە لە کرانەوە و گەشتوگوزار. خۆشبەختانە ساڵانە ژمارەیەکی زۆر لە گەشتیارانی ناوچەکانیتری عێراق روو دەکەنە هەرێمی کوردستان و هەر وەرزەش لایەنە پەیوەندارەکان پێشبینی خۆیان سەبارەت بە ژمارەی گەشتیاران بڵاو دەکەنەوە و جۆرێ لە خۆئامادەکردن بۆ ئەو مەبەستە دەخەنە روو.

بە بروای من هاتنی ئەو گەشتیار و هاوڵاتیانە، بۆ هەرێم لەو ڕووەوە نیە کە ئێمە بە مانا پرۆفێشناڵیەکەی پێگەیەکی گەشتیارانەمان هەیە و گەشتیاری بۆتە کەرتێکی پرۆفێشناڵ لە وڵاتەکەماندا. هۆکاری ئەوەی ئەو ژمارە زۆرە ڕوو لە هەرێم دەکەن، بریتیە لە نەبوونی شوێنی دیکە بۆ ڕووتێکردن. ئەمەش بە مانای ئەوەیە هەرکات شوێنی

بەدیل دروستبوو، ئەم ڕێژەیە لە گەشتیاران بە شێوەیەکی تراژیدیانە دابەزین بە خۆیەوە دەبینێت.
لەلایەکیترەوە، من تا ئێستا قەناعەتی ئەوەم لەلا دروست نەبووە کە خۆئامادەکردنی هەرێم بۆ پێشوازیی لە گەشتیاران، خۆئامادەکردنێکی هەمەلایەنە و هاوئاهەنگانە و ئەخلاقیانەش بێت. ئێمە وەها تەماشای گەشتیار دەکەین، کە بوونەوەرێکی بێ شوێن و مەئوایە و گیرفانەکانی پڕن لە پارە و وڵاتەکەمان پیسدەکات و لەبەر ئەوان جێمان تەنگ بووە. ئەمە جگەلەوەی پێمانوایە کەشتیاران، لەبەر ئەوەی بە لێشاو دێن و خۆیان شوێنێکیتریان نیە بۆی بچن، ئەوە بە هەمووشتێک ڕازین. بە ئیدارەی خراپی شوێنەگەشتیاریەکان، بە مامەڵەی خراپی پۆلیسی هاتوچۆ، بە پیس و چەپەڵی چێشتخانە و هۆتێل و خواردنگەکان و بە ڕووگرژی و بێڕێزیی فرۆشیارەکان و هتد..
فەلسەفەی گەشتیاری لەسەر بنەمایەکی مرۆییەوە دروستبووە کە مافی گەشتکردنمان دەداتێ. ئەم مافە بنەمایەکی گەردوونی هەیە و لەسەر ئەوە وێستاوە، کە مرۆڤ وەک هاووڵاتییەکی گەردوونی دەبینێ. دیموکراسیەت ئەو ساتەوەختەیە لە سیستەمی سیاسی و کولتووری کۆمەڵایەتی، کە یارمەتیمان دەدات بۆ پیادەکردنی ئەم کولتوورە و هێنانی زۆرینەی خەڵکان بە

کولتووری جیاوازی خۆیانەوە، بۆ شوێنێکی تایبەت کە هەرێمی کوردستانە. بە مانایەکی تر، دیموکراسییەت هەر ئەوە نیە کە بۆخۆمان یان سیستەمە سیاسەیەکەمان بانگەشەی دەکات، بەڵکو ئەو ساتەوەختەشە لە هەستکردنی ئەوانیتری جیاواز، کە دەتوانن لێرە و لەناو ئێمە و لەگەڵ ئێمەدا بن. ئەم هەستە لەلای گەشتیارانی ئێمە هەستێکی زیندوو نیە و پێشوازیی ئێمە پرۆفێشناڵانە و مرۆییانە نیە.

یەکەم شوێنێ کە ئەوان تیایدا هەست بە چەوساندنەوەی خۆیان دەکەن، خاڵەکانی پشکنینن. خاڵەکانی پشکنین، لە ئێستادا جیاکارەیەکی زۆریان تێدا ئەنجام دەدرێ و ژمارە و شوێنی ئۆتۆمبێلەکان، دەبێتە پێوەری چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ گەشتیاران و رێبواراندا. ئەمە لە گەراجی مۆڵ و سۆپەرمارکێت و شوینەگشتیەکانیشدا دەبینرێتەوە. من بۆخۆم لە گەراجی فاملی مۆڵ و ماجیدی مۆڵ ئەم جیاکردنەوەیەم بینیوە، کە تەعبیر لە ساتەوەختێکی ڕەگەزپەرستانە دەکات. ئەم ساتەوەختە چەندە بۆ هاووڵاتیانی خۆمان جیگەی دڵنیاییە، ئەوەندەش مایەی شەرمە، چونکە ڕامان دەهێنێت لەسەر چاوپۆشیکردن لە شکاندنی کەرامەتی ئەوانیتر و ئەمەش هەستی خۆبەگەورەزانی و لوتبەرزی لە ناخی ئێمەدا گەورە دەکات

و وامان لێدەکات خۆمان لەوانیتر بە خاوێنتر و بگرە باشتریش بزانین.

لە کۆتاییشدا ئەمە دەبێتە هۆی هەڵاوساندنی هەستی ڕەگەزپەرستیمان. ڕەگەزپەرستییەکی شاراوە، نەگوتراو و نادیار.. ئەمجۆرە لە ڕەگەزپەرستی، چەندە لە نەبوونی یاسای مرۆیی و دیوکراسیانە و غیابی ڕێنمایی پێویست و پرۆفێشناڵانەیە، ئەوەندەش لە ناخی خەڵک و بەرەنجامی لەخۆتێگەیشتنێکی هەڵەیە. لە خۆتێگەیشتنێک کە مافی پیسکردن، قەڵەباڵغکردن، دەنگە دەنگکردن، فڕێدانی شووشە و پاکەتی جگەرە لە جامی سەیارەوە، بە خۆمان دەدات، بەڵام بۆ ئەوانیتر بە تاوانی دەزانێت و وەک غەدر بۆسەر خۆی تەماشای دەکات.. ئەمجۆرە ڕەگەزپەرستیە چ لە ئەنجامی نەبوونی ڕێنمایی و یاسا و چ لە ئەنجامی دواکەوتوویی کولتووریی خەڵکەوە بێت، هەردووکیان بۆ کەرامەتی مرۆیی و دیموکراسیەت، مەترسیدارن و کەمکەرەوەی جەوهەری بنەما مرۆییەکان مەترسیدارن و هەر ئەم ڕەگەزپەرستیە شاراوەیەشە، کە گۆڕ بۆ کەرتی گەشتیاریی هەڵدەکەنێ.

# له دژی ڕەگەزپەرستی

ڕەگەزپەرستی تاوانێکی دژە مرۆڤانەیە. ئەو کەسەی ڕەگەز دەپەرستێ و پاساوی بۆ دەهێنێتەوە، لە دەرەنجامەکانی ئەو کارەی بەرپرسیارە.

ڕەگەزپەرستی فۆرمێکی ڕێکخستنە، مۆبێلیزەی ئاپۆرە دەکات، هاندەرێکی خێرا و کاریگەرە بۆ ئەوەی خەڵک کێشە سەرەکیەکانی خۆیان لە بیر بکەن و بچنە سەر ڕێبازێک لە دژی مرۆڤگەلێکی دی کە هەمان کێشەی مرۆیی وەکئەوانیان هەیە .هەرچەندە ڕەگەزپەرستی بۆ بەهێزکردنی ناخەکیی ئەندامە کاتیەکانی گرنگە، بەڵام لە ڕووی دەروونیی و کەسایەتیەوە زیانی گەورەیان پێدەگەیەنێت. ڕەگەزپەرستی ژەنگێکە لە ناخمان دەدات و نیشانەکانی لە ئاکارماندا دەرکەوێت . ڕەگەزپەرستی ئامرازێکی مەترسیداری خۆرێکخستنە، چونکە ئەم ئامرازە بنەمایەکی مەعریفی نیە و لەسەر بنەمای نەزانییەوە دامەزراوە. ڕەگەزپەرستی لە بنەمادا نەبینە، تاریکیە، بەدبەختی هزرین و پاساوێکە بۆ دوور کەوتنەوە لە بەرپرسیارێتی لە ئاست بەرەی مرۆڤایەتیدا .

ڕەگەزپەرستی قووڵبوونەوەیە لە جەهالەت و بەرهەمهێنانی ڕقە لە دەروونی تاکەکەسدا، کە تەنانەت ئەگەر زۆرینەش

وەکو یەک ڕەگەزپەرستانە بیریان کردەوە و ئەمەش ئەوانی بەهێز کرد، هەر ڕەوایەتی وەرناگرێ، چونکە ڕەگەزپەرستی بیرکردنەوە و کردەیەکی دژە مرۆڤانەیە. ئەمە تاکەمیراتێکی نابێت بۆ نەوەکانی پاشەڕۆژی جێبهێڵین، چونکە لە بنەمادا هەر کارێک یان بیرکردنەوەیەک دژە مرۆڤانە بێت، دژی داهاتوویشە. ئێمەش بۆمان نیە بەو پاساوانەی لە ئێستادا بۆ بیرکردنەوە و کارەکانمان دەیانهێنینەوە، ئێستا بکەین میراتێکی مردو بۆ نەوەکانی داهاتوو.

هیچکات لە مێژوودا ڕەگەزپەرستی چەندەش باو، پەسەندکراو و بڵاو بوبێت، ڕەوایەتی ئاکاریانەی وەرنەگرتووە. بە هەمان شێوەش نەیتوانیوە دروستکەری شوناس بێت. هیچ (من)ێک لە مێژوودا نەیتوانیوە بە پاکتاوکردنی (ئەوانیتر) ببێتە (خۆی). ئەگەر (ئێمە) تەعبیر بێت لە (کورد) لەبەرامبەر (بۆ نمونە: عەرەب)دا، ئەوە هەرگیز ئەم ئێمەی کوردیە بە سڕینەوەی ئەوانیتر نەیتوانیوە و ناتوانێت ببێتە خاوەن شوناس.. کوردبوون بەرەئەنجامی سڕینەوەی هەموو ئەوانە بە عەرەبەکانیشەوە نیە، کە لە هەوڵی سرینەوەی کورد و قەڵاچۆکردنیدا بەشدار بوون، کوردبوون جەوهەرێکە لە ئینتیمایەکی مرۆییەوە خۆی دروستدەکات نەک لە ڕقیەوە بەرامبەر ئەوانیتر..

ئەو مرۆڤەی لە ئەرزی واقیعدا (من)ی ڕەگەز پەرست دەیخاتە بری هەموو (عەرەب)، بیری دەچێتەوە کە ئەم (عەرەب)ـە لە دۆخی (ئاوارەیی)دایە و پەناهێنەرە بۆ دالدەدەر. لەبەر ئەوە ئەوەی ڕەگەزپەرستی لێمان دەشارێتەوە، ئەخلاق داوای دەکاتەوە. ڕەگەزپەرستی عەرەببوون دەکاتە جەوهەر و مرۆڤبوون دەخاتە پەراوێزەوە. لێرەشەوە ڕەگەزپەرستی گۆڵێکی ئەخلاقیمان لێدەکات و ئەخلاقەن لەککەدارمان دەکات لەبەردەم مرۆڤایەتیدا. منیش لەگەڵ ڕێکخستنی دۆخی ئاوارەکاندام، لەگەڵ ئەوەدام شوێنی تایبەتیان بۆ تەرخان بکرێت، حکومەت و ڕێکخراوە جیهانیەکان بخرێنە ژێر گووشارەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی فەرمی لە هەوڵی چارەسەردا بن، شوێنی کۆکردنەوەی یارمەتی، ژیان، دالدەدان لە ژیانی ئاسایی جیا بکرێتەوە، کۆنترۆڵ هەبێت، لێپرسینەوە هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نیم ڕەگەزپەرستی ببێتە ڕێچکەی چارەسەر.

ئێمە میللەتێکین بە زۆرشت ناوبانگمان دەرکردووەو زۆر ناوبانگی شاراوەشمان هەیە، یەکێک لەو ناوبانگە شاراوانەمان کە ڕەگوڕیشەی لە کولتووری کوردیی هەموو پارچەکانی کوردستاندا هەیە میوانداری و میواندۆستیە. کولتووری میواندۆستی بنەمای ئەخلاقی پێکەوەبوون و

ڕێزگرتنە لە کەرامەتی مرۆیی یەکتر. کوردستان پێویستە بەدوای بەرجەستەکردنی ئەم ناوبانگەیدا بێت و لە ڕێگەیەوە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی شەرمەزار بکات، کە لە ئاستی ئاوارەکاندا کەمتەرخەمی دەنوێنێ.. لە ڕووی مێژووییشەوە کۆمەڵگای کوردستان فرەییەکی ئەتنیکی و ئایینی و کولتووری دەوڵەمەندیی هەیە، ئەمە سامانێکی نەتەوەیی و ڕۆحییە و دەبێت بیپارێزین و نەیکەینە قوربانیی بیرکردنەوەی تەسک و تاریکبینیی ڕەگەزپەرستیانە. ئاکامی ڕەگەزپەرستی سبەی یەخەی خۆشمان دەگرێتەوە، ئەویتری ڕەگەز پەرست شیاوی کشان و خۆفراوانکردنە. ئێمە لە کەنار یەکترەوە دەژین و ژیاوین، نابێت ببینە ئەویتری یەکتری بە پێورێکی ڕەگەزپەرستانە.لە ئەزموونی کۆمەڵگا ئەوروپایی و سکەندناڤیەکانیشەوە، کە سەرەتێک و تا ئێستاش کەسانێک ڕەگەزپەرستانە دەهزرن و ڕەفتار دەنوێنن، وانەیەکی گەورە فێر دەبین: ئەم کۆمەڵگایانە بە یاسا و بەرچەرچدانەوەی ئاکاری، بە سیستەمی دیالۆگ و خۆخستنەبری، بە لێبووردەیی و پێکەوە ژیان لە دژی جەهالەتی ڕەگەزپەرستی جەنگاون و سیستەمە سیاسی و پەروەردەیی و ئەخلاقییەکەی خۆیان نەکردۆتە قوربانیی مەرامیی بەشێک لەو کەسانەی کە ویستویانە خۆیان و

کۆمەڵگاکەیان بە شێوەیەکی ڕگەزپەرستانە ڕێکبخەن.. سەرکەوتنیش هەر بۆ ئەم هێزانە بووە و مایەپووچیش بۆ ڕەگەزپەرستان.

کۆمەڵگای کوردستان کۆمەڵگایەکی تازەیە و وێڕای هەموو کێشە ناوخۆییەکانی، خەریکە بەرەو سنوورەکانی دیموکراسیەت و کرانەوە هەنگاو دەنێت، لەم دۆخەدا دووربینی و گشتبینی گرنگترە لە کورتبینی و تاریکبینی، مرۆڤ دەبێت ئاکاری خۆی لەسەر بنەمایەکەوە دابرێژێت کە سبەی ڕووی هەڵبێت ڕووبەڕووی جیهان ببێتەوە، نەک پەنا بۆ ئەو دۆخە سایکۆلۆژی و خرۆشانە دەروونیانەبەرێت کە لەبەردەم مرۆڤایەتیدا شەرمەزاری دەکەن ..

من هەموو ئەو کەسانەم خۆشدەوێن کە لە خەمی شار و ناوچە و کۆمەڵگای خۆیاندان، بەڵام ڕەگەزپەرستی و عەرەب دەرکردن و قەدەخەکردنی ئاوارەکان بۆ ناو شوێنە گشتیەکان و قاوەخانە و بازاڕەکان بە شێوازێکی شیاو بۆ ئەو مەبەستە نازانم..

2014

# جەنگ و ڕەگەزپەرستی

١. هەمیشە بارودۆخەکانی جەنگ، بەو گوشارەی دەیخەنە سەر خەڵک برەو بە ڕۆحی ڕەیسیزم دەدەن.

٢. مەترسیدارە مرۆڤ لەو کاتانەدا بەو جۆرە لەسەر ڕەفتاری جەنگخوازان قسە بکات وەکئەوەی قسە لەسەر تەواوی ئەو نەتەوە و میللەت و ئایینە قسە بکات کە شەڕفرۆشان خۆیانی دەدەنە پاڵ.

٣. جەنگ بەشێکی سەرکەوتنەکەی لەوەدایە کە کەشوهەوایەک بخوڵقێنی هەموو (ئێمە)کان یەکبخات و بەگژی هەموو (ئەوانیتر)یدا بکات..

٤. بەڵام بەشێکی سەرکەوتن لە جەنگدا ئەوەیە کە هەموو (ئێمە)کان نەکەوینە ئەم داوەی جەنگ بۆمان دەنێتەوە و تەسلیم بەو گشتاندنە نەبین کە ئەوانیتر وەک بەشێک لە سرووشتی ڕەوای جەنگ بەسەر ئێمەدا دەیسەپێنن..

٥. (ئێمە) بە سرووشت دوژمنی (ئەوان) نین، بەڵکو ئەوە

بەشێکی زۆرکەم لە (ئەوان) دەیانەوێت ئەم دوژمنایەتیە وەک گشتاندنێک دروستبکەن و بایی ئەوەش لەم کارەدا سەرکەوتوو دەبن، کە بتوانن نەتەوە و میللەتی خۆیان بگەوجێنن و بەو جۆرە (ئێمە)یان بۆ وێنا بکەن، کە دوژمنە ڕاستەقینەکەیانین..

٦. بەمجۆرەش جەنگ تەنیا ئەو کاتە سەرکەوتوو دەبێت کە ڕێژەیەکی زۆر لە گەمژەیی و گەوجاندن بۆ شەڕخوازان سەر بچێت.. ڕەیسیزیم و ڕقبوونەوە لە (ئەوانیتر) بەبێ گەوجاندنی خەڵک و خوڵقاندنی دۆخێکی بە گەمژەکردن بۆ کەس سەرناچێت.

٧. بەعس لەسەر ئەم هێڵە و بەناوی (نیشتیمانی عەرەبیەوە) کاری کرد، بەڵام نەک هەر نەیتوانی هەموو عەرەب و گشت مسوڵمانان بکاتە دوژمنی کورد، بەڵکو دۆستەکانی ئێمە لەناو عەرەب و مسوڵمان و مەسیحی و وڵاتانی عەرەبیدا لەناو ئەوانەوە دروستبوون کە هەرگیز تەسلیم بەم بانگەشانە نەبوون..

٨. مرۆڤ نابێت لەبەر ئەو گوشارەی شەڕخوازان دەیهێننە ئاراوە، دۆستەکانی خۆی نائومێد بکات.. خۆ لەدەستدان و

پەشۆکان و تەسلیمبوون بە کەشوهەوای گرژییەکانی جەنگ هەنگاوی سەرەتایە بۆ نائومێدیی دۆستەکان لەناو دڵی دوژمنە شەڕخوازەکاندا.. مرۆڤ کاتێ لە دڵی ئەواندا سەنگەری هەبێت، نابێت بە ئاسانی چۆڵی بکات..

# پەروەردە و فێرکردن
# وەک سامانی گشتی

گومانم نیە لەوەی پەروەردە و فێرکردن بەشێکن لە سامانی گشتی. بەڵام هیچ بنەمایەکی تیۆریم بۆ ئەم خستنەڕووە نیە. هێندە هەیە دەمەوێت بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی کۆمەڵگای خۆمان و بە بنەماوەرگرتنی (داهاتوو) وەک (بەهایەکی بەرز)، بیر لە پەروەردە و فێرکردن وەک (سامانی گشتی) بکەمەوە.

سامانی گشتی وەک هەر سامانێکی تر، وەک نەوت، گاز و سامانیی ژێرزەوی، یان وەک سرووشت و ژینگەی هاوبەش و دانایی زانا و هزری فەیلەسووف و بەرهەمی شاعیران و هەر شتێکیتری مانادار لە ژیانی ئێمەدا، ئەرک و مافی گشتی بەسەرەوەیە. گشت لە ئاست سامانی گشتیدا هەم بەرپرسیارە و هەم ماف و پشکی تیایدا هەیە. ناکرێ مرۆڤ خۆی بە خاوەن ماف و پشک بزانێت و ئەرکی خۆی لە ئاستیدا جێبەجێ نەکات. شەقام شوێنێکی گشتیە، وەک شوێنێکی گشتی دەبێت باش و لەبار بێت، ئەمەیان ئەرکی حکومەتە تاکو بەو باجەی لە خەڵکی دەستێنێت، نوێ و

نۆژەنیان بکاتەوە. بەڵام ئەرکی هەمووانیشە بیپارێزن، لانیکەم سەرپێچی لە یاساکانیدا نەکەن و بەهەڵە بەکاری نەهێنن و نەیکەنە زبڵدانێکی گشتی. فیلمێکی ڤیدیۆیی ئەمەریکاییم بینی کە تیایدا خانمێکی گەنج بەهۆی ماتۆڕەکەیەوە، شوێن ئەو کەسانە دەکەوت کە لە ئۆتۆمبیلەکانیانەوە خاشاک و زبڵیان فڕێدەدایە سەر شەقامەکان. ئەو هەڵیدەگرتنەوە و فڕێیدەدایەوە ناو ماشێنەکان.. ئەوەی مافی گشتی پێشێل بکات، دەبێت سزای خۆی وەربگرێت. ئەوە چ فڕێدانی قنچکە جگەرەیەک بێت، یان بازرگانیکردن بە نەوتەوە لەگەڵ داعش.

مافی گشتی لێرەدا و لەم تێگەیشتنەی مندا بۆ ئەم چەمکە، مانایەکی تایبەتی هەیە. (گشتی)ی لێرەدا بەمانای سەرژمێری و کۆی ئەو دانیشتوانە نایەت کە لەو شوێنە دەژین و حەقیی سوودمەندییان هەیە لە سامانە گشتیەکان، بەڵکو (گشتی) لێرەدا مانایەکی زۆر لەوەش فراوانتر وەردەگرێت کە دەرەوەی ئەم کات و شوێنەش بگرێتەوە (ئێمە) هەنووکە تیایدا دەژین، سامانی گشتی بەم مانایە هەمیشە سامانی نەوەکانە..

بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەم مانایەی گشتی، (ئێمە) لە چوارچێوەی دڕندەیەکدا دەرکەوێت، کە تێڕوانینی بۆ گشتی و مافی گشتی، سنووردار دەکات لەو شوێنکاتەی تیایدا

دەژی و خۆی دەکاتە (خاوەنداریی گشت و ڕەها)ی هەر سامانێک کە لە تەمەنی خۆیدا دەتوانێت دەستی بەسەردا بگرێت و وەک کالاّ بیخاتە خزمەت پڕۆژە و تەماعە تایبەتیەکانی خۆیەوە.

ڕەتکردنەوە و لێکردنەوە و دابڕکردن و لەبەرچاونەگرتنی مافی ئەوانەش کە لەمەودوا دێن و بەردەوامی بە نەوەی مرۆیی لە هەمان ئەم شوێنە و لە کاتێکیتردا دەدەن و خۆیان وەک ئێمە بە مرۆڤ و کورد، پێناسە دەکەن، ڕۆحیی ستەمکاریی و دیکتاتۆرییەتە. ئەم دابڕکردن و بێبەرییکردن و چاوپۆشییکردن و قۆرخکردنە سەرلەبەری بیرکردنەوە و سیستەمی ئەخلاقیی و دادوەریی ئێمە دەخاتە ژێر پرسیارەوە. بۆیە تەنیا هەر ئەوە ئەخلاقیی و ڕەوا نیە کە لە ئێستادا ڕەوایەتی وەردەگرێت، یان بە کردەیەکی ئاکارمەندانە وەسفدەکرێت. بەڵکو پێویستە ئەو ڕەوایەتی و ڕەفتارە ئەخلاقییە بۆ نەوەی داهاتوویش ڕەوا و ئەخلاقیانە بێت.

لەبەر ئەوە، سامانی گشتی پەیوەندییەکی قووڵ و ڕاستەوخۆی بە بیرکردنەوەی ئێمەوە هەیە لە داهاتوو، هەروەها بیرکردنەوە لە داهاتوو نیشانەی ئامانجداربوونی بیرکردنەوەکەمانە و لێرەشەوە هەر هەنگاوێکمان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە وەکئەوەیە بیر لە داهاتوو بۆ هەموان

بکەینەوە. بۆیە داهاتوو بەهایەکی بەرزە، بەهایەکی نادیار، لێرەنەبوو، بەڵام چاوەڕوانکراو، پێشبینیکراوی ئەوتۆ کە وەک داینەمۆی بوونی مرۆیی ئێمە لە پشت بەجوڵەخستنی هەر کار و کردەوەیەکمانەوەیە.

هەموو بەهایەکی بەرز، لە بنەمادا بەهایەکی هاوبەشە. بۆیە کاتێک قسە لەسەر (پەروەردە وەک سامانێکی گشتی) دەکەین، لە هەمان کاتیشدا وەک بەهایەکی هاوبەش دەیهێنێنە ناو بیرکردنەوەی خۆمانەوە.

بەڵام پەروەردە و فێرکردن وەک بەهای هاوبەش و وەک سامانی گشتی، جیاوازییەکی بنەمایی لەگەڵ بەها و سامانە هاوبەش و گشتییەکانیتردا هەیە. هەموو سامانە گشتییەکانیتر پێش بیرکردنەوەی ئێمە لە بوونی ئەوان، بۆخۆیان لە سرووشت و دەوروبەرماندا هەن و پاشان ئێمە بەهۆی ئەزموون و بەرزبوونەوەی ئاستی هووشیارییمانەوە، بیریان لێدەکەینەوە، ئاشکرایان دەکەین و بە دەستپێوەگرتن و بەهۆی پلانیی تایبەتەوە سوودیان لێوەردەگرین.

بەڵام پەروەردە وەک سامانی گشتی، ئەنجامی بیرکردنەوەی پێشوەختە لە مرۆڤ و کۆمەڵگا: ***چۆن لە پەروەردە و فێرکردن ئەو مرۆڤە لە ڕووی ئەخلاقی و بەرپرسیارێتی و زانستی و هووشیارییەوە دروستدەکەین***

***كە بۆ داهاتوومان وەک سامانێکی گشتی بەرجەستە دەبێت؟*** پەروەردە و فێرکردن بە ڕامان لە ئێستا و بە بیرکردنەوە لە داهاتوو وەک سامانێکی گشتی لەو مرۆڤانەدا بەرجەستە دەبێت منداڵانی ئێستا و کەسانیی دواڕۆژن و داهاتووی ئەم وڵاتەیان دەکەوێتە بەردەست.

سامانی گشتی نەک هەر سامانە بۆ ئەم نەوەیەی ئێستا لە ژیاندایە، بەڵکو سامانی گشتیی ئەو نەوانەشە کە بەڕێوەن بێنە ژیانەوە. بۆیە مامەڵەکردن و دەستبردن بۆ سامانی گشتی، هەمیشە قەیدێکی ئەخلاقیی لەسەرە: بەو ئەندازەیە دەستدەبەین بۆ سامانی گشتی کە پێویستییەکانی ئێستامان بەشێوەکی ڕێژەیی بۆ پڕ بکاتەوە و ڕێگەخۆشکەربێت بۆ ژیانێکی ئاسوودەی نەوەکانیی پاشتر. بەمجۆرەش بەکارهێنانی سامانی گشتی بیرکردنەوەیەکی جوت جەمسەر دەکات بە بەری ئاکارەکانماندا: لەیەک کاتدا بیرکردنەوە لە ئێستا و لە هەمان کاتدا بیرکردنەوە لە داهاتوو.

پەروەردە و فێرکردن هەر تەنیا دیسپلینێکی زانستی، یان مەهارەتێکی پیشەیی، یان بڕێک لە خزمەتکردن نیە بە کۆمەڵگا و دەستەیەکی تایبەت لە ئێستادا، بەڵکو هەڵوێستێکی ئەخلاقیانەشە لە ئاست داهاتوودا. هەڵوێستێکی پێشوەختی ئەخلاقیانەیە کە بەرجەستەکەری ئیلتیزامی ئێمەیە لە ئاست ئەوانیتری هاوچەشندا.

بەبێ فراوانکردنی تێگەیشتنمان لە پەروەردە و فێرکردن بە ئاراستەی چۆنێتی دروستکردنی داهاتوو، پەروەردە لە پەروەردەی جەستەیی و وەبارهێنان و فێرکردنی هەندێ شتی وەک کامە چاکە و کامە خراپە بە منداڵەکان و هەروەها فێرکردنیش لە چوونە قوتابخانەدا کورت و بچووک دەکەینەوە. لە کاتێکدا هیچکام لەمانە مانای تەواوی پەروەردە و فێرکردن نادەن بەدەستەوە. لەبەر ئەوە نیاز لە ناردنە قوتابخانە نابێت هەر ئەوە بێت کە منداڵان لە پرۆسەیەکی دووردودرێژی چەندین ساڵەدا بە زۆر یان بە حەزی خۆیان، رۆژیی چەند کاتژمێرێک بنێرێنە دەرەوەی ماڵ، بەڵکو ئەم نیازە پێویستە لە تێگەیشتنی ئێمەوە بێت لە کارکردی داهاتووییانەی قوتابخانە وەک دامەزراوەیەکی پەروەردەیی و فێرکاری. بەمجۆرەش هەر وەکچۆن لە ئێستادا سەنگەرەکانی پێشەوەی جەنگ بەرگریی لە مانەوەمان دەکەن، ئەوە چالاکیی و سیاسەتی پەروەردەیشمان ئەو سەنگەرانەن کە داهاتوومان بۆ دابین دەکەن. ئەم تێگەیشتنە دابڕ نیە لە پێشبینیکردنی ئێمە بۆ داهاتوو کە دەمانەوێ لە رێگەی ئەم نەوەیەوە کە ئێستا دەیاننێرینە قوتابخانە، ئاراستەشیان بکەین بەرەو داهاتوویەک کە بەرژەوەندیی گشتی ئێمە و هاوچەشنەکانمانی تێدا پارێزراو بێت. بۆیە دەبێت لە ئێستادا

بەهەمان ئەندازە بایەخ بە سەنگەرەکانی پەروەدە و پێشمەرگە بدرێت. سەرکردە و شەڕڤانانی هەردوو بەرەکەی جەنگ هەمان ئەرک جێبەجێ دەکەن.

لەبەر ئەوە پەروەردە و فێرکردن وەک سامانێکی گشتی، جگە لە بنەما پیداگۆکیی و زانستییەکەی، لەسەر بنەمای پرانسیپێکی ئەخلاقییەوە دامەزراوە کە تیایدا هاوچەشندۆستی و بەرزکردنەوەی ئاساییشی ژیان و مرۆڤویستی لەسەرووی هەموو شتێکیترەوەن.. ئەگەر لێرەوە بڕوانینە قوتابخانە و فێرکارو فێرخواز و مامۆستاکان، ئەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم دامەزراوەیە چ گرنگییەکی لە ژیانی هەریەکێکماندا هەیە و چۆن دەتوانین لە ڕێگەی ئەم دامەزراوەیەوە ئامانجی هاوبەش و خەونی هاوبەش دروستبکەین وچۆنیش لە پێناوی ئەو ئامانجە هاوبەشەدا کۆدەنگیی ئەخلاقیانە و پراکتیکیانە پێکبهێنین. بەمجۆرەش پەروەردە و فێرکردن هەر تەنیا چوون وناردنی منداڵ نیە بۆ قوتابخانەکان، هەر تەنیا فێرکردنیان نیە بەوەی ناوی خۆیان بنووس و ببنە خوێندەوار، بەڵکو ئەمە هەڵگریی ئەو نیگا ئەخلاقییەشە کە ئێمە هەمانە بۆ داهاتوو، کە تیایدا بەهای هاوبەش و ئاماجی هاوبەش لە دەوری سامانێکی گشتی کۆماندەکاتەوە.

به بڕوای من ئەم تێگەیشتنە لە پەروەردە و فێرکردن هەر تەنیا بەس نیە بەشێک بێت لەو سیستەمە سیاسیەی جڵەو و ئاراستەی ڕەوتی پەروەردەیی لە کۆمەڵگادا دەکات، بەڵکو گرنگیشە بەشێکی جیانەکراوە بێت لە نیگای دایکان و باوکان بۆ منداڵەکانیان و بۆ داهاتووش. گرنگە ئەوانیش لەوە تێبگەن کە ناردنی منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە هەر تەنیا ئەرکێک نیە، بەڵکو هەڵوێستیکیشە لە ئاست داهاتوودا و بگرە لەوەش زیاتر: بەشدارییەکیشە لە دروستکردنی سامانێکی گشتیدا کە دەکرێ بە دڵنیاییەوە داهاتووی لەسەرەوە بینا بکرێت.
ئەم نیگایە پێویستە لە پرۆسەیەکی پەیوەندارانە و بەشداریکەرانەی دایکان و باوکان و سەرپەرشتیاران لەگەڵ دامەزراوە فێرکاریی و پەروەدەییەکانیشدا پەرەی پێبدرێت و بە دەروونییبکرێت و ببێتە بەشێک لە ڕۆشنبیریی گشتیی نیوان پەروەدەکاران و فێرکاران و باواندا. لێرەشەوە زیندووکردنەوەی کۆی ئەو بۆنە و ڕێتوالانەی کە ڕێگە بەبەشداریی باوان لە ژیانی قوتابخانەدا ئەدات، وەک کۆبوونەی گشتی و خولی ڕاهێنان و ڕۆشنبیری و هتد، زۆر گرنگن و پێویستە بەبەردەوامی ئەنجام بدرێن بۆ ئەوەی ژیانی خێزانیی و ژیانی قوتابخانەیی تێکەڵ بەیەکتر بکرێن و شوێنێکی گشتی، یان ژوورێکی ئۆپەراسیۆنی

پەروەدەیی هاوبەش بێتە کایەوە کە هەمووان و پێکەوە بە ئاراستەی ئامانجی هاوبەش و پارێزگاریکردن لە سامانێکی گرنگیی هاوبەش کار بکەن.

# سێ بەڵگە سەبارەت بە مافی زانین و فێربوون

**بەڵگەی یەکەم :**

زانین و فێربوون، مافی سرووشتیی مرۆڤە و پەیوەندیی بە تەمەنییەوە نیە. هەرشتێک مافی سرووشتیی بێت، پەیوەستە بە جەوهەری بوونیەوە، کە شتێکە پێبەخشراوە و کەسیش دەسەڵاتی ئەوەی نیە ئەو شتەمان لێبستێنێتەوە، یان رێگە لە گەشەی بگرێت بەرەو کامڵ بوون، کە سرووشت و خودا پێیان بەخشیوین. ئێمە لەبەر ئەوەی مرۆڤین، پێویستە بزانین و وەک ئەریستۆتالیس گوتویەتی: مرۆڤ بە جەوهەر بوونەوەرێکە لە دۆخی سەرسوورِماندا بەرامبەر بە بوون و گەردوون. هەر ئەم سەر سوورِمانەشە هانیدەدات بۆ فێربوون و زانین. پاشان لەبەر ئەوەی بە درێژایی تەمەن، بوونی مرۆیی بە نەزانین دەورە گیراوە و نەزانیی وەک زانین بەردەوام بەرهەم دێت، ئەوە مافی سرووشتەکی مرۆڤە کە هەتا دەژی، فێر ببێت.

**بەڵگەی دووەم:**

لە ئایینیشدا، هەر لە ئایینە فرەخوداکانەوە، تا ئایینە تاکخوداکان، زانین و فێربوون، ئەرکێکی مرۆیین و ئەم ئایینانە دنەدەر و رێنماییکەری فیربوونن. ئایینی بوودایی و

کۆنفسیۆسی و جەینیزم و زەردەشتی، هەر یەکەیان بە شێوەی خۆیان ستایشی زانین و حیکمەتیان کردووە. لە ئایینی یەهوودی و مەسیحیشدا بەهەمان شێوە. تەنانەت ئاگۆستینی قەدیس، بڕواهێنانی مەسیحییەکی دانا بە گرنگتر لە بڕوای مەسیحییەکی نادان، ستایش دەکات. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەری مسوڵمانانیش، خودا زانینی خستۆتە پێش، یان سەرووی عیبادەتەوە و ئەو کەسەی دینداریکی باشە، پێویستە نرخی زانین و دانایی بەرز ڕابگرێت، چونکە ئەوە باری ئیمانداریی و مرۆڤبوونی ئەو بەرز دەکاتەوە.

**بەڵگەی سێیەم:**

پەروەردە و فێربوون، زیاتر لەوەی سیستەمێک بێت پەیوەست بە ئێستا و ڕابردووەوە، سیستەمێکی پەیوەست بە داهاتووەوە. ئەم سیستەمە ئەرکی دروستکردن و ئامادەکردنی مرۆڤ، یان تاکەکەسێکە بۆ داهاتوو. لەبەر ئەوە پێویستە لەم سیستەمەدا، هیچ سنوورێک، یان ڕێگرێک بۆ توانا سرووشتەکی و ڕۆحیی و کولتوورییەکانی مرۆڤ و تاکەکەس دانەنێت، کە بەرەو داهاتووی دەبەن. داهاتووی مرۆڤ بەشێکی پەیوەندیی هەیە بە داهاتووی ژیانی تایبەتی و تاکەکەسیانەی خۆیەوە. لەم بەشەدا تاکەکەس خۆی

دروستدەکات و سەرکەوتن و بەختەوەرییەکانی خۆی دەستەبەر دەکات. بەشێکی پەیوەندارە بە داهاتووی ڕەگەزیی مرۆییەوە. لەم بەشەشدا، تاکەکەس لە ڕێگەی خۆدروستکردن و سەرکەوتنەکانیەوە، لە ڕێگەی خزمەت و کارە دروستەکانییەوە، خزمەت بە چاکەی گشتیی و هاوڕەگەزەکانی دەکات، تەنیا بەوەی دەبێتە نمونەی کەسێکی باش. بۆیە هەرجۆرە ڕێگرییەک لەوەی مرۆڤ لە ئاستی تاکەکەسی و ڕەگەزیدا، نەتوانێ بۆ داهاتووی خۆی و ڕەگەزەکەی تێبکۆشێ و فێر ببێت، وەک تاوانێک بە مافی مرۆڤایەتی لێکدەدرێتەوە و بایی ئەوەش مرۆڤایەتی لە گەیشتن بە ئاشتی و سەرکەوتن و کامەرانیی دوا دەخات.

## پێشنیار:

لەبەر ڕۆشنایی ئەم سێ بەڵگەیەدا، پێویستە کابینەی نوێی حکومەت هەرێم، بوارێکی تەواو ئازاد و کراوە بە سیستەمی پەروەردە بدات و بودجەی تەواوی بۆ تەرخان بکات.. لە سیستەمێکی تەقلیدی و داخراوەوە بیکاتە سیستەمێکی کراوە، کە تیایدا تاکەکەس نەک هەر لە ڕووی تیۆرییەوە فێر بکرێت، بەڵکو لە ڕووی پیشەیشەوە کارامەییەکەی ئاشکرا بکرێت. پێویستە ئەم سیستەمە بگاتە ئاستێکی پێویستیی ئەوتۆ، کە پەروەردە و فێرکردن، کلیلی

بەستنەوەی ئێمە و نەوەکانی ئێستا بە داهاتووەوە بن. لەبەر ئەوە پێویستە، خوێندن، فێربوون و زانین، ببنە مافێکی هەر کەسێک، لە هەر تەمەن و بە هەر پێشینەیەکەوە. لێگەڕێن ئەم خەڵک و میللەتە فێربێت، بزانێت و شارەزابێت، بە توانا مرۆییە داهێنەرەکانی خۆی. لێگەڕێن توانای داهێنان ببێتە سەرمەشقی هەر بوارێکی پەروەردەیی. پێویستە ئەو ئەقڵییەتە تێکبشکێنرێ کە بەهۆکاری مادیی، یان کولتووری و ئادیۆلۆژی و ئایینی، تەمەن و ڕەگەز و تەنانەت پرۆفێشناڵیزم و بەهۆی فرۆشتنەوەی ئەزموونە فاشیلەکانی خۆیانەوە، ڕێگریی لەبەردەم پەروەردەبوونی ڕۆحیانە و پیشەییانە و دانایانەی خەڵک و هاوڵاتیاندا دەکەن. چ خۆشە کە میللەتێک بیەوێ فێربێت و لە خوێندن و زانین بەردەوام بێت و بەردەوام بیرمانخاتەوە: کە ئەو بە مافی سرووشتی و خودایی و یاسایی خۆی دەزانێت، ببێتە بکەرێکی دانا. تکایە با ئەم کابینەیە، بیرێکی جیدیی و بوێرانە لە پەروەردەی هاووڵاتیان بکاتەوە، کارئاسانیان بۆ بکرێ و ڕێگرەکان تێکبشکێنرێن. چونکە ئەمە کلیلی ناتوندوتیژی و ئاشتیمان دەداتێ، لە جیهانێکدا کە پڕە لە شەڕانیەت و توندوتیژی.

٢٠١٢

# ئاسایشی پەروەردەیی

لێرە بەدواوە، لە دامەزراوە زانستی و پەروەردەییەکانی وڵاتەکەماندا، بەرەو تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی قوتابیانی خوێندکار دەچین. بۆ ئەوەی کەشێکی کولتووریی و کۆمەڵایەتی و ئیداریی باشمان بۆ نەوەی داهاتوو ڕەخساندبێت، پێویستە هەموو لایەک پشتگیریی یەکتر بکەین بۆ ئەوەی ئەو کەشە بۆ قوتابیانی خوێندکاری وڵاتەکەمان دروستبکەین. دەتوانین هەر یەکە لەلای خۆمانەوە ئەم مانگەی لەبەردەمماندایە بکەینە مانگی نەوەی داهاتوو، تا بە پرۆسەیەکی هەڵسەنگاندنی سەرکەوتوودا ڕابوورن و کەمێک قورساییان لەسەر کەمبێتەوە. من بەش بە حاڵی خۆم بانگهێشتن لە هەمووان دەکەم بۆ بەشداربوون لەم کارە و لەم خاڵانەدا بانگەوازەکەم کورت دەکەمەوە:

١.سەرۆکایەتیی حکومەتی هەرێم بە فەرمی ئەم مەسەلەیە ڕابگەیەنێت و داوا لە هەموو لایەک بکات بۆ هاوکاریی کردنی مەعنەوی ئەو نەوەیەی لەو ماوەیەدا پێویستی بە ئاسایشی پەروەردەیی و زانستیی خۆی هەیە. داواکارییەکەی سەرۆکایەتی حکومەت بە پلەی یەکەم وەزارەتی پەروەدە و خوێندنی باڵا بگرێتەوە، بەڵام هەر

یەک لە دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایشی هەرێم ئەم ماوەیە بە گرنگییەوە لەبەر چاو بگرن و ئەندامانی خۆیان ئاگادار بکەنەوە، کە بەشدار بن لە پرۆسەکەدا. ئەمە جگە لەوەی پۆلیسی ئەرککێشی هاتووچۆ ئاسانکاریی زیاتر لە کەمکردنەوەی شڵووقیی ئەو شەقامانەی دامەزراوە پەروەردەیی و زانستیەکانان لەسەرە، بکات. لە هەمان کاتیشدا داوا بێت لە ڕاگەیاندنەکان و تەلەفزیۆنەکان تا بەرنامە و ڕیپۆرتاژی زانستیی و ڕێنماییکەرانە ئامادە بکەن سەبارەت بە چۆنێتی بارودۆخی ئەو نەوەیە لە ماڵ و دامەزراوە پەروەردەیی و زانستیەکاندا. هەروەها گرنگیشە حکومەت کەرتی تایبەت و کۆمپانیاکانی مۆبایل و پەیوەندیکردن بەرپرسیار بکات بە ئاسانکاریی و ناردنی نامەی پەروەردەیی و دەروونی بۆ بەکاربەرانیان و داوای پشتگیریی مادیی کەرتی تایبەت بۆ دابینکردنی هۆیەکانی گواستنەوە و پزیشک و بۆ قوتابیانی خوێندکار لەو شوێنانەی کە پێویستن.

٢.ڕاسپاردنی وەزارەتەکانی پەروەردە و خوێندنی باڵا بە قەدەخەکردنی جۆرەکانی توندوتیژیی کردەیی و ڕەمزی لە هەموو فەرمانگە و دامەزراوەکانیاندا بۆ ئەوەی ئاسایشی پەروەردەیی تەئمین بکرێت.

٣. لەو ڕوانگەیەوە کە فێربوون و بەدەستهێنانی زانست جۆرێکە لە عیبادەت، سەرۆکی حکومەت پێویستە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی و یەکێتی زانایانی بەڕێز ڕاسپێرێت بۆ بەشداریکردنیان لەم پرۆسەی ئاساییشی پەروەردەییدا، کە خەیری گشتیی تێدایە و بەو ئامراز و ڕێوشوێنانەی کە بۆخۆیان بە باشی دەزانن لەمبارەیەوە. بۆ نمونە لە ڕێگەی مامۆستایانی بەڕێزی وتاربێژەوە بەوەی کە بۆ دایکان و باوکانی ڕوونبکەنەوە، چەندە گرنگە ڕێز لە شعوری قوتابیانی خوێندکار بگیرێت و کات و هێمنیی تەواویان لە چوارچێوەی خێزاندا بۆ برەخسێنرێت تا سەرقاڵی خوێندنەکەیان بن و هاوکاریان بن لە کەمکردنەوەی میوانداریی و تێوەگلاندنیان لە بۆنە کۆمەڵایەتیەکاندا.

٤.مامۆستایانی پەروەردەکار و پسپۆڕانی دەروونزانی و دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و یەکێتیەکانی خانمان لایەنی تری لەو جۆرە، ۆرکشۆپی خێرا بۆ ئەندامانیان بکەنەوە، لە پێناو گەڵاڵەکردنی ڕای گشتی بۆ وەها ماوەیەک تا تێگەیشتنێکی

کۆمەڵایەتیانەی فراوانتر لە لای سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگاکەمان چێ ببێت.

٥.پێویستە قوتابیانی خوێندکاریش بە پشتبەخۆبەستن و متمانەی تەواوەوە بەشداریی لە هەڵسەنگاندنەکاندا بکەن و خۆیان لە شتی لاوەکیی و کاتبەسەربردن و شێوازی لادەرانە بەدوور بگرن و بۆ هەموو لایەکی بسەلمێنن کە ئەوان شایانی ئەوەن ببنە سەرکردەی دوارۆژ لە بواری خۆیاندا.

# خۆشەویستیی و قوتابخانە:
# مامۆستا وەک مەعشووق، قوتابی وەک عاشق!

## پێشەکیی و پرسیار و میتۆد:

پێشینەی خوێندەواری لە کوردستاندا، پێشینەیەکی ئاینیانەی هەیە و لە خانەقا و حوجرەی مزگەوتەکانەوە، دەستپێدەکات. حوجرە ئەو یەکەم شوێنیە کە دەتوانین تیایدا فۆرمێک لە خۆشەویستی نێوان مامۆستا و فەقێ، یان مەلا و سوختە بدۆزینەوە. ئەمەش لەکاتێکدا سیستەمی حوجرە وەک هەر دامەزراوەیەکی فێرکاریی دیکە، بەدەر نەبووە لە سزا و لێپرسینەوە، بەڵام هەرگیز سزا و لێپرسینەوە، وەک پراکتیکێکی ڕۆژانە، نەبۆتە هۆکاری سڕینەوەی ئەو ڕەهەندە جەوهەرییەی لە پەیوەندیی نیوان مامۆستا و فەقێدا هەبووە و لەسەر بنەمای خۆشەویستییەکی بێوێنەوە دروستبووە کە تیایدا فەقێی دەکردە عاشق و مەلا بە مەعشووق، ئەو بە خوازیار و ئەویان بە بەخشندە و ڕێنماییکەر.. لە دەروونیی هەر کەسێکیدا کە لە حوجرەدا

خوێندبێتی زنجیرەیەک لەم یادگاری و بیرەوەریانە هەن، کە ڕاستیی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن..[1]

***ئایا لە ئێستادا ئەم پەیوەندییە هەمان بنەما و ڕەهەندیی جەوهەریانەی خۆی پاراستووە، یان شوێنی خۆی چۆلکردووە بۆ پەیوەندییەکی بەرژەوەندگەرایانە و توندوتیژاویی؟!***

نازانم، بەڵام پرسیاری سەرەکیی من لەم وتارەدا ئەوەیە، ***ئایا فۆرمی دووەمی سیستەمی خوێندەواری لە کوردستاندا کە فۆرمێکە لە چوارچێوەی دامەزراوەی قوتابخانەدا، ئەم پەیوەندییە عاشق و مەعشوقانەیەی پاراست، یان بەتەواوی لەبیریی کرد؟***[2]

لێرە بە دواوە، هاوکات بە گەڕان بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارەدا، دەمەوێ باس لە گرنگیی ئەم پەیوەندییە جەوهەریی و عاشقانەیەی نێوان مامۆستا و قوتابیی و

---

[1] لە کتێبی (ڕشتەی مرواریی) مامۆستا عەلائەدین سەجادی، کتێبی (ژیانیی فەقێیایەتی) و مەلا عەلیاوەیی و چەندین سەرچاوەیتردا نمونەمان بۆ ئەم بۆچوونە چنگ دەکەوێت.

[2] بەپێی سەرچاوەکان سەرەتای ئەم گۆرانکارییە لە خوێندنی تەقلیدیی (خانەقا و حوجرەکان)ەوە بۆ خوێندنی قوتابخانەیی، لە ساڵی ١٨٩٣ بە کردنەوەی قوتابخانەی (ڕوشدیەی ئەهلی و ڕوشدییەی عەسکەری) لە شاری سلێمانی و لەلایەن (سەعید پاشای خەندان)ەوە دەستپێدەکات. بڕوانە: - غازی حەسەن: **خوێندەواری: ڕێگەیەکی سەخت و درێژ لە کوردستاندا**. هەولێر: دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم: ٢٠٠٨، ل: ٧-٨).

قوتابخانە و مرۆڤ بکەم وەک ڕێگایەک بۆ بچووککردنەوەی توندوتیژیی قوتابخانەیی و وەک شێوازێک بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی توندوتیژی لە ئاستە ڕەمزیی و کردەییەکەیدا.

## میتۆد:

میتۆدیی من بۆ بیرکردنەوە لەوەها بابەتێک، بریتیە لە میتۆدێکی پەروەردەیی کەتیایدا منداڵ وەک مرۆڤێکی تەواو و کامڵ، لە ڕووی هەستەکیی و ئەقڵییەوە دەناسرێت. ئەم میتۆدە وەک لە (پیاژێ)[٢]وە فیربووین، دەروازەیەکی داناییناسیانەمان لەسەر سایکۆلۆژیای منداڵ بۆ دەکاتەوە. بێجگە لە ڕەهەندە ڕەخنەگرانەکەی، ئەم میتۆدە لەبەرامبەر دیدگا کۆنەکاندا بۆ تەماشاکردنی منداڵ وەک بونەوەری (کەم ئەقڵ و بێ ئەقڵ)، هاوکاتە بە مرۆڤناسییەکی فەلسەفیی کە تیایدا مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی بە جەوهەر باش، تەماشای دەکرێت کە تواناییەکی بەرزی هەیە لە خۆئامادەکردن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی توندوتییژی و

---

[٢] بۆ باشتر تێگەیشتن لە بنەما تیۆرییەکانی ئەم ڕوانگە میتۆدیە، بڕوانە:

- جان بیاجی: التوجهات الجدیدە للتربیە. ت: محمد الحبیب بلکوش. سلسلە المعالم، دار توبقال للنشر، المغرب، ١٩٨٨

- ژان پیاژه باربیل انهلدر: روانشناسی کودک. ت: دکتر زینت توفیق، تهران: نشر نی، چ: هشتم، ٢٠٠٤.

خراپییەکان، چونکە مرۆڤ بە جەوهەر بۆ ئەوە دروستبووە کە بە ئامانجی خۆی بگات و توندوتیژییش دژی سرووشتیی مرۆییانەیە. ئەریستۆتالیس وەک دامەزرێنەری ئەم جۆرە مرۆڤناسییە فەلسەفییە، لەو بروایەدا بووە: پێشمەرجیی هاوڵاتییەکی باش ئەوەیە مرۆڤێکی باش بێت. بەڵام پێشمەرجی ئەوەی مرۆڤ باش بێت، بریتیە لەو (***پەروەردە و ڕەفتارەباشانەی دەتوانن بیکەنە هاوشارییەکی نیەتباش***)[٤].

بەپێی ئەم تێڕوانینە بۆ مرۆڤ، شوێن و دامەزراوەکان و کۆمەڵگا بەگشتی کاریگەریی تەواویان هەیە لە ئاراستەکردنی مرۆڤدا بەرەو مەبەست و ئامانجیی بوونی خۆی و دامەزراندنی ژیانێک هاوتەریب بێت بە سرووشتە باش و جەوهەریانەکەی خۆی. من لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەم تێڕوانینە بەکار دەهێنم و قوتابخانە وەک شوێنێک کە تیایدا پەیوەندیی دەسەڵاتمەندانە و توندوتیژانە بەرهەمدێن و دەپووکێنەوە، دەکەمە کایەی توێژینەوە و بەتایبەتیش قسە لەسەر پەیوەندیی (ئەڤین/ڕقئامێزی) نێوان مامۆستا و قوتابیی دەکەم.

---

[٤] ارسطو: سیاست، ت: د. حمید عنایت، تهران: شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، چ: ششم، : ١٢٨٧أ، ١٢٨٨ب، ص: ١٩٩، ٢٠٠٧.

## توندوتیژیی قوتابخانەیی:

زاراوەی توندوتیژیی قوتابخانەیی لە بواری هزری پەروەردەیی و توێژینەوەکانی توندوتیژیدا، زاراوەیەکی کارپێکراوی ناسراوە و زیاد لە پێناسەیەکی بۆ دەکرێ و لە کەنار زاراوەکانی توندوتیژیی خێزانی، توندوتیژیی سیاسیی و توندوتیژیی کردەیی و سیمبوولی[٥] و هتد.. بەکار دەهێنرێت.

گرنگترین خەسڵەتی ئەم جۆرەی توندوتیژیی ئەوەیە کە بەرهەمهێنەرەکەی قوتابخانە و ئەو فۆرمی پەیوەندییەیە کە لەو دامەزراوەیەدا لە نێوان (*شوێن و مرۆڤ*)، نێوان (*مرۆڤ و مرۆڤەکان*) و لە نێوان (*مرۆڤ و ڕێنماییە پەروەردەییەکان*)دا لە هاتوچۆدایە. من بە کورتیی باسی هەرکامێکیان دەکەم و تێگەیشتنی خۆم نەک لەسەر بنەمای تیۆرەیەکی تایبەت، بەڵکو لەسەر بنەما و بیرکردنەوەو ئەزموونکردن و چاودێریکردنی دامەزراوەی قوتابخانە لە هەرێمدا، هەروەها لەسەر ئەم بنەمایەشەوە کە من بۆخۆم باوکم و منداڵم هەیە دەچێتە قوتابخانە و پەیوەندیی ڕۆژانەم لەگەڵ قوتابخانەکان هەیە، دادەڕێژم.

---

[٥] بییر بوردیو: العنف الرمزی: بحث فی أصول علم الاجتماع التربوی. ت: نظیر جاهل، بیروت: المرکز الثقافی العربی. ١٩٩٤

## پەیوەندیی شوێن و مرۆڤ:

شوێن لە بواری پەروەردەدا گرنگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە فێرگە و قوتابخانەکان نەک هەر تەنیا جێگرەوەیەکی باشتری شوێنە کۆمەڵایەتیەکانن (وەک ماڵ و شوێنی بێ سەپەرستان و خانەی داڵدەدان و هتد)، بۆ منداڵان، بەڵکو شوێنێکی (بیرلێکراوە) و (بەرهەمهاتوو)، یان (دەستکرد)یشن و واچاوەڕواندەکرێت تیایاندا ڕەچاوی وەدیهێنانی ئەو بارودۆخە دەروونی و جەستەییانە بۆ منداڵان کرابێ، کە تیایدا بە باشترین شێوە دەتوانن فێر ببن و گەشە بکەن[٦]. بەمجۆرەش، پێویستە لە تەلارسازیی فێرگەکاندا بەر لە هەر شتێک بیر لە دروستکردنی ژینگەیەک بۆ منداڵان بکرێتەوە و لەو ڕوانگەیەوە کەشێک دروستبکرێ، کە تەواو جیاواز بێت لە ژینگەی کۆمەڵایەتیی و خێزانی. ئەمەش لەبەر ئەوەی شوێن پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە دروستکردنی شوناسەوە هەیە و فێرگەش یەکەمین شوێنی گرنگە کە تاکەکەس تیایدا هاوکات بە ناسینی خۆی، دەکەوێتە دروستکردنی شوناسی تایبەت بە کەسایەتیی خۆیشی.

---

[٦] مەجید کاکەوەیسی: **باسێک لەبنەمای پەروەردە و فێرکردن و کۆمەڵگەی پێشکەوتوو**. هەولێر: دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، بەشی دووەم، ل: ٣١-٣٥، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

هەرچەندە قوتابخانە وەک شوێنێک بۆ فێربوون بەدەر نیە لە سزا و کۆنترۆڵ، بەڵام بە بەراوورد بە ماڵ، یان فەزای خێزان و گووشاری داب و نەرێت و نۆرمە خێزانیی و کۆمەڵایەتیەکان بۆ سەر تاکەکەس، ئەوە قوتابخانە فەزایەکی ئازادانەترە بۆ گەشەی سۆژە و هەستکردن بە خودیی خۆی لە کەشێکی لێبووردوانەتر و لەدەرەوەی کۆنترۆڵیی کۆمەڵایەتی.[7] بەمجۆرەش دەتوانرێ لە بنەماکانی نەخشەکێشان و دیزایینی تەلارسازیی فێرگەکانەوە بیر لە ئامادەکاریی بۆ بەرەنگابوونەوەی توندوتیژیی قوتابخانەیی بکرێتەوە و مانایەکی تایبەت بدرێتە شوێن کە هاوسەنگ بێت لەگەڵ (باشە)ی جەوهەریانەی مرۆڤ[8].

بەپێی ئەم تێگەیشتنەی من، شوێن کە لێرەدا مەبەستمان قوتابخانەیە، جگە لەو بەشەی کە منداڵ لە ڕێگادایە بەرەو قوتابخانە: (شەقام، کۆڵان، دوکانەکانی سەرڕێ، شوێنی پەڕینەوە)، ئەوە چەمکیی شوێن لە قوتابخانەدا ئەم شتانە

---

[7] لەبارەی شوێن و سۆژەی تاکەکەسی و پەیوەندیی بە ئازادیی و لێبووردەییەوە، بڕوانە:

- ڕێبوار سیوەیلی: *(قەیرانی هووشیاریی لێبووردەیی)*، لە: ڕێبوار س. هیواحاجی، نەوزاد جەمال: **لێبووردەیی و فەلسەفە**. پرۆژەی فەلسەفە، زنجیرە:٢، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چ: یەکەم: ٢٠٠٩، ل: ١١٦ و بەرەودوا.

[8] لەبارەی شوێن و مانا و بەرجەستەکردنی مانا لە تەلارسازیدا، بڕوانە:

- کریستیان نوربرگ- شولتز: **گزینەای از معماری: معنا و مکان**. ت: ویدا نوروز برازجانی، تهران: نشر جان جهان، ٢٠٠٣.

دەگرێتەوە: (دیواریی قوتابخانە، دەرگای چوونەژوورەوە، حەوشە و یاریگا، دیواری ناوەوە و ڕاڕەوەکان، فرۆشگا و کافتریا، ژووری ئیدارە و تەنانەت تەوالێت و دەستشۆرییەکانیش). هەر یەک لەم شوێنانە بۆیان هەیە لە یەک کاتدا ترسڕەوێن و بۆشیان هەیە هەڵگری جۆرەها شێوەی توندوتیژیی بن و ترس بەرهەمبهێنن. هەر یەکە لەم بەشانەی شوێن کە پێکهێنەری بینای قوتابخانەن، بۆیان هەیە خۆیان پراکتیزەی فۆرمێکی توندوتیژیی لەسەر دەروونی منداڵ بکەن، یان بکرێنە شوێنی توندوتیژی و پەیوەندیی توندوتیژانەی جەستەیی و ڕەمزییان تێدا بەرهەم بێت.. بۆ نمونە: دیواری چۆڵ و بێ نیگار و ڕەنگ، بەتایبەتی ڕاڕەوەکان، جگە لە بەرزییەکەیان و دەنگدانەوەکەیان، بیری منداڵ بەلای تەنیایی و چۆڵەوانیدا ڕادەکێشن و ئەمەش بەرهەمهێنەری ترسی دەروونیە[٩].

شێواز و هەڵکەوتەی جوگرافیی تەوالێت لە قوتابخانەدا بۆ منداڵان گرنگیی خۆی هەیە و تەوالێت و دەستشۆری، یان شوێنی تەندروستیی بەگشتی، لەگەڵ ئەو لۆگۆ و هێما و

---

[٩] لە بارەی ژیانی منداڵ لە سەردەمی چوونە قوتابخانە و ئەو گۆڕانکاریی و کاریگەرییە دەروونیی و ڕەفتارییانەی لەناو فێرگەدا پێیاندا تێپەڕ دەبێت، بڕوانە:
- الیسون جیمز، کریس جنکس، الن پروت: **جامعەسناسی دوران کودکی**: نظریە پردازی دربارەی دوران کودکی. ت: علیرضا کرمانی، علیرضا ابراهیم أبادی. نشر ثالث، چ: أول، ٢٠٠٤، ص: ١٠٢-١١٦

ڕێنماییانەی لەو شوێنانەدا بەکار دەهێنرێن و مانای شوێن بۆ منداڵ ڕووندەکەنەوە، ئەو بێدەنگیی و بۆن و ڕەنگ و ڕووناکاییەی لەوێدا باڵادەستن و هەستی ناسکی منداڵ داگیر دەکەن، چۆڵیی ئەو شوێنانە و نەبوونی سەرپەرشتیار و ڕێنماییکەر، کە متمانە بە منداڵ ببەخشێت، هەموویان کاریگەریی گرنگیان هەیە لە بەستنەوەی منداڵ بە قوتابخانە و خوێندنەوە لەلایەکەوە و لە بەرهەمهێنان و ڕەواندنەوەی شێوەکانی توندوتیژیدا، لەلاکەی ترەوە. ئەمەش بە ئەندازەیەک کە جاری وا هەیە گرنگیی تەوالیتەکان و ڕازاندنەوەیان بە هەموو ئەو ئامرازانەی ئاسوودەیی و خەمڕەوێنی دروستدەکەن و ترس لە دەروونیی منداڵدا دەکوژن، لە گرنگیی ناو پۆل و ڕاڕەوەکان کەمتر نییە و لە بەرهەمهێنانەوە و کەمکردنەوەی توندوتیژی قوتابخانەییدا پێگەی تایبەتیان هەیە.

تەوالێتی تاریک، پیس و بۆگەن، یان خز و لووس، یاخود لاچەپەک و بەرتەسک و بەرز، منداڵ تێکەڵ بە دۆخێکی ناخۆش دەکەن و ئەمەش وا دەکات لەو تەمەنە کەمەدا دووچاری ئەزموونێکی نەویستراوی کولتووریی ببێت، کە لە پەلەپەلیان بۆی هەیە، میز و پیسایی بەخۆیدا بکات، یان فریا نەکەوێت جلەکانی لەبەر بکاتەوە و زنجیرەکەی ببەستێتەوە و لە ئەنجامیشدا ببێتە مایەی پێکەنین لەلایەن

هاوڕێکانییەوە. منداڵ ئەم ئەزموونە لە چوارچێوەی ترسێکی ناخەکی لە چوونە تەوالێت، لە خۆخاڵیکردنەوە، لە چوارچێوەی تووڕەیی، یان بێدەنگییەکی ئازاراوییدا ئەزموون دەکات، چونکە هەست ئەکات بە باسکردنی تەریق دەکرێتەوە، یان بە ترسنۆک لە قەڵەم دەدرێت..

ڕەچاونەکردنی تەلارسازیانە و ئیستاتیکیانەی چۆنێتی تەوالێتەکان و لەبیرکردنی گرنگییان بۆ زەیینییەتی منداڵ و کاریگەرییان لەسەر بیرکردنەوەو ڕەفتارەکانی، گشتیان بۆیان هەیە وەک فۆرمێکی توندوتیژیی قوتابخانەیی دەر بکەون، کە پەیوەندییان بە شوێن و ئەزموونە سەرەتاییەکانی منداڵەوە هەیە.

ئەوە ئەرکی حکومەتە کە قورسترین مەرجی لەسەر تەلارسازیی قوتابخانەیی و شوێنە پێکهێنەرەکانی دابنێت، بۆ ئەوەی منداڵانمان ئەزموونێکی تری چوونە قوتابخانەیان تەی بکردایە، کە تیایدا هەستیان بە متمانە بکردایە و شوێن نەبوایەتە سەرچاوەی ترس.. من خەون بە قوتابخانەیەکەوە دەبینم، کە مۆزەخانەی بچووک، باخچەی ئاژەڵانی بچووکی تێدا بووایە و تەوالێتەکانی هێندەی پۆلەکان گرنگییان پێبدرایە..

## پەیوەندیی مرۆڤ و مرۆڤ:

دوای دابینکردنی شوێنی شیاو و ترسڕەوێن بۆ منداڵ وەک لایەنی هەرە گرنگیی پەیوەندیی مرۆڤ بە مرۆڤەوە لە قوتابخانەدا، لایەنیی هەرە گرنگتر لەو پەیوەندیەدا کە بۆی هەیە توندوتیژیی و ترس لە دەروونی منداڵدا کەم بکاتەوە، یان بەسەریدا زاڵ بێت، یاخود لە خراپترین حاڵەتدا بەرهەمی بهێنێتەوە، بریتین لە مامۆستاکان، کە لە درێژەی وتارەکەدا زیاتر لەبارەیەوە قسان دەکەم. لەگەڵ ئەوەشدا کەسانیتریش، وەک پاککەرەوەکان (فەڕاش)، پاسەوانەکان، چاودێرەکان، بەڕێوەبەر و جێگرەکانی و فرۆشیارەکانی حانووت و کافتریا و تەنانەت پشکنەر و سەرپەرشتیاران و میوانەکانیش کە بەشێوەیەکی کاتیی هاتووچۆی قوتابخانە دەکەن، لە بەرهەمهێنانەوە و بەگژداچوونەوەی توندوتیژیی قوتابخانەیی کاریگەریی بەرچاویان هەیە.

پەیوەندیی مرۆڤ و مرۆڤ لە قوتابخانەدا، گرنگیی تایبەت بە خۆی هەیە، چونکە لایەنی یەکەم، کە منداڵە قوتابییەکانن، لەسەر ئاستی دەروونیی و پراکتیکی چاوەڕوانییەکی زۆر لەسەر بینینی مامۆستاکان و شێواز و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خۆیان، کەڵەکە دەکەن و ڕۆژانە بەدوای ئەو خۆراکە دەروونیی و ڕۆحییەدا دەگەڕێن کە چاوەڕوانیەکانیان تێر دەکات. بەپێی ئەم وێناکردنە پێشینەیەی منداڵە قوتابییەکان،

مامۆستا دەکەوێتە سەنتەرەوە و پێگەیەکی نمونەیی و فریشتەئاسا وەردەگرێت و ئەمەش دەسەڵاتێکی مەعنەویی زۆری بۆ دروستدەکات، بە ئەندازەیەک کە قسەی مامۆستا و هەڵسوکەوتەکانی بەزوویی دەبنە پێشنموونەی قوتابیی لە دەرەوەی قوتابخانەش.

لێرەوە، ڕۆڵی ناتوندوتیژانەی مامۆستا، ئارامیی، گوێگرتنی، تێگەیشتنی، هاودەردیکردنەکانی، ڕێز و ویژدانی، دیسیپلینەکانی، فەرمانەکانی، چۆنێتی بەڕێوەبەرایەتیەکەی، شێوازی گفتوگۆ و چەسپاندنی بەڵگەکانی و تەنانەت جلوبەرگی، بۆنی، ڕۆیشتنی، شێوازی نیگای، قسەی، پێکەنینی، ڕامانی و هتد، بۆ قوتابییە منداڵەکان دەبنە مۆدیلی باڵا و شیاوی لاساییکردنەوە. ئەمەش ئەوە ئاشکرا دەکات، کە پەیوەندیی مامۆستا بە قوتابییەوە، نەک هەر دەستنیشانیی پەیوەندیی قوتابیی بە وانەکانیەوە، بەڵکو بە قوتابخانە و هاوڕێ و کەسانیتریشەوە لە ناوەوە و دەرەوەی دامەزراوەکەوە، دەکات[١٠].

---

[١٠] سەبارەت بە ڕۆڵ و کاریگەریی مامۆستا و کاریگەرییەکانی لەسەر قوتابیی بە گشتیی، تەماشاکردنی ئەم کتێبە کارێکی پێویستە: جەیمز ئێچ. سترۆنگ: **ویژگی های معلم مؤثر**. ترجمە و تألیف: خیریەبیگم حائری زادە و لیلی م. حسین. مجموعە اموزش مؤسر١، تهران: قطرە، ٢٠٠٧.

مامۆستا دەتوانێ بە کەمترین ئاستی وزە، کەمترین کات و باشترین دەستکەوتەوە پەیوەندیی خۆی لەگەڵ قوتابییەکان دابمەزرێنێ، ئەویش بە خۆ بەدوورگرتن لە ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی توندوتیژیی سیمبوولی و پراکتیکی و جۆرەکانی توندوتیژیی فیزییکی و مەعنەوی: (تووڕەیی، هاوارکردن، هەڕەشە، گوێنەگرتن، مۆڕەکردن، داربەدەستەوە گرتن، بە مێز و کورسیداکێشان و هتد.). لە ئەنجامی ئەمەشەوە لە قوتابییەکان یەک تیمی یەکگرتوو دروستبکات و ئاراستەیان بکات بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە گشتیی و تایبەتیانەی لە ناوە و دەرەوەی قوتابخانە دەکەوێتە سەرشانیان. بەبێ دۆزینەوەی ئەم خاڵە بەهێزە لە کەسایەتی مامۆستادا، ئەو ناکاتە بابەتی خۆشویستن و قوتابیە منداڵەکان بە دەیان و بگرە سەدان جۆری تەکنیک کە لە (دەروونگرووپەوە)[11] فێری دەبن، دەتوانن نافەرمانیی بکەن و گووشار بخەنە سەر کەشیی ناوپۆل.

---

[11] دەروونگرووپەکان ئەو گرووپە کاتیانەن کە قوتابیەکان لە پەرچەکردار بەرامبەر هەڵوێستەکانی مامۆستا لە ئاست خۆیاندا دروستیان دەکەن و یەکدەنگی و یەک هەڵوێستی کە زۆر جار لە ناڕێکی، دەنگە دەنگ، گوێڕایەڵی نەکردن، تەقەتەق، جیڕەی کورسی و دەیان پەرچەکرداری تردا خۆیان دەبیننەوە، دروست دەبن. بۆیە ئەم گرووپانە بە (گرووپی کاتی) ناو دەبەم، چونکە لە هەمان کاتدا کە ئەندامەکانی لەگەڵ مامۆستایەک کێشەیان هەیە، لەناو خۆشیاندا ناکۆکن و ئەمەش وا دەکات کە تەمەنی گرووپەکەیان کورت بێت.

ئەم تەکنیکە دەروونگرووپیانە نەک لە قوتابخانەی بنەڕەتیدا، بەڵکو لە زانکۆشدا بەردەوامیی وەردەگرن و بەشێوەی جیاواز خۆیان دەردەبڕن، وەک: (کۆکەکۆک، قڵخ و هووڕ، جەڕەسی مۆبایل، کورسیی ڕاکێشان، کاغەزگۆڕینەوە، هەوڵدان بۆ قسەکردن وقۆشمەیی و هتد)، کە هەموویان نیشانەکانی توندوتیژیی قوتابخانەییان پێوەدیارە و ئاشکرای دەکات کە لە قۆناغی بنەڕەتیدا پەیوەندیی قوتابیی و مامۆستا نەچۆتە ئاستێکی خۆشەویستییەوە.

لەبەر ئەوە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە ئامادەکردنی کەسایەتیی مامۆستای سەرکەوتوو، یان دیموکراتیکەوە دەستپێدەکات و هەر ئەویش دەتوانێ بە ڕێژەیەکی زۆر لە سەرکەوتن و ئامانجی خۆی نزیکی بخاتەوە. کەسایەتی دیموکراتیکیانەی مامۆستا جگە لەو کاریگەرییە دەروونیی و شێوازیانەی کە دەیانکاتە سەر کەسایەتی قوتابی، جگە لە گرتنە بەری ڕێگای ژیرانە و ناتوندتیژانە لە بەڕێکردنی کار و پێکەوەبوونە ڕۆژانەییەکانیدا، ئەوە لە چەند ئەرکێکدا بەرجەستە دەبێت، کە پێویستە مامۆستا بیانگرێتە بەر، لەوانەش:

- دوورکەوتنەوەی لە شێوازەکانی توندوتیژی و بالادەستیی لە وتنەوەی وانەکاندا،

- هاندانی قوتابیەکان بۆ هەڵبژاردنی ئەو چالاکیانەی کە ئەرکی سەرشانیانە.
- هاندانی کاری پێکەوەیی و گرووپی.
- بەشداریی مامۆستا لە هەموو قۆناغەکانی چالاکییە پەروەردەیی و زانستیەکاندا،
- گوێگرتن، گفتوگۆکردن و ڕوونکردنەوەی ئەو بیرۆکانەی لەلایەن قوتابیەکانەوە دەردەبڕدرێن.
- هاندانی قوتابیەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشانەی دێنە سەرڕێیان و پشتگیریی کردنیان لە دۆزینەوەی ڕێگاچارەی ژیرانە و زانستیانە و خۆ بەدوورگرتن لە پشتگوێخستن و چارەسەری ئامادەکراوی پێشوەخت[١٢].

## مرۆڤ و ڕێنماییە پەروەردەییەکان:

بەبێ ئەو ئاستە خۆشەویستییەی کە جەوهەری پەیوەندیی قوتابیی و مامۆستا دیاریی دەکات و پەیوەندییەکە لە فۆرمەکانی توندوتیژیی دوور دەخاتەوە، ڕێنماییە پەروەردەییەکان نە لەکاتی خۆیاندا و نە وەک خۆیان جێبەجێی ناکرێن. توندوتیژیی پراکتیکیانە و ڕەمزییانەی

---

[١٢] عبدالله محمد الشیخ: (*الدیمقراطیه و المعلم*) له : **الدیمقراطیه و التربیه فی الوطن العربی**. مرکز دراسات الوحده العربیه& جامعه کویت. بیروت، ٢٠٠١، ص: ٢٩٦-٢٩٧

نێوان مامۆستا و قوتابی، دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ڕێنماییە پەروەدەیی و لەوێشەوە پێگەیشتنە ئاکارییەکانی قوتابیدا. بۆیە ڕێگای سەرکەوتنی ڕێنماییە پەروەدەیی و زانستییەکان، نە تەییارکردنی تەکنەلۆژیانەیە، نە دیسپلین و سزایە، نە نمرە و نەهاتنە (غیابات)، بەڵکو پەیوەندیی مرۆییانە و ناتوندوتیژانەی مامۆستا و قوتابییە، کە بۆخۆی هەم پەروەدەکەرانەیە و هەم پێگەیەنەرانەیە[١٢].

هیچ شتێک یان شێوازێک نابێتە جێگرەوەی پەیوەندییە مرۆییەکان و بە تایبەتیش پەیوەندییە ئەڤیندارانەکەی نێوان قوتابیی و مامۆستا. بۆیە سەرکەوتنی پەروەردەیی و جێبەجێکردنی ڕێنماییەکان، نەخشەکان، ئاراستەکردنەکان و دیسیپلینەکان، بە کەناڵی مامۆستا وێناکراوەکان و قارەمانانی ناو هزری قوتابیاندا تێپەڕ دەبێت. ئەمەش بەو جۆرەی کە ڕێژەی سەرکەوتنی پەروەردەییانە و زانستیانە و فێرکاریانەی هەر دامەزراوەیەکی وەک قوتابخانە، بە ئاستی مامۆستا و فێرکارەکانییەوە بەندە کاتێ ئەمانە زۆرترین لێکچوون لە نێوان (خۆیان) لە ژیانی کردەیی

---

[١٢] بۆ هوشیارییەکی باشتر سەبارەت بە ئامادەیی فۆرمەکانی توندوتیژیی لە فێرگەکان و سیستەمی پەروەردەیی هەرێمی کوردستاندا، خوێندنەوەی ئەم کتێبە گفتوگۆییەی خوارەوە بە پێویست دەزانم: – فایەق سەعید: **قوتابخانەکان ڕوویان لە قیبلە نییە**. هەولێر: دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

ڕۆژانە و (وێنای خۆیان) لە خەیاڵی قوتابیە منداڵەکادا بەرجەستە دەکەن. هەتا ئەم وێنەیەی ناو مێشک و فەنتازیای قوتابی نزیک بێت لە کەسایەتی مامۆستاوە، ڕێژەی ئەو توندوتیژیەی کە پەیوەندیەکانی دامەزراوە دەیسەپێنن، کەم دەبێتەوە.

مامۆستا جگە لە کاریگەرییە فێرکاریی و پەروەردەییەکەی، دەشتوانێ لە بەهێزکردن و هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و هەستەوەرییەکانی قوتابیاندا کاریگەریی هەبێت. بەشێوەیەکی گشتی، ئەو مامۆستایانەی کەمتر توندوتیژی بەکار دەهێنن، یان خۆیانی لێبەدوور دەگرن، گرووپێکی هۆمۆگێن و گونجاوی قوتابیان پێکدەهێنن، کە بەردەوام بەرژەوەندیی گشتی و هاوکاریی و بەرگریی کردن لە یەکتر، دەخەنە پێش هەموو شتێکیترەوە و فەزای پۆل دەبێتە کەشێکی وزە بەخش. بە پێچەوانەشەوە، ئەو مامۆستایانەی لە ئاستی ئەم پەیوەندییەدا نین و توندوتیژیی دەخەنە پێش پەیوەندیی تەندروستەوە، قوتابیەکان پەرتەوازە دەکات و گرووپی بچووکتر پێکدەهێنن لە دژ و بۆ پشتگیریی مامۆستاکەیان. بەڵام ئەمکارە بۆخۆی فەزای پۆل دەکاتە کەشێکی ترسێنەر و وزە بەفیرۆدان.

## مامۆستا وەک مەعشووق، قوتابیی عاشق:

گرنگیی ڕۆڵ و کەسایەتی مامۆستا، هەڵبژاردنی، ئامادەکردنی و دامەزراندنی و خستنیە بەردەم ئەرکەکانی، لە بنەما سەرەتایی و گرنگەکانی هەر سیستەمێکی پەروەردەیین[١٤]. خۆشەویستی و قوتابخانە دوو پانتایی ژیانن کە وادەزانین بەدوورن، یان دەمانەوێ بەدووربن لە توندوتیژی، بەڵام لە هەردووکیاندا توندوتیژی ئەگەرێکی بنەمایی و کراوەیە. هەموو خۆشەویستییەک هەڵگری بڕێ لە توندوتیژییە تەنانەت بەر لەوەی دەستپێبکات. چونکە ئەو ترسەی بکەری عاشق هەیەتی بۆ چوونە پێش و ئەو توندوتیژییە ڕەمزییەی کە لە ئەنجامی گریمانەکردن و فەنتازیاکراوی ڕەتکردنەوە (ڕەفز)ەوە دروست دەبێت، سەرەتای هەر خۆشەویستییەکە.

خۆشەویستی لە ساتەوەختەکانی یەکەمەوە هەڵگری ئەو توندوتیژیی و ترسەیە کە کەرامەت و ڕێزلەخۆگرتنی مرۆڤ دەخاتە بەردەم ڕەتکردنەوە، بۆیە هەرچەندە خۆشەویستی ئایدیالیزە بکرێ و وەک پەیوەندییەکی بەهەشتییانە وەسف بکرێ و لە واقیعی پراکتیکیشدا بەرهەمەکەی چەندە بۆ هەردوو لایەنی بەشداربوو وەدیهێنەری ئاسوودەیی و کامەرانی بێت، هێشتا ناتوانرێ

[١٤] محمد طاهر معیری: مسائل اموزش و پرورش. تهران: مؤسسه انتشارات أمیر کبیر، چ: دوازدهم: ٢٠٠١، ص: ٩٨-١٢١.

توندوتیژیی ڕەمزیی و کردەیی لە پەیوەندییەکە جودا بکرێتەوە.
هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە بکەر لە خۆشەویستیدا وێناکردنێکی پاکژانە لەسەر خۆی و بەرامبەر بەرهەمدەهێنێ کە لە حوکمی ماسک و ڕووپۆشێکی کاتیدایە و ڕۆژگارێک دێت، بکەر پێویستیی بەم ماسکە نامێنێت و دەبێتەوە بە خۆی، بەبێ سڵکردنەوە لە داپۆشینی ئەو سیفەتانەی کە لە خۆیدا هەن، بەڵام پەیوەندیی خۆشەویستی ڕێگەی نەدەدا ئاشکرایان بکات.
بەمجۆرەش، عاشقەکان هەمیشە جەبرێکیان لەسەرە کە بریتیە لە جەبری (خۆخۆشەویستکردن)، (سەرنجڕاکێشانی ئەویتر)، (هێنانە پێکەنینی) و (ڕازیکردنی).. ئەم جەبرە ناچارەکییە، بەر لەوەی پێویستیی بەرامبەر بێت تا لەو ڕێگەیەوە دەستەمۆ، یان ڕاپێچ بکرێتە ناو پەیوەندییەکەوە، خواستێکی ناوەکیی ئەڤین و ئەڤینداریی خۆیەتی . ئێمە تا ئێوارێ بە عاشقەکان بڵێین: (پێویست نیە ئەوە بکەن کە دەیکەن)، ئەوان لە پێویستییەکی دەروونی و ناخەکیی خۆیانەوە، لە پێناوی ئەو ئامانجانەدا کە ئامانجیی ئایدیالیزەکراوی ناو مێشکی خۆیانن بۆ خۆشەویستی، هەر وا دەکەن کە دەیکەن.

سیفەتی نەگۆڕی عاشق ئەوەیە، کە ئەو (*زۆر*) لە خۆی دەکات، خۆی (*ناچار*) دەکات، خۆی (*ماندوو*) دەکات، ساڵەها چاوەڕوان دەبێت، ئەوێ کێوان دەکەوێ (بەتایبەتی لە خۆشەویستی ناو چامە شیعری و حەماسیەکاندا)، خۆی دەخاتە عەزابەوە و بەردەوام (*قوربانی*)ی دەبەخشێت.. ئەمە ئەو توندوتیژییە جەوهەرییەی پەیوەندیی خۆشەویستیە، کە بەبێ ئەنجامدانیان خۆشەویستیەکە ناگاتە ئەنجام و وەک ئەڤینێکی ڕاستەقینە پێناسە ناکرێت.

لەبەر ئەوە پەیوەندیی خۆشەویستیی، چەندەی خۆشەویستی تێدایە، ئەوەندەش پێچەوانەکەی: هەموو ڕستەیەکی وەک ئەوەی کە بیسمیلای خۆشەویستیە: (خۆشم دەوێی) و پەیوەست نیە بە کات و شوێنەوە، بۆی هەیە لە کات و شوێنێکی تایبەتدا ببێتە ڕستەیەکی لەمجۆرە: (ڕقم لێتە)!

بەمجۆرەش هەرچەندە هەموو خۆشەویستییەک لە پێش زمانی گۆکردنەوە، بە ڕستەکانی (نیگا و بزە و وردبوونەوە و چاودێرێی و خەیاڵ لێکردنەوە و دیاریی و تامەزرۆیی و تەمەننا و هتد..)، دەستپێدەکات و پاشان لە شا-ڕستەی (خۆشمدەوێی) خۆی چڕ دەکاتەوە، ئەوە لە ئاستی زمانی گۆکراودا بۆی هەیە ئەم ڕستەیە هەڵگری مانا پێچەوانەکەی خۆی بێت: (**خۆشمدەوێی ئەگەر منت خۆشبوێ، بەڵام**

**ئەگەر تۆش منت خۆشنەوێ و ڕەتمبکەیتەوە، ئەوە من ڕقم لێتە و هەموو ئەوەی پێمبەخشیویت لێتی وەردەگرمەوە چونکە تۆ شایانی نیت)..**

قوتابخانە بۆ مرۆڤ هەمان مانای هەیە و پەیوەندیی تاکەکەس بە قوتابخانەوە هەمان پەیوەندیی خۆشەویستانەیە. تەنانەت ئەو منداڵانەی لە سەرەتاشەوە بە زۆر دەچن بۆ قوتابخانە، پەیوەندییەکی خۆشەویستانەیان، یان عاشقانەیان بە قوتابخانەوە هەیە.

جگەلەوەی منداڵ هەر لە قۆناغی باخچەی ساوایانەوە، دەکەوێتە بیرکردنەوەو فەنتازیا لێدان بە قوتابخانەوە و پرسیاری لەبارەوە دەکات، ئاواش لە خۆئامادەکردنێکی بەردەوامدایە بۆ چوونە قوتابخانە. قوتابخانە ڕاڕەوێکە، یان پردێکە بەشێوەیەکی ڕێکخراو منداڵێتی دەبەستێت بە دنیای گەورەبوون و سەربەخۆییەوە[15]. بۆیە منداڵ زوو لە بیری ئەوەدایە ئەم ڕاڕەوە ببڕێت و خۆی ئامادە دەکات بۆ کڕینی ئەو کەلوپەل و جلوبەرگانەی، کە پێیانەوە کەسایەتیی خۆی وەک (*قوتابی*)ی دەبینێت.

بەمجۆرەش، لە نێوان ترس و پرسیار و وەسواس و دڵەخورپێی ژوانیی عاشق و چونە فێرگەی قوتابیدا

---

[15] الیسون جیمز، کریس جنکس، الن پروت: **جامعەسناسی دوران کودکی**: نظریە پردازی دربارەی دوران کودکی. ص: ١٠٣

لێکچوونێکی چەندایەتی و چۆنایەتی هەیە. قوتابیی هەمان هەستی لەخۆتێگەیشتنی لەلا دروست دەبێت کە ئاخۆ قوتابخانە چۆن پێشوازیی لێدەکات، بەتایبەتی مامۆستاکان، چونکە مەعشوقی قوتابی لە قوتابخانەدا بە پلەی یەکەم مامۆستاکانی و بە پلەکانیتر وانە و هاورێکانی و شێوازیی بەڕێوەبردن و ئەو ئاسایيشەیە کە هەست پێدەکات. قوتابیی پێش چوونە قوتابخانە، لەناو خەیاڵ و بیرکردنەوەی خۆیدا، کە بیرکردنەوەیەکی تەواو پێگەیشتووە و حساباتی وردی تێدایە سەبارەت بە (کاتی مانەوە، دووری قوتابخانە و ماڵ، ئەرکەکانی و دۆزینەوەی هاورێکانی گەڕەک لەهەمان قوتابخانە، چۆنێی چوون و هاتنەوەی..)، قوتابخانەیەکی وێناکراو دەهێنێتە پێشچاوی خۆی.

ئەم وێناکردنە بەشێکی پەیوەندیی هەیە بە چەمکی (کولتووریی قوتابخانەوە) لە کۆمەڵگادا، چونکە ئەو وێنا کولتوورییەی لە کۆمەڵگادا بۆ قوتابخانە دەکرێت، دەبێتە پێشنووسێک بۆ ئەوەی قوتابی لەسەرییەوە قوتابخانە (هزریی و وێناکراوەکە)ی خۆی بنەخشێنێ. بەڵام بەشێکی تری ئەم قوتابخانە وێناکراوەی مناڵ پەیوەندیی هەیە بە دامەرزاوەی قوتابخانە خۆی و ئەو شێوازی پێشوازییەی لە قوتابیە مناڵەکە دەکرێت و بەهۆیەوە وێنای قوتابخانە لە وێنای بەندیخانە نزیکدەبێتەوە و قوتابخانەش دەبێتە شوێنی

سزا و کۆنترۆڵ وەکئەوەی میشێل فۆکۆ لە (لەدایکبوونی بەندیخانە)دا باسیکردووە[16].
توندوتیژیی لەو ساتەوەختەوە دەرەوێتەوە کە وێناکردنە کولتووریە کۆمەڵایەتیە خێزانییەکە بۆ قوتابخانە نێگەتیڤ بێت و قوتابخانە یەکسان کرابیت بە شوێنی سزادان، وەکئەوەی کە بە دکتۆرەکان و پۆلیس مناڵ دەترسێنرێت. ئەم توندوتیژییە سیمبولییە وا لە مناڵ دەکات کە وەک شوێنی سزادان و ئەرک تەماشای قوتابخانە بکات و ترس بکاتە سەرەتای ئەو پەیوەندییەی کە ئەو بە خوێندن و دامەزراوەکەوە دەبەستێتەوە. قوتابیی بەپێی ئەم وێناکردنە، لە پێشەوە دەزانێت ڕووبەڕووی عەشقێکی ناکام، یان ڕەتکردنەوە و کوێرەڕێ دەبێتەوە و ئەمەش وێنای دوارۆژ، یان مژدەی سەرکەوتن و (بەهەشت) و داهاتوو، لەودا دەمرێنن.
بەڵام ئەگەر وێنا کولتووریی و دەرونخێزانییەکان لەسەر خوێندن و قوتابخانە بەهێزبوون، ئەگەر لە ماڵدا لانیکەم یەک کەسی تێدا بوو وێنەیەکی پۆزەتیڤی لەسەر خوێندن هەبێت، یان کارێک و دوارۆژێکی بۆخۆی دابین کردبێت و

[16] میشل فوكو: مراقبت و تنبيه (تولد زندان). مترجمان: نيكو سرخوش، أفشين جهانديده. تهران: نشر نی، چ: پنجم، ۲۰۰۵، بەشی سێیەم، پارەی دووەم، ل:۲۱۳-۲٤۲.

سەرکەوتنی بەدەستهێنابێت بەهۆی خوێندنەوە، ئەوە ئەم سەرکەوتن و پێشنموونەیە کاریگەریی دەکاتە سەر وێناکردنەکەی مناڵ بۆ (مامۆستا/مەعشوقەکەی) خۆی و جوانتر و ئومێدەوارانەتری دەکات.

بۆیە دامەزراوە هەمیشە دەتوانێ وێنا پۆزەتیڤ و نێگەتیڤە کولتوورییە کۆمەڵایەتییەکان هەڵگێڕێتەوە و نەیانچەسپێنێت و ڕەوایەتیان پێنەدات. ئەو قوتابخانەیەی هەمان وێناکردنی ناو مێشکی منال بەرجەستە دەکات، یان نزیکی دەخاتەوە، بڕیارە دەروونخێزانیی و کولتوورییە نێگەتیڤەکان هەڵدەوەشێنێتەوە و منال هاوشوناسی لەگەڵ ئەوەدا دەکات کە ئەزموونی دەکات و ئەوەش کە ئەزموونی دەکات نزیکە لەوەی فەنتازیای کردووە. لێرەدا بوار و پانتایی توندوتیژیی ڕەمزیی و پراکتیکی، دیار و نادیار، ئاشکرا و شاراوە، کەم دەبێتەوە. ئەمەش ئەو دۆخەیە کە مامۆستاکان بە پلەی یەکەم ڕۆڵێ تێدا دەگێڕن و پەرەی پێدەدەن، ئەمجا سیستەمی ئیداری و بەڕێوەبەرەکان و کارمەندانیتر و کەشوهەوای قوتابخانە بەگشتی..

## هەندێ پێشنیار:

پێویستە ئێمە لە هەرێمی کوردستادا پێبەپێی بەرزبوونەوەی خودهووشیاری منداڵ، فۆرمیی ئیداریی و پەروەدەیی و فێرکاریی قوتابخانەکانیشمان بە ئاراستەیەکدا بگۆڕین، کە دووریان بخەینەوە لە هەر توندوتیژییەکی پاشەڕۆژانەی ڕێکخراو یان ڕێکنەخراو و خۆبەخۆ. ئەم جۆرە توندوتیژیانە چاوەڕوانکراون و هەندێکیشیان هۆکاری خۆیان لە دامەزراوەی پەروەردەیی خۆیەوە دەهێنن. پەیوەندییە توندوتیژاویەکانی ناو دامەزراوە، خودی دامەزراوە وەک بەشێک لە شوێن و پێکهاتە بینابییەکانی، کەسایەتی توندوتیژ و توندوتیژیی وەک ئامانجێک بەرهەمدەهێنن. بەڵام هەروەکو لە نمونەکاندا بینمان، بۆی هەیە قوتابخانە ترسڕەوێن و ناتوندوتیژانەبێت و لە هەمان کاتیشدا دیسیپلینە پەروەردەیی و ڕێنماییەکان تیایدا بە باشترین شێوە جێبەجێ بکرێن. وەلێ بۆیشی هەیە قوتابخانە بۆخۆی بەرهەمهێنەری ترس بێت و ببێتە هۆکاری ئەو فۆرمانەی دەروونپشێوی و سترێسی قوتابیان، کە ئامادەیان بکات بۆ هەر پەرچەکردارێکی توندوتیژانە. بۆ ئەوەی لەم بارە خۆمان بەدوور بگرین و قوتابخانە بتوانێ گیانی توندوتیژیی لە خۆی و قوتابیدا بمرێنێت، پێویستە:

**یەکەم) لە سەر ئاستی (شوێن و مرۆڤ) گرنگییەکی زۆر بە قوتابخانە بدەین.** بۆ نمونە ڕەنگە هێمنەکان و وێنەی سەرنجڕاکێش و هەڵواسینی بەرهەمی قوتابیانی ساڵانی پێشووتر بە دیوارەکانەوە، یارمەتیدەرێکی باشی قوتابیان دەدات تاکو لە ڕووی دەروونییەوە بەزوویی هاوشوناسیی لەگەڵ دامەزراوەکەدا دروستبکەن. لەبەرامبەر ئەمەشدا لابردنی وێنەی سەرکردە و وێنەی دوور لە جیهانی دەروونیی منداڵانەوە، قورسایی لەسەریان کەمدەکاتەوە و لە جیاتی ئەم جۆرە وێنانە پێویستە وێنەی قارەمانی منداڵان، لە مرۆڤ و ئاژەڵ و جیهانی فیلم کارتۆن و ئەنیمەشینەکان، چ لە ئاستی ناوخۆیی و چ لە ئاستیی جیهانیدا هەڵبواسرێن.
شێوەی دەرگای قوتابخانە و نەخشەکانی، چۆنێتی حەوشە و فۆرمی کورسییەکانی، جۆری یارییەکان و ڕەنگەکانیان، کافتریا، ڕاڕەوەکان و ڕووناکیی و سەوزایی و بێدەنگیی، تەوالێتەکان، گەورەییان، بۆنخۆشی و ئاسانکارییەکانیتر و هەبوونی کەسێکی تایبەت لە نزیکیانەوە، کە یارمەتیدەری منداڵەکان بێت، گرنگیی تایبەت بە خۆیان هەیە لە بەستنەوەی منداڵ بە دامەزراوەکەوە. ئەم شوێنانە هەموویان شوێنی بەرهەمهێنان و کپکردنەوەی توندوتیژیی

سێمبوولی و پراکتیکین و پێویستە بەهەند وەربگیرێن بۆ نزیکخستنەوەی وێناکردنەکانی منداڵ لە قوتابخانەی واقیعی.

**دووەم) لە ئاستی پەیوەندیی مرۆڤ و مرۆڤدا بە پەیوەندیی و تێگەیشتنەکانمادا بچینەوە:** پێویستە قوتابخانەکان پێشینەیەکی فەلسەفیی و مرۆڤناسیانەیان لەسەر قوتابیە منداڵەکان وەک مرۆڤی تەواو هەبێت. مەبەست لە مرۆڤی تەواو لە ڕووی هەستەکیی و ئەقڵییەوەیە. واتە پێویستە ئێمەی گەورەساڵان لەکاتی داڕشتنی یاسا و ڕێنماییە پەروەردەییەکان و لە بیرکردنەوە سیاسیەکانمادا، دەست لەو تێگەیشتنە نەریتیە هەڵبگرین کە فێری کردبووین بەو جۆرە مامەڵە لەگەڵ منداڵ بکەین، کە (هەست بە شت ناکات) و (ئەقڵیی بە هیچ ناشکێت)! لێرەشەوە دەست هەڵبگرین لە شێوازەکانی (خۆمنداڵکردنەوە) لەکاتی قسەکردن و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ منداڵەکان و گرتنەبەری شێوازیی نۆماڵتر و سرووشتیتر لەگەڵیاندا. توێژینەوەکان و ئەزموونی دایکان و باوکان ئەوەی سەلماندووە کە منداڵەکان بە شێوەیەکی تەواو هەست بە جیهانی دەوروبەری خۆیان دەکەن و تەواو ئاقڵانە و هۆشمەندانەش بیری لێدەکەنەوە و داواکارییەکان بە باشترین شێوە جێبەجێدەکەن، ئەگەرهاتوو پەیامەکە

بەلایانەوە ڕوون و ئاشکرابوو (بڕوانە پیاژێ: ٢٠٠٤).. خۆمندالْکردنەوە، زمانبچووککردنەوە و دەمخوارکردنەوە، هیچیان خزمەتێکی ئەوتۆ بە تێگەیشتنی مندالْ ناکەن. پەیامی ڕوون و تۆنی ئاسایی دەنگ بۆ داواکاریی و فەرمان بەسەردا کردن، یارمەتیدەری کەسایەتی مندالْن بۆ پێگەیشتن و پەرەسەندن، نەک خۆمندالْکردنەوەی گەورەسالان و لاساییکردنەوەیان بۆ مندالْ. جیاوازیی ئێمە و مندالان لە هەستکردن و تێگەیشتندا نیە، چونکە ئەوانیش بەشێوەی تەواو ئەمکارانەیان لەدەست دێت. ئەوەی جیاوازیی دروستدەکات بریتیە لە شێوازی ئەوان بۆ دەربڕینی هەست و هووشیاربوونیان بەرامبەر بە خۆیان و دەرووبەریان و تێگەیشتن لەو دەوروبەرە.. ئەم تێگەیشتن و ئاستیی پەیوەندییە لەگەلْ مندالْ هەتا ڕوون و ئاشکرا و شەففاف بێت، ڕێژەی کێشەکان و خراپحالْیبوونەکان کەمتر دەبنەوە.

بۆیە پێوستە ئاستی هووشیاریی مامۆستاکان لە ئاست سایکۆلۆژیای مندالْ پێبەپێی بەرزکردنەوەی تێگەیشتنە فەلسەفیی (ئیتیکی) و مرۆڤناسییەکە، بچێتە پێش. مامۆستا بیەوێ و نەیەوێ، مێینە بێت یان نێرینە، قارەمانیی فەنتازیاکانی مندالْ و پێوەری جیاکردنەوەی شتیی باشە لە خراپ، یان پێوەریی جیاکردنەوەی ڕاستە لە چەوت. ئەو

مەعشوقێکە، هەرچەندەش دڵڕەق بێت، قوتابیی خۆشییدەوێت، یان لێی دەترسێت و خۆشەویستییەکەی لە ڕێگەی پەیوەندیی ترس و ملکەچیی و فێڵکردن و جۆرەها تەکنیکی دیکەوە ئاراستە دەکات. بۆیە پەیوەندیی مامۆستا لە قوتابخانەکانی ئێمەدا لە هەرێمی کوردستان تا ئەم ساتەوەختەش پەیوەندییەکی چۆنیی نیە و چەندییە و لە زۆر نمونەدا ئاشکرای دەکات، کە مامۆستا لە گرنگیی و پێگە و ڕۆڵیی خۆی بە باشی تێنەگەیشتووە. ئەمە جگەلەوەی یاسا و ڕێنماییەکانی وەزارەت و شێوازی وانەگوتنەوە، کاتی هەر وانەیەک، ڕیتمی خشتەی وانەکان و نەبوونی شوێن و زۆریی ژمارەی قوتابیانی ناو پۆل، هەموویان ڕێگرن لەبەردەم دروستبوونی پەیوەندییەکی تەندروستانەی نێوان مامۆستا و قوتابیی. هەر ئەمەش وایکردووە کە مامۆستا بەزۆریی ئەرکی خۆی لە وتنەوەی وانە و دەرسدا قەتیس بکات و ڕۆڵی (گوێزەرەوەی زانیاری) لە کتێبەوە بۆ قوتابیی بەخۆی ڕەوا دیتوە، یان کەشی ئیداریی دامەزراوەکە بەجۆرێک ڕێکخراوە، کە کات بۆ مامۆستا ناهێڵێتەوە بۆ ئەوەی لە ئاستی مەعنەوی و مۆراڵیی و کۆمەڵایەتیی و کولتووریشدا ئەرکە پەروەردەییەکانی خۆی جێبەجێ بکات.

قوتابخانەی دوارۆژ ئەوە دەخوازێت کە مامۆستا نەک هەر لە قوتابخانەو ناو پۆلدا، بەڵکو لەماڵیشەوە و لەناو خێزانیشدا ئامادەیی هەبێت. دروستکردنی پەیوەندیی نێوان خێزان و قوتابخانە، لە کەمکردنەوەی گرژیی و هۆکارەکانی توندوتیژیی قوتابخانەیی و پەروەدەییدا کاریگەریی زۆریان دەبێت. ئەمە جگە لەوەی کار ئاسانی زۆر بۆ مامۆستا دەکات لەدەرەوەی دەوامیی فەرمیی ناوپۆل هەڤاڵێتی قوتابیی بکات و پەیوەندییەکانی بخاتە ئاستیکی کۆمەڵایەتیی بەرزترەوە و دایک و باوک وەک بەشێک لە چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتیی و پەروەردەییەکانی قوتابیی بهێنێتە ناوەوە. وێرای ئەمانەش، پێویستە مامۆستا بزانێت کە لە داهاتوودا ئەو منداڵانەی ڕووبەڕوو دەبنەوە، کە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئامرازە تەکنەلۆژییەکانەوە، لە زۆربەی بوارەکانی زانست و ژیاندا خاوەن زانیاریی بەرزترن و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مامۆستا لە داهاتوودا خۆی لەبەردەم هووشیارییەکی چۆنایەتی قوتابیەکانیدا دەبینێتەوە، کە وەڵامی پرسیارەکان تەنیا لە کتێبی دەرسییەوە بەدەست نایەن.

لێرەدا ئەرکێکی گرنگ بۆ وەزارەتی پەروەردە و ئامۆژگای پەروەردەکردنی مامۆستایان دێتە پێشەوە، کە بریتیە لە کارکردن بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی مامۆستا لەو بوارانەدا

كه دەبنە جێخواستیی پاشەڕۆژی قوتابیە منداڵەكان و شارەزایی پەیداكردنی لە جیهانی خەیاڵ و فەنتازیاكیانیان. ئەمەش دەرگایەكی باشمان بۆ دەكاتەوە بۆ گرنگیدان بە ئامرازەكانی ڕوونكردنەوەی وانەكان، بە بەكارهێنانی ئەو فیلم و یاریی و لەیستۆك و چالاكیی و گەشت و پیشە و كارە دەستیانەی كە لە هەنووكە و پاشەڕۆژدا پێكهێنەری جیهانیی خەیاڵی منداڵانن. ئەمە بێجگە لە پێویستیی هەبوونی باخچەیەكی بچكۆلەی ئاژەڵان و ژینگەیەك بۆ خشۆك و باڵندەكان كە جگە لە كاریگەرییە فێركاریی و پەروەدەییەكانیان، دەبنەهۆكاری بەستنەوەی منداڵ بە دامەزراوەی قوتابخانەشەوە.

لەبەر ئەوەی توندوتیژیی لە چەندین سەرچاوەوە خۆی دەخاتە ناو پەیوەندییە مرۆییەكانەوە، پێویستە شێوازگەلێكی ئەوتۆش بدۆزینەوە تا بەهۆیانەوە دژی توندوتیژیی بوەستینەوە. لە سەرووی هەموو ئەمانەوە پێویستە بەردەوام ئەو مامۆستایانە بهێنرێنە پێشەوە، خەڵات بكرێن و بكرێنە نمونە، كە لە پەیوەندییەكانی خۆیاندا بە قوتابییە منداڵەكانەوە ڕێنمایی پەروەردەیی و پەیوەندیی مرۆڤدۆستانەی جێبەجێكردووە و دەستپێشخەریی هەبووە لە بردنە پێشی پەیوەندیی نێوان منداڵان و دامەزراوەی قوتابخانەدا..

سێیەم) بەردەوام لە ئاستی (مرۆڤ و ڕێنماییە پەروەردەییەکان)دا گۆڕانکاریی بکەین: لە وڵاتیی ئێمەدا ڕێنمایی ئەرکە پەروەردەییەکان وەک ئەرکێکی قورس و گران لەسەر دەروونی قوتابی دەکەون. ماوەی وانەکان و پشووەکان، تاقیکردنەوەکان، شێوازیی نمرەدانان، شێوازی پرسیارەکانی تاقیکردنەوە، نوسینی ئامادەیی و غیابات، نەبوونی ئامراز و گەمەی پێویست بۆ بەسەربردنی کاتی پشوو، نەبوونی باخچە و لەیستۆکْ و حەوزی ماسیی و ئاژەڵ و باڵندە و خشۆک لە قوتابخانەدا، گوشارێکی زۆر دەخەنە سەر درەوونی قوتابیی. ئەمە جگە لەوەی سیستەمی سزا ئامادەییەکی بەچاوی هەیەو سیستەمی پاداشت زۆر بەکزیی و ڕیزپەڕانە بەکاردەهێنرێت. پێویستە هەر لە قۆناغی بنەڕەتییەوە بیر لە شێوازی تری سزا و دیسیپلین بکرێتەوە و *سزاسرینەوە* بکرێتە بنەمایەکی پەروەردەیی. لە جیاتی ملکەچکردن بە قوتابی، فێری هاوڕێیەتی و لە جیاتی ترس، متمانەیان تێدا دروست بکرێ. چونکە ملکەچی و ترس و شێوازەکانی دیکەی توندوتیژیی هەموویان دژی تێگەیشتنێکی فەلسەفیانەن لە مرۆڤ و

پێچەوانەی مرۆڤناسیی فەلسەفیی و بنەماکانی فەلسەفەی پەروەردەن[١٧].

پێویستە بە سیستەمی نەهاتن (غیابات) و شێوازی دانانی پرسیارەکان و جۆری تاقیکردنەوەکان و بابەت و نمرەداناندا بچینەوە، چونکە بەبێ ئەم چاکسازیانە لە بواری پەروەردەدا، بەبێ (***ئاراستەکردنی گەمەئامێزی ڕێنماییەکان***)[١٨] و دیسیپلینەکان و بەشداریی پێکردنی خودی قوتابیان لەو چالاکی و ئەرکانەدا، سیستەمی پەروەردەیی دەبێتە شوێنێکی مەترسیدار و دامەزراوەکانیشی دەبنە کارگەی بەرهەمهێنانی توندوتیژی.. قوتابیی لە داهاتوودا دەتوانێت بەشێک بێت لە کۆی پرۆسەکە، چ لە ئاستی ئیداری و چ لە ئاستی پەروەردەیی و فێرکاریدا. لە وتاری (***قوتابخانەکانی دوارۆژ، دوارۆژی قوتابخانەکاندا***) ئەو نمونانە و مەیدانانەم

---

[١٧] ئەم بنەمایانە و چەندانیتریش پێکهێنەری هزر و فەلسەفەی پەروەردەیین لای ئیمانوێل کانت، فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمانی (١٧٢٤-١٨٠٤) کە سەرجەم کاریگەرییان کردوتە سەر کەلاڵەبوونی مرۆڤناسیی فەلسەفیی و فەلسەفەی پەروەردەی مۆدێرن.لەمبارەیەوە بڕوانە:- طيبه ماهروزاده: **فلسفه‌ء تربيتى كانت**. تهران: سروش، ٢٠٠٤.

[١٨] مەبەست لە ئاراستەکردنی گەمەئامێزی ڕینماییەکان، ئەوەیە کە زۆر ڕێنمایی هەن لە جیاتی بەکارهێنانی زمان و شێوازی دیسیپلینکەر و فەرماندەرانە، دەکری لە چوارچێوەی یاریی و گەمەیەکی تایبەتدا بخرێنە واری جێبەجێکردنەوە، کە کۆی قوتابیەکان بەشداریی تێدا بکەن و هەمان ئامانجیش بدات بە دەستەوە کە فەرمانەکە، یان ڕینماییەکە دەیخوازێ.

باسکردووون کە قوتابیی دەتوانێ تیایاندا چالاک بێت و ئەرکێک جێبەجێ بکات. کارەکە ئاسانە و پەیوەندیشی هەیە بە پلەی یەکەم بە دیدگاگۆڕینی گەورەسالان و داڕێژەرانی سیاسەتی پەروەردەییەوە، تا ئەو متمانەیە بە قوتابیە منداڵەکانی ئەمڕۆ و ڕابەرانی دواڕۆژ دروستبکەن، کە دەتوانن زۆر کار و ئەرک جێبەجێ بکەن، تەنانەت وانەگوتنەوە و ڕێکخستنی ئیداریی و ئەمنیی و ئاسایشی ناو قوتابخانە. ئەمەش وەک سەرەتایەک بۆ ئیدارەکردن و بەشداریی سیاسیی لە کۆمەڵگادا.

ڕێنماییە پەروەردییەکانی ئێمەش پێویستیان بە پێداچوونەوە و گۆڕانکاریی هەیە، چونکە ئەو ڕێنماییانە لە بنەماوە وەک (مرۆڤی کامڵ) بیریان لە منداڵ نەکردۆتەوە و کەموکوڕییەکی بونیادیان هەیە لە تێڕوانینیاندا بۆ مرۆڤ. ئەمە جگە لەوەی گەورەسالان ئەو ڕینماییانەیان داناون کە تیپ و گرووپێکی تایبەت لە منداڵ و قوتابخانەیان لەبەرچاودا بووە و لە ڕۆشنبیرییەکی تایبەتیشەوە بیریان کردۆتەوە. لە ئێستاشدا هەموو ئەمانە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. بۆیە پێویستە ئەو ڕێنمایی و دیسپلینانە ئامادە بکرێن کە ڕەهەندێکی فەلسەفیی و مرۆڤناسیانەیان بۆ مرۆڤ و توانای فێربوون و دانایی تێدایە. ڕێنماییە کۆنەکان لە زەینییەتێکی دیسپلینکەر و فەرماندەییانەوە هاتوون و

ئەو چاوەڕوانیە ناوەکییە ستەمکارانەیان هەیە کە دەبێت: (وەک خۆیان جێبەجێ بکرێن). لەم ڕێنماییانەدا بواری گفتوگۆ، ڕاپرسیی، پێداچوونەوە، بەشداریی قوتابیی و تێگەیشتن لێی، کەمتر حسابی بۆ کراوە. گۆشەنیگای بیرکەرەوەی ناو ئەم ڕێنماییانە، جگە لەوەی گۆشەنیگایەکی گەورەسالانەیە، ئاواش بیری لە و چەندایەتیە لە زانیاریی کردۆتەوە کە پێویستە قوتابیە منداڵەکان فێری ببن، نەک چۆنایەتی فێربوون و ئاشکراکردنی توانای داناییناسیانەی قوتابی. بۆیە گۆڕینی گۆشەنیگای پەروەردەیی لە گۆشەنیگایەکی ستەمکارانەوە بۆ گۆشەنیگایەکی دیموکراتیکیانەی بەشدارییپێکەر، لە خاڵە هەرە جەوهەرییەکانی سیستەمی داهاتووی پەروەردەیی دەبێت لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ توندوتیژیی بەگشتیی و توندوتیژیی قوتابخانەییدا. پێویستە ئەم خاڵە هاوکاتیش بێت بە لادان و نەهێشتنی کۆی ئەو ڕێنماییانەی کە لە قوتابخانەدا منداڵان فێری توندوتیژییەکی تر لەسەر بنەمای ڕەگەز و جنسییەتەوە دەکات و نایەکسانییە کولتوورییی و کۆمەڵایەتیی و جێندەرییەکان دەکاتە بەشێک لە پرۆگرام و شێوازنوڕیی و ڕەهەندیی پراکتیکیانەی قوتابخانە. ئەمەش شتێکە بە ئاشکرا لە کەشی پۆل و چۆنێتی دانیشتنی

قوتابیی کچ و کوڕ، بە کەشی یاریگا و جیاکارەیی ئامرازەکانی یاریکردن و دابەشکردنی ئەرکەکانەوە دیارە[١٩].

## ئەنجام:

هەرچەندە لە ئێستای ژیانی ناو قوتابخانە و دامەزراوە پەروەردەییەکانی هەرێمی کوردستاندا، پەیوەندیی نێوان مامۆستا و قوتابیی بە شێوەکی گشتیی لە ئاستە پێویستەکەیدا نیە و ئەڤین و ئایدیالیزەکردن و خۆشەویستی بۆ مامۆستا وەکئەوەی پێویستە، بەرجەستە نیە. بەڵام هێشتاش لە ڕووی تیۆرییەوە مامۆستا و قوتابخانە، نمونەی ئایدیاڵیی و قارەمانەکانی ناو فەنتازیای منداڵانن. لە ڕووی شیاوەکییەوە هێشتا قوتابیە منداڵەکان وەک نمونەی دانسقە تەماشای مامۆستا دەکەن و قەدەخە و ئازادییەکانی مامۆستا وەک نمونەی ڕینمایی لەلایەن قوتابیە زارۆکەکانەوە وەردەگیرێن. زۆربەمان بیستومانە و ئەزموونمان کردووە کە چۆن منداڵان لە ماڵیشەوە هەر بە ڕێنماییی مامۆستا نمونەییەکان کار دەکەن، بەتایبەتی لە بواری یاریی و کۆشش و ددانشتن و خواردنی میوە و سەوزە و دەستشتن لە پێش و پاش نانخواردن، تەنانەت

---

[١٩] الیسون جیمز، کریس جنکس، الن پروت: **جامعەسناسی دوران کودکی**: نظریە پردازی دربارەی دوران کودکی. ص: ١١٤-١١٥.

تەماشاکردن و نەکردنی فیلمە کارتۆنیەکانیش.. لەبەرئەوە هەرچەندە هەموو مامۆستاکان بەم وێناکردنەی خۆیان لە زەینی قوتابییەکانیاندا ئاشنا نین، بەڵام ئەوە زەمینێکی ئامادەیە بۆ چاندن و کارتێداکردن. هووشیاریی مامۆستا بەرامبەر بە فیگەرە مەعشوقیانەکەی خۆی لە فەنتازیای قوتابیدا، ڕیگایەکی هەرە گرنگ و شیاوی ڕووبەڕووبوونەوەی توندوتیژیی بەگشتی و توندوتییی قوتابخانەییە بە تایبەتی..

٠٥-٠٥-٢٠١٣

# قوتابخانە تایبەتییەکان:
# میراتگرانی کۆلۆنیالیزم..

**سەرەتا:**

لەم بەشەدا، بەشێوەیەکی گشتی، هەندێ بیرۆکە لەسەر قوتابخانە تایبەتیەکان دەردەبڕم بۆ ئەوەی لە وتاری داهاتووی ئەم کتێبەدا بە تایبەتی لەسەر دوو قوتابخانەیان بوەستم و چەندین لایەنیان لە باش و خراپ شیبیکەمەوە. ئەم وتارە دەبێتە چوارچێوەیەکی گشتی بۆ خستنەڕووی دیدی خۆم لەوبارەیەوە، لە کاتێکدا لە بەشی دادێ بە پەنابردن بۆ هەندێک بەڵگە و ئەزموونی وڵاتانیتر، باسەکەم دەبەمە پێش.

هیچ شتێک هێندەی ئەوە ئازارم نادات کە دەبینم لە هەرێمی کوردستاندا بازرگانییەکی زۆر بە کایەی پەروەردە و خوێندنەوە دەکرێت. لە وڵاتێکدا کە هەر لە بنەماوە بنەما پەروەدەییەکانی لاواز بن و لەسەر پرانسیپی ڕەگەزیانەی باوسکالاریی و سزاویستییەوە دامەزرابن، پەروەردە نەک هەر نابێت بازرگانیی پێوە بکرێت، بەڵکو دەبێت وەک زانست و ڕێگایەکی ڕزگاربوونیش لەو میراتە تەماشای

بكرێت. بازرگانییەک کە سترێس و دڵەڕاوکێیەکی زۆری بۆ منداڵەکان دروستکردووە و ناهاوسەنگیەکی زۆری بۆ خێزان و دایک و باوکەکان هێناوەتە پێش و مۆراڵی کۆمەڵایەتی و بەهاکانی پووچکردوونەتەوە.

ساڵەهایە هاوار دەکەین ئەم قوتابخانە تایبەتیانەی وەک (شوەیفات، بریتش سکوڵ، فرەنچ سکوڵ و عیشق و هتد) دەتوانن مەترسیدار بن ئەگەر خۆیان لەگەڵ سرووشتی کۆمەڵگای ئێمە نەگونجاند و ئەگەر لەلایەن حکومەتەوە چاودێریی ورد نەکران. بەڵام حکومەت بۆخۆی، یان لە ڕێگەی دەستەدرێژکراوەکانی و مشەخۆرانییەوە، لەبەر ئەو سوودمەندییەی کە لە ڕێگەی کەناڵی جیاوازەوە لەم قوتابخانە و تەنانەت زانکۆیانەش وەدەستیدەهێنێت، بێدەنگ و بێهەڵوێستە.

ئەم بێهەڵوێستیە لە ئێستادا پاساوی خۆی هەیە، بەڵام بۆ داهاتووی کۆمەڵگاکەمان و بۆ سامانیی مرۆییمان دەبێتە بەڵایەکی ناگەهان. بۆ ئەوەی حکومەت خۆی لە میراتگریی ئەم وەیشومەیە ڕزگار بکات و لانیکەم کارێک بکات سێبەریان بۆ نەکات، پێویستە سانسۆرێکی جیدیی لەسەر ئەو کۆمپانیا و گرووپانە دابنێ کە خاوەنی ئەمجۆرە قوتابخانانەن و نزیکیی خۆیان یان کەسانێکی ئەندام لەو دەستە و کۆمپانیا و گرووپانەوە، بۆ نمونە سیماگرووپ، لە

حکومەتەوە بەکار نەهێنن بۆ شەرعییەتبەخشین بە بازرگانیەکەیان.

## بنەمای پەروەدەناسی لە پێش بنەمای قازانجەوە:

یەکەم مەترسی ئەوەیە کە ئەم قوتابخانانە زۆر بەکەمی لەسەر بنەمایەکی پیداگۆکیانەوە دامەزراون و سپۆنسەر و بازرگانانی پشتەوەیان ئەو پرانسیپەیان بۆ گرنگ نییە و بگرە هیچیشی لێنازانن. لەم قوتابخانانەدا ڕێژەی زۆری قازانج دەکەویتە پێش پرانسیپە زانستیەکانەوە و بە سوودوەرگرتنیش لە کەشوهەوای یاسایی کوردستان ئەم دەرگایە بۆ ئەوان بە کراوەیی ماوەتەوە و ڕیگایەکی قاچاخیانەیە بۆ پەیداکردنی زۆرترین پارە بە هۆی پەروەردەوە. بینایەی زۆرێک لەم قوتابخانانە هێشتا تەواو نەبوون، پێویستییە ئیداریی و پەروەردەیی و ئیستاتیکی و ڕەفاهییەکان بۆ منداڵان هێشتا دابین نەکراون، هێشتا منداڵانی ئێمە بە ڕێگای پڕ دڵەڕاوکێ (سترێس) و دوورودرێژی گڵ و خۆڵ و چەوڕێژدا دەبرێنە قوتابخانە. دایکان و باوکان ئەرکێکی زۆریان خراوەتە سەرشان، هەر لە ئامادەکردنی خواردن، یان کڕینی بە نرخێکی زۆر، تا دەکاتە کرێی هاتوچۆ و جلوبەرگ و پێڵاو و لۆگۆکانی ئەم قوتابخانانە. بەڵام کێشەکان لە سەرهەڵداندان و فەزیحەکان

بە ڕێوەن وەک بڵاوبوونەوەی گرتە ڤیدیۆیی و ئەو شتانە.. ئەمەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە لە سایەی نەبوونی لێپێچینەوەدا لەلایەن حکومەتەوە، پرانسیپی قازانج خراوەتە پێش پرانسیپی پەروەدەناسیانە و پیداگۆکیانەوە.

## لە کۆڵۆنیاڵیستخستنی ئەم قوتابخانانە:

دووەم مەترسیی ئەوەیە کە ئەمانە دەتوانن بەو نیگا کۆڵۆنیاڵیستانەیەی لە سیستەمەکەیاندا هەیە، ڕۆحی منداڵانی ئێمە ڕابهێنن لەسەر قەبووڵکردنی هەر جۆرە کۆڵۆنیاڵیزمێک.. وەک لە پییەر بۆردیۆوە فێربووین: سیستەمی پەروەردە دەتوانێت ئایدیۆلۆژیای سیاسی و کولتووری بەسرووشتیی بکات و لە تەبع و خووی مرۆڤدا بەرهەمی بهێنێتەوە وەکئەوەی کە وابزانین بە ڕاستیی دەبێت وا بێت( بییر بوردیو: الرمز و السلطه، ١٩٩٠). بۆیە زۆر گرنگە لەو وەزارەتەی پێیدەڵێین: وەزارەتی پەروەردە لیژنەیەکی چاودێریکردنی بێلایەن، نەک دەستی درێژکراوەی کۆمپانیاکان، هەبێت بۆ لێپێچینەوە لەوەی ئاخۆ کام لەم قوتابخانانە بەو جۆرە ڕەفتار دەکەن کە بیرخەرەوەی ئەخلاق و شێوازی ڕەفتاری کۆڵۆنیاڵیستانەیە.. مەبەستم لە ڕەفتاری کۆڵۆنیاڵیستانە بریتیە لەو بیرکردنەوە و ڕەفتارەی کە لە پشتییەوە

بەرزەنۆڕیی بەرامبەر بە دەوروبەر و کۆمەڵگا هەیە و هەستی (من باشتریی) بە ئاراستەی (خۆپەرستی)دا، دەداتە منداڵەکان، نەک هاوچەشندۆستی و ئەویتر ویستی. ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگە چونکە بەشێکی زۆری ئەم قوتابخانە تایبەتیانە جگە لەو ڕوانگە باڵایەی بۆخۆیان هەیانە لەم کۆمەڵگایەدا و جگە لەوەش کە ئەم کۆمەڵگایە هەمیشە نمونە (ئایدیاڵیی و باشەکانی) لە دەرەوە دەهێنێت، ئاواش گرنگە بۆ ئەوەی سرووشتی منداڵی کورد بە ڕۆحێکی کوردستانیانە پەروەردە بکەین. گرنگە منداڵەکان لەم قوتابخانانەشدا هەر بزانن ئەوان خەڵکی کوێن، نەک لەسەر چ سیستەمێک دەخوێنن.

## بەرزنۆڕیی و نزمنۆڕیی لە خود:

سێیەم مەترسیی ئەوەیە کە ئەم جۆرە سیستەمە منداڵەکان لە وڵاتی خۆیان نەبان دەکەن و ڕایاندەهێنن قێز لەم کۆمەڵگایە بکەنەوە و ببێزرێن لە کوردبوون و کوردستانیبوونی خۆیان. هەستی نزمنۆڕیی بۆ کۆمەڵگای لۆکاڵی، بەچاوی کەم تەماشاکردنی جلوبەرگی خۆماڵی، دووریی فەزای کولتووریی ئەمجۆرە قوتابخانانە لە کەشی کۆمەڵایەتی ئێمەوە و نەبوونی بۆنەگەلێک کە تیایاندا کوردبوونی کولتووریی بەشێک بێت لە ڕێوڕەسمەکان و

نغرۆکردنی منداڵەکان لە بۆنەی ئەو وڵاتانەدا کە قوتابخانەکان وەک پاشگر بەکاریاندەهێنن، هەموویان ئەم نۆڕینە قووڵتر دەکەنەوە. بەمجۆرەش هەر لەسەرەتاوە دابڕانێک لە نێوان منداڵەکان و ئەو ژینگەیەدا دروستدەبێت کە ژینگەی سرووشتیی خۆیانە. ژینگەی سرووشتیی و کۆمەڵایەتیی تا بەردەرگای قوتابخانەکانیش بڕ ناکات. بگرە دایکان و باوکانیش لەمەدا هاوکار نین و لەناو ئەو قوتابخانانەدا لە هەوڵی ئەوەدان بە زمانی بیانی بئاخفن نەک زمانی زگماکی منداڵەکانیان..

## دروستکردنی چینێکی نوێ لە منداڵان:

چوارەم مەترسی ئەوەیە، کە ئەم جۆرە قوتابخانەنانە بەو پێیەی لە بنەماوە بەدوای قازانجیی مادییەوەن، بە گوشارخستنەسەر دایکان و باوکان و خراپبەکارهێنانی پرستیژی ئەو وڵاتانەی ئیدیعا دەکەن پەیڕەوی لە سیستەمەکەیان دەکەن، بەهۆی جێبەجێکردنی کۆمەڵێک شتی فۆرماڵ و شێوەیی کە خۆی لە جل و بەرگ و پێڵاو و لۆگۆ و نیشانەکانیتری خۆجیاکردنەوەوە دەبینێتەوە، گاپ یان بۆشاییەکی گەورە لە نێوان خوێندن و قوتابیانی قوتابخانە حکومییەکان دروستدەکەن و ئەمەش دەبێتە بنەمایەک بۆ جیاکردنەوەی منداڵانی هەمان کۆمەڵگا لە

یەکتر و دروستکردنی (چینێکی نوێ لە منداڵان) کە لەخۆتیگەیشتنیان تەنیا لەبەر ئەوەی لە یەکێک لەو قوتابخانانە دەخوێنن کە پاشگرەکەیان ناوی وڵاتێکی ئەوروپی یان غەیرە کوردستانیە، جیاواز بێت. لەبەر ئەوەی ئەمجۆرە شتە فۆرماڵانەی وەک لۆگۆ و جلوبەرگ و هتد، هیچیان نیشانەکانی بەخشینی شوناسێکی ڕاستەقینە نین، ئەوە تەنیا وەک شوناسێکی درۆیین و لە پێناوی پارەدا دەمێننەوە. هەر لەبەر ئەوەش کە پارەیەکی زۆریان تێدایە لەلایەن قوتابخانەکانەوە زۆر جەختیان لەسەر دەکرێتەوە. وەکئەوەی ئەگەر ئەو منداڵانە ئەم جلوبەرگەیان لەبەر نەبوو، ئەوە فێریی ئەو بڕە لە زانیارییەکان نابن کە دەبێت فێر ببن. یەکسانپۆشیی بە زەروورەت یەکسانیی دروستناکات، بەتایبەتی ئەگەر قوتابخانەکە خۆی فرۆشیاری جلوبەرگەکان بوو. بۆیە زۆر گرنگە وەزارەتی پەروەردە جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە ئێمە کواڵێتی و جۆرایەتی سیستەمی خوێندنمان دەوێت نەک جلوبەرگ و لۆگۆی فڵان و فیسارە سیستەمی خوێندن. گرنگیشە وەزارەتی پەروەدە مەرج بۆ ئەو جلوبەرگانە و نرخ و جۆرەکەیان دابنێت و لەپاڵ لۆگۆ و نیشانەی ئەو وڵاتانەی بوونەتە پاشگری ئەم قوتابخانانە، لۆگۆ و نیشانەکانی کوردستانیش بەسەریاندا فەرز بکات.

## بەخۆنامۆکردن:

بەخۆنامۆکردن و هەستی غەریبوەتەنی، یەکێکیترە لە مەترسییەکانی ئەم قوتابخانانە. ئەم قوتابخانانەی میراتگریی کۆلۆنیاڵیزم منداڵە قوتابییەکانی ئێمە تووشی جۆرێ لە خۆنامۆبوون و (ئیلینەیشن)ی پێشوەخت دەکەن. چونکە بەشداریی ئەم جۆرە قوتابخانانە لە بۆنە نەتەوەیی و کولتورییەکانی ئێمەدا زۆر کەم، یان لاوازە ئەمەش وا دەکات کە منداڵانی ئێمە کۆی چالاکییە کولتوورییەکان لەو بۆنانەدا کورتبکەنەوە کە تەنیا لە قوتابخانەکانی خۆیاندا ساز دەکرێن و هیچ پەیوەندییەکیشیان بە کۆمەڵگای کوردستانییەوە نیە.

بەخۆنامۆبوون لە ڕەهەندە کولتوورییەکەیدا زۆر هۆکاری هەیە، بەڵام هۆکاری نامۆبوون بە شوێن یەکێکە لە هۆکارە نەگۆڕەکان. مرۆڤ لە شوێندا شوناسی خۆی دروستدەکات و یادوەریی پەیوەستە بە شوێنەوە (سیوەیلی: ٢٠١٥). گرنگە بۆنەکانی قوتابخانە بۆنەگەلێکیش بن کە پەیوەندییان بە کۆمەڵگای لۆکاڵییەوە هەیە. تەنانەت ئەگەر ئەو قوتابیانەش خەڵکی زۆر وڵاتیتر بن، هێشتا پێویستە پێگەی کوردستان لەناویاندا سەنتەر بێت. بۆیە کاتێک لە دەرەوەی کۆمەڵگا بۆنەی تر هەبێت یان ئەوەتا منداڵەکان بە هەمان چاوەڕوانییەوە بەشدارییان تێدا ناکەن، یان خۆیان لە

ئاستیاندا بە نامۆ دەزانن.. لەبەر ئەوە پێویستە بەشداریی قوتابخانە بازرگانییە تایبەتییەکان لە بۆنە کولتووریی و نەتەوەییەکانی ئێمەدا ناچارەکی بێت. هیچ نەبێت لەم ڕێگەوە دەتوانرێت ئەم قوتابخانانە لە میراتگریی کۆلۆنیالیزم ڕزگار بکرێن.. ئەمەش ئەرکێکیتری وەزارەتی پەروەردەیە..

## کوردستانیبوونی بەڕێوەبەرەکان:

لە دانانی بەڕێوەبەرانی ئەمجۆرە قوتابخانانەدا پێویستە ئەوە ڕەچاو بکرێت کە بە ڕێوەبەرەکەی کورد بێت، بە ئەزموون و شارەزایی لە سیستەمی ئەو وڵاتەی قوتابخانەکە لێوەی هاتووە، بۆ نمونە شارەزای سیستەمی ئیدارەیی پەروەردەیی هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کوردییەکی باش بزانێت. خۆ ئەگەر بەڕێوەبەرەکە کورد نەبوو، ئەوە پێویستە زمانی کوردی فێر ببێت و شارەزاییەکی باشی لە کولتوور و کۆمەڵگای ئێمە هەبێت بۆ ئەوەی لە بڕیارەکاندا تایبەتمەندیی ئەم کۆمەڵگایە ڕەچاو بکات. نەک بە تێڕوانینێکی بەرزەکەپووەوە بڕوانێتە ئەم کۆمەڵگایە و بۆخۆی لێمان ببێتە ئیمبراتۆرێکی بچکۆلە. لە سەردانێکمدا بۆ یەکێک لەم قوتابخانانە، بۆم دەرکەوت بەڕێوەبەرکەی نەک هەر یەک پیت کوردیی نازانیت، زۆر کەمبایەخانەش تەماشای کۆمەڵگا و ئەزموونی کوردستان دەکات (ئەم

دیدارەم بە دۆکیۆمەنتی تۆمار کراو پاراستووە)، سەری زمان و بنی زمانی ئەم بەڕێوەبەرە ئەوە بوو کە بۆ هەر قسەیەکی ئەوە دووبارە بکاتەوە کە ئەوان سیستەمی فلان وڵات بەکار دەهێنن و هیچ گوێ بە کۆمەڵگای لۆکاڵیی نادەن.

## ئیمتیازاتی بەرپرسەکان و منداڵەکانیان:

هەموو منداڵی بەرپرسەکان لە زومرەی دەرچووەکانن و ڕۆڵیی جۆربەجۆر لە قوتابخانە تایبەتیەکانیان پێدەدرێت، هەر لە نوێنەرایەتیکردنەوە تا شاندکردن و وەرگرتنی پێگە قوتابخانەییەکان. لەبەرامبەر ئەمەدا بەرپرسەکان نەرمخوویی و موجامەلە و خۆبەکەمزانیی دەکەنە پیشە. جارێکیان لە شوەیفات وەزیرێکم بینی ماوەیەک بوو لە چاوەڕوانیی بینینی بەڕێوەبەرێکی بیانیدا بوو، لە کاتێکدا بۆخۆی لە وەزارەتەکەی بە زەحمەت دەبینرا. پێویستە بەرپرسە سیاسی و حکومییەکان لەبەر بەرژەوەندیی تایبەت، یان لەبەر ئەو موجامەلانەی لەلایەن ئەم قوتابخانانەوە دەکرێن و ئیحتیمالەن بۆ ڕازییکردنیان و هەروەها بۆ پاراستنی ئەو ئیمتیازاتانەی بە منداڵەکانیان دەدرێن، دەستهەڵگرن لە خۆبەکەمزانیی لە ئاست ئەم بازرگانانەی پەروەردە و فێرکردندا. ئەوە نەنگییە بۆ ئەوان

بەسەر ئەو نایەکسانیانەدا باز بدەن کە ئەم بازرگانانە لە نێوان منداڵە مەسئولەکان و منداڵی هاوولاتیاندا دروستیان دەکەن و چاو ببپۆشن لە کەموکوڕییەکانیان.. هەرچەندە ئەم قوتابخانانە زۆر شت بەسەر منداڵەکاندا بەناوی یەکسانکردن و دادوەرییەوە دەسەپێنن و بۆخۆیان دەبێتە قازانجی مادیی، بەلام نایەکسانییەکی تر بەهۆی مامەڵەیانەوە لەگەڵ منداڵە بەرپرسەکان بەرهەم دەهێنن زۆر کاریگەربەخشترە لەوەی کە ئەوان لەدژی دەوەستنەوە!

## ڕۆڵیی دایکان و باوکان:

پێویستە دایکان و باوکانیش دەست هەڵگرن لەو خۆبەکەمزانی و ڕۆحیی ملکەچییەی هەیانە بۆ هەر شتێک کە ئەم جۆرە قوتابخانانە بەناوی یاسا تایبەتییەکانەوە بەسەریاندا دەیسەپێنن. یەکەمین پرانسیپ ئەوەیە کە ئەوان وەک دایک و باوک پارە ئەدەن و قوتابخانەیان بەکرێ گرتووە بۆیە دەبێت مەرج و داواکاریی و گووشاریان هەبێت. پێویستە دایکان و باوکانی کوردستانی لە خەمی ئەوەدا بن منداڵەکانیان بایی ئەوەی پارەیەکی زۆر دەدەن، سوودیش وەربگرن.. نەبوونی پڕۆتێست و ناڕەزایی لە ئاست نرخی جلوبەرگ و خواردن و گواستنەوە و بۆنەی

تری ناوبەناو کە قوتابخانە فەرمانیان پێدەکات، بەشدارییەکی پاسیڤی دایکان و باوکانە کە ئەم بازرگانانە بئاوسێنن و هەرکاتیش بەرژەوەندییان نەما، دەرگاکانمان لەسەر دەبخەن و منداڵەکانمان بەرەڵا بکەنەوە کۆڵان و پێشمان دەڵێن: کورد میللەتێکی دواکەوتوون.. نەبوونی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان دایکان و باوکان، بڕوای پێشوەختیان بە هەموو شتێکی ئەم قوتابخانانە، ملکەچییان بۆ گشت ئەو داواکارییانەی پێیاندەگات، بڕوابوونێکی کوێرکوێرانە بە کواڵێتی و باشی سیستەمی خوێندنەکەیان و هتد، هەموویان ڕێگەخۆشکەرن بۆ چاوپۆشیی لە هەڵە و کەموکوڕیی ئەم قوتابخانانە.. پیویستە وەزارەتی پەروەدە لەمەدا هاوکاری دایکان و باوکان بێت و لەو مەرجانە ئاگاداریان بکاتەوە کە بۆ ئەم قوتابخانانە داندراون بۆ ئەوەی ئاستی هووشیارییان بەرزبێتەوە لە ئاستیاندا و بتوانن پەرە بە ڕوانگەیەکی ڕەخنەیی لە ئاستیاندا بدەن. چونکە ئەم ڕوانگە ڕەخنەییە بەشێکە لە سیستەمی ئەم قوتابخانەنە لە وڵاتە پاشگرەکانیان.

## ڕۆڵیی وەزارەتی پەروەردە:

ڕۆڵی وەزارەتی پەروەدە ڕۆڵێکی ئەخلاقی و زانستیی و پەروەردەیی و ئیداریی وچاودێریکەرانە و هەڵسەنگێنەرانەیە

لە ئاست ئەم قوتابخانانەدا. جگە لەو پێشنیارانەی لەم وتارەدا بۆ وەزارەتی پەروەدەی حکومەتی هەرێم خستمنە ڕوو، ئەوە زۆر پێویستە لە جیاتی ئاوساندنی سەرمایەدارانی بواری پەروەردە و فێرکردن، چاکسازی لە سیستەمی پەروەردەیی خۆماڵیدا بکرێت و ئەم سیستەمە و مامۆستا و قوتابییەکانی نەکرێتە پەراوێزی بزنسی پەروەردەییەوە کە پیاوە زیرەکەکانی کۆمەڵگا و گرووپەکانی سەربە هوتێل دیڤان و (اخوانهم) لە ڕێگەی هێنانی چەند خاتوونێکی کارپێنەدراوی ئەورووپاوە، سوکایەتی بە کۆمەڵگا و بازرگانی بە منداڵانمانەوە بکەن.. پێوستە ئەم وەزارەتە پاش چەند ساڵێک لە ئەزموون لەگەڵ ئەمجۆرە قوتابخانانەدا، بەو پرانسیپانەدا بچێتەوەو هەڵسەنگاندنێکی زانستیی و پەروەدەیی بۆ ئەم قوتابخانە بکات و ئەو مەرجانە باسمانکردن بکاتە پێوەری نوێی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا. ئێمە ڕەخەیەکی زۆر لەوانە دەگرین کە لەگەڵ سروودی نیشتیمانی و هەڵکردنی ئاڵای کوردستاندا هەڵناستنە سەرپێ، بەڵام لەئاست ئەو پەراوێزخستنەی کولتوور و کۆمەڵگای کوردستانیدا بێدەنگین کە لەلایەن ئەم قوتابخانانەوە بەسەری دێت و منداڵەکان لە ژینگەی خۆماڵیی دابڕ دەکات. ئەم دەبڵ مۆراڵییە دەبێت کۆتایی پێبێت و دەست لە هەر جۆرە

خۆبەکەمزانییەک هەڵگیرێت کە لە ئاست ئەم میراتگرانەی کۆلۆنیالێزمدا هەستیپێدەکرێت. ڕەنگە ئەوە زۆر زەحمەت بێت کە تاماوەیەکی زۆر و چەند نەوەیەکیتریش نەتوانین خۆمان لە کولتووری کۆلۆنیالیزم و بەرهەمهێنانەوەی ئازاد بکەین، بەڵام گرنگە چەند هەنگاوێکی ڕزگاریخوازانە بنێین تا لەشەرمەزاریی مێژووییمان کەمبکەینەوە..

2014

## قوتابخانە پەرپووتە تایبەتیەکان..
## قوتابخانەی (شوەیفاتی نێودەوڵەتی) و
## (قوتابخانەی بەریتانی) بە نمونە..

ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە ئاوڕێکی جیدیی لە قوتابخانە تایبەتیەکانی هەرێم بدەینەوە، کە ئیدی ڕووخساری قازانجویستی خۆیان بەتەواوی ئاشکرا کردووە، یان هێشتا بترسین لەوەی بەهۆی ڕەخنەگرتنەوە چارەنووسی منداڵەکانمان دەخەینە مەترسییەوە؟ بترسین لەوەی دەبێت چ جۆر داهاتوویەک چاوەڕێیان بکات، یان بترسین لەوەی ئاخۆ چ کەسێک و سپۆنسەرێک و خاوەنێک لە پشت ئەم قوتابخانانەوەیە و دەتوانێت سزامان بدات؟ پەیوەندیی حکومەت و ئەم قوتابخانانە لە چیدایە و چۆن لەپڕ ئەم ناوبانگ و پێگە و ئاسانکاریانە بۆ ئەم قوتابخانانە کران و لە باشترین تۆپۆگرافیی شارەکانی ئێمەدا زەوییان پێدرا؟ ئایا ئەم قوتابخانانە لە بنەمادا هەڕەشەیەک بوون لە قوتابخانە حکومییەکان، یان بەدیلێکی هاوچەرخ بۆ پێگەیاندنی نەوەی داهاتوو؟ وەڵامی هیچکامێک لەم پرسیارانە و دەیان پرسیاریتر بۆ کەس ڕوون نیە. لەگەڵ

ئەوەشدا دەبێت لە شوێنێکەوە دەسپێکەین و بەدوای وەڵامدا بگەڕێین.
هیچ نای شارمەوە، وێڕای ئاگاییم بەرامبەر بە پرۆسەی تایبەتیکردنی بواری فێرکردن و پەروەردە و ئەو کێشە و باشییانەی لەم پرۆسەیە دەکەونەوە، کە هەموو ئەمەشم لە ئەزموونی دەرەوەی وڵاتەوە وەرگرتبوو، وەک بەشێک لە ڕەخنەی سەرمایەدارییەتی دوایی، هێشتا نەمتوانی بەرگریی بکەم لە نەناردنی منداڵەکەم، بۆ یەکێک لەم قوتابخانانەی کە هەر لەسەرەتاوە، نەیارێکی سەرسەخت و ڕەخنەگریی بەردەوامی ئەو سیاسەتەش بووم، کە دەرگای لەسەر بەتایبەتییکردنی ئەم بوارە کردەوە.
گەمژەیی هەندێجار بەشێکە لە هووشیاریی و ئەمەش کاتێکی زۆری دەوێت بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت لە ئاستیدا هووشیار بێتەوە.
من دەزانم ئەم قوتابخانانە هەموویان بە شێوەیەکی (یاسایی) کراونەتەوە و کاریی خۆیان دەکەن، بەڵام، دەشزانم ئەم یاساییبوونە بەدەر نیە لە جۆرەکانی فڕوفێڵ، گەندەڵیی و چاوبەست لە حکومەت و لە کۆمەڵگا و لە دایکان و باوکان. بەو دیوی تریشدا، دەزام ئەم قوتابخانانە بە هەڵگرتنی پاشناوی ئەو وڵاتانەی خۆیان بەهۆیانەوە ناساندووە: (بەریتانی، ئەمەریکی و نێودەوڵەتی و هتد)، هەم

نوێنەرایەتیەکی خراپی کولتووریی قوتابخانەیی ئەو وڵاتانە دەکەن و هەم وێنەی ئێمەش لەبارەیانەوە بە جۆرێ دەگۆڕن، کە وابزانین پەروەردە و فێرکردن و ڕێکارەکانی بەڕێوەبردنی دامەزراوە پەروەردەییەکانی هەریەک لەو وڵاتانە، بەوجۆرەن کە لێرە نوێنەرایەتی دەکرێن.
ئێمە سەرەتا منداڵەکەمان ناردە قوتابخانەی میدیا، بەڵام کێشەکانمان لەگەڵ قوتابخانەی (شوەیفاتی نێودەوڵەتی) دەستیانپێکرد. ئەمەش نەک لەبەر ئەوەی لە میدیا کێشە نەبوو، بەڵکو هەستمان کرد، کێشەکانی میدیا لەچاو شوەیفاتدا، زۆر کەمتر بوون. لە میدیا کێشەی سەرەکیی نەبوونی شوێن و ژمارەی زۆری قوتابیان و نەبوونی ڕێگاوبانی پێویست بوو بۆ وەستاندنی ئۆتۆمبێل لە کاتی بردن و هێنانەوەی منداڵەکان.. لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا باشەکانی ئەم قوتابخانەیە و پەیوەندیی هەرەباشیان لەگەڵ منداڵەکاندا و بەخێرایی چوونە پێشیان لە وانەکان و زوو فێربوونی زمانەکانی وەک ئینگلیزی، عەرەبی، بەبێ ئەوەی ڕێگریی دروستبێت بۆ بەردەوامیی لە برەودانی زمانیی دایبک..
هەموو شتێک لە سەرەتاوە و لە قوتابخانەی شوەیفاتی نێو دەوڵەتی، وەک مژدەیەکی مەزن دەستیپێکرد، هەرچەندە لە ڕووی ئابوورییەوە گووشارێکی زۆرمان لەسەر بوو،

هەرچەندەش ئەو شێوازەی بەهۆیەوە داوای پارەی سالآنەیان دەکرد، نامۆبوو بە تێگەیشتنی ئێمەی داییک و باوک و تەنیا بەو نامەیەدا کە دەیاننارد، هەستمان دەکرد ئێمەیان لە بیرە. سەرۆکی حکومەت بۆخۆی لە کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە و لە دەرچوونی یەکەمین پۆلی وقوتابییەکانیدا بەشدار و هاندەر بوو بە جەختکردنەوەی لەسەر بەهاکانی وەک خۆشەویستی بۆ وڵات و کوردستان، نەک نرخی مادیی (http://pukmedia.com/KS).
ئێستاش کە وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، دەڵێن: (دەبێت جۆرایەتی لە پێش قازانجەوە بێت)، جگە لە چاوبەستێک هیچیتر ناخەنە ڕوو بۆ پاساوهێنانەوەی ئەو کەمتەرخەمییە یاساییانەی پێشتر لە ئاست ئەمجۆرە قوتابخانە قازانجویستانەدا، چاویان لێپۆشیوە.. ئەو مەرجە دەبوو مەرجیی پێشینەی وەزارەت بێت، نەک مەرجیی پاش ئاشکرابوونی چەندین گەندەڵیی لەم بوارەدا و بەکارهێنان و وتنەوەی بەردەوامی وەک زەنگی ورياکردنەوەی ئەو کۆمپانیا سپۆنسەرانە، بۆ ئەوەی پینەی پەڕپووتی خۆیان بکەن، بەر لە ئابڕووچوونی کۆتایی..
لە ڕاستیدا ئەم دروشمەی ئێستا وەزارەت بەرزی دەکاتەوە، هیچ نیە جگە لە دوایین هاوکاریی خۆی بۆ خاوەن دووکانەکانی ئەم پەڕپووتخانەیەی بەناوی قوتابخانەی

تایبەتییەوە، لە وڵاتی ئێمەدا کراونەتەوە. ئەم درووشمە بەبێ هەڵوەستەی جیدیی و بڕیاریی گرنگ، کە دڵنیام دەبێت سزای یاسایی بەدوادا بێت، تەنیا وەک زەنگیی کاروانێک خۆی دەنوێنێ، کە ئاشکرای دەکات، (ئێمە بەڕێوەین، بەڵام زۆر دوایئەوەی ئێوەی خاوەن قوتابخانە تایبەتیەکان پینەوپەڕۆی یاسایی پەڕپووتییەکانتان دەکەن، دەگەین، بۆ ئەوەی هیچ لامان شەرمەزار نەبین..).
یەکەم شۆک کە لە ئەزموونمان لەگەڵ قوتابخانەی شوەیفاتی نێو دەوڵەتی دووچاری هاتین، ئاشکرابوونی ئەو هەموو توندوتیژییە فیزیکیی و ڕەمزییە بوو کە لەم قوتابخانەیەدا و بەهۆی مامۆستا لە دژی قوتابی و بەڕێوەبەر لە دژی باوکی قوتابی، بەڕێوە دەچوو و کار گەیشتبووە دادگا و سزادنی بەڕێوەبەرەکەی (http://www.payam.tv). هەروەها بە زوویی شۆکی ئەو توندوتیژییە ڕەمزییەشمان هەستپێکرد، کە لەلایەن مامۆستایەکی لوبنانییەوە لە سەر قوتابییەکان پراکتیزە دەکرا. ناوی ئەو مامۆستایە وەک ناوی ئەو زەبەلاحانەی لێهاتبوو، کە جاران لەناو بێشکەدا منداڵیان پێ ژیرکردۆتەوە! من بۆخۆم لە چاودێریمدا بۆ ئەم مامۆستایە، هەرگیز ڕێکەوتیی بینینم نەکرد، بەڵام ئەو لە هەموو شوێنێکی فەنتازیای منداڵەکاندا ئامادەبوو..

قوتابخانەی شوەیفاتی نێو دەوڵەتیی لە هەولێر، بۆخۆی شوێنێکی ئارامبەخش نەبوو، هەر لە دەرگای دەرەوە، لەبەر هۆکاریی ئاساییش، ئەو ڕاستییەت بۆ ڕووندەبۆوە، کە ئەم شوێنە زیاتر لەوەی شوێنێکی پەروەردەیی بێت، شوێنێکی ئەمنیە. بەر دەرگای گەراجەکەشی بەهۆی ڕیزبوونی ئۆتۆمبێلی مەسئوولە باڵاکانەوە، کە بەهۆیانەوە منداڵەکانیان دەهێنران و دەبرانەوە و ڕەچاونەکردنیان بۆ دابەشکردنی شوێنەکە، وەک شوێنێکی ترسناک، ئەو هەستەی دەدایتێ، کە لە شوێنێکی ئاساییدا نیت. میعماریی قوتابخانەکەش لە دامرکاندنەوەی ئەم هەستەدا، کۆمەکیی نەدەکردیت، پرسگەی زۆر، ئامێرەکانی کۆنترۆڵ، پایەی گەورە و قادرمە و دەرگای گەورە و هتد، تێکەڵێک بوو لە جیدییەت و ناپرۆفێشناڵی. دەتزانی لە کوردستانیت، بەس ئەوێ لە کوردستانی دابڕ دەکردیت و بەم پێیەش نەک هەر ناچاربوویت زمانی قسەکردنت بگۆڕیت، بەڵکو دەبوو پاساوێکی ناخەکییش بۆ هەستکردن بە کەمیی و نامۆیی خۆت، بهێنیتەوە، وەک کوردێک.

لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەشدا لەگەڵ یەکەمین کارمەندەکانی ئەم قوتابخانەیە، چ کوردبان، یان بیانی، تەواو تێدەگەیشتیت، کە ئەوانیش نایانەوێ بە زمانی ***لۆکاڵیی*** لەگەڵ دایکان و باوکان بدوێن و شێوازێکی جیدیانە و زۆر

ڕەسمیی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ میوان و ڕێبواران و ئەو کەشە ساردوسڕەی لەوێ حاکم بوو، بەتەواوی ئەوەیان لەلا بەرجەستە دەکردیت، کە ڕوانگەی ئەم شێوازیی ئیدارە و مەقامە، تێڕوانینێکی نزمی هەیە بۆ کۆمەڵگای لۆکاڵی. ئەمەش پێچەوانەی هەر شێوازێکی پەیوەندیی ئیداریانەیە لە دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتیدا.
جارێک، کە بۆ بەدواداچوونی چەند پرسیارێک چووبوومە ئەوێ و لەگەڵ کارمەندێکی خانمی گەنجیی ئەوێدا کەوتمە گفتوگۆ، ئەو زۆر بە وریاییەوە ئەوەی درکاند، کە (ئەم قوتابخانەیە تێڕوانینێکی تایبەتیی هەیە و زۆریش گوێ بۆ بۆچوونی لۆکاڵیی کۆمەڵگای کوردستانی نادات..). ئەو خانمێکی گەنجی هووشیاربوو، ئەو جیاوازییانەی هەستیپیدەکرد و بوونی سترێس و دڵەڕاوکێی بەردەوام لە قوتابخانەکەدا و هتد. ئازاری دەدا، هەرچەندە نەیدەویست وای پیشاندات هیچ نهێنییەکی درکاندووە، بەڵام لە چۆنێتی مامەڵەی ئیداریی قەتابخانەکە، لە نرخی کەلوپەلەکان، وەک جلوبەرگ و تێچووی بۆنەکانی قوتابیان، ناڕازیی بوو.. دوایی لە ڕاپۆرتێکدا ئەوەم بۆ دەرکەوت کە بەشێکی ئەو بۆنانەی لەمجۆرە قوتابخانانە ئەنجام دەدرێن، پارەکەیان لە قوتابیان وەردەرگیرێت و قازانجەکەی بۆ قوتابخانەکە دەبێت (http://www.awene.com/article/2013).

پاش ماوەیەک، کە من بۆ کێشەیەکی تر و بەدواداچوونێکی تر، چوومەوە ئەوێ، ئەو خانمە ساردبوو، وەکئەوەی نەیدەویست بزانرێ لەگەڵ من هیچ جۆرەپەیوەندییەکی پێشینەی هەبووە و قسەوباسێکمان لەسەر قوتابخانەکە کردووە. ئەوەی لەم خانمەوە تێگەیشتم، کە مستەرە لوبنانیەکە، وەک (ترسێنەرێکی) قوتابییەکان داندراوە و کاریگەرییەکی زۆری لەسەر کۆنترۆڵکردنی قوتابییەکان هەیە، کە ئەم کۆنترۆڵکردنە لەسەر بنەمای ترسەوە بوو، لانیکەم لەسەر دەروونی قوتابیە بچووکەکان و ئەوان هەر لەسەرەتاوە دەیانزانی مستەر فلان، مرۆڤێکی ترسناکە.

دامەزراندنی کەسێک لە قوتابخانەیەکدا، بەهەر ناوێکەوە و سوودوەرگرتنی قوتابخانەکە لە زمان و بیچم و شێوازیی ئەم کەسە بۆ ترساندن و تۆقاندن و بەکارهێنانی ئەم ترسە بۆ هەر مەبەستێکی شاراوە، بەدوور بوو لە کەسایەتیی (نێونەتەوەییانە)ی قوتابخانەکە، کە دایک و بابە کوردەکانی پێخەڵەتێنرابوو. ئەمکارە لە دوور و نزیک هیچ پەیوەندییەکی بە پەروەردەی مۆدێرن، بە تێگەیشتنێکی پەروەردەییانە لە مرۆڤ و بە ئامانجی پەروەردەییەوە و بە نیونەتەوەییبوونەوە، نەبوو. ئەمە تەنیا دەیتوانی بیرۆکەیەکی خۆرهەڵاتیانە بێت لەسەر پرانسیپی بڕوابوون بە سزا، کە بەرئەنجامی هەژارییەکی هزرییە لە بواری

پەروەردە و تیگەیشتن لە مرۆڤ. بۆیە (مستەر)، نەک وەک نێرینەیەک، نوێنەرایەتی ئایدیۆلۆژیانە و ڕەگەزیانە و سیستەمیانەی پاشایەکی زاڵمی دەکرد، کە دەبوو هەموو ڕۆژێک (میللەت)ەکەی ئەزموونی ترس و سزا لەسەر دەستەکانی بەشێوەیەکی ڕەمزییش بێت، تاقیبکەنەوە. بەمجۆرەش چوونە قوتابخانە بۆ منداڵەکان وەک ئازارێکی دەروونیی لێدەهات و مستەر وەک خێوێک هەمیشە لە زەینیاندا بوو.

بە پەیسەر ئەمەدا، چەند جارێک ڕاستە و خۆ و ناڕاستەوخۆ ویستم ئەم مستەرە ببینم، بەڵام هیچ بوارێکم بۆ نەڕەخسا. مستەر فلان؟! بە زەردەخەیەکەوە وەلامیان دەدامەوە، وەکئەوەی باسی کەسێک، یان بوونەوەرێکی ئەفسانەیی بکەم، کە لەو پەڕیی ئامادەییدا لە خەیاڵ و هزری منداڵەکاندا، لەواقیعشدا نادیار و شاراوە.

ئەم کەسە فیگەرێک بوو قوتابخانە بەکاریدەهێنا بۆ بیرخستنەوەی بڕوابوون بە توندوتیژی لەو پەڕی ئازادیی و بۆ بیرخستنەوەی ئەو ڕاستییەی کە هەمیشە کەسێک، فیگەرێک، پاشایەک، باوکێک، مامۆستایەک هەیە سزامان دەدات. بەمجۆرەش مستەر ڕۆڵی بەسرووشتیکردنی دەسەڵاتێکی ڕەمزیی لە بواری پەروەردەدا دەبینی. لێرەوە فیگەریی مستەر هەڕەشەیەکی بەردەوام بوو لەسەر خەیاڵی

قوتابییەکان کە هیچکات هیچ بارودۆخێکی ئازاد بەبێ بوونی مەرجەکانی سزا و کۆنترۆڵ وێنا نەکەن.
دواجار کاتێک کە کوڕەکەم بردبوو بۆ سەرتاشخانە، هەر کە لە دەرگاکە چووینە ژوورەوە بۆ شوێنی چاوەڕوانیی، کەسێک لەو کاتەدا دەچووە دەرەوە. کوڕەکەم بە دوو چاوی داپچڕاوەوە گوتی: (بابە ئەوە مستەر بوو!) کاتێک ئاوڕم دایەوە، بوونەوەرە ئەفسانییەکە گەیشتبووە سەر شەقامەکە. لە دواوە ئەوەندەم تێبینیکرد، کە مرۆڤێکی ئاسایی بوو، تی شێرتێکی قاوەیی تەسک لەبەردا و کاوبۆیەک. مرۆڤێکی بەتەواوی مانا ئاسایی، باریک، باڵا مامناوەندی.. (بزانە بابە، هەر سڵاویشی لێنەکردین.. نەمگوت خراپە). پاش چوارساڵیش لە گێڕانەوەی ئەم دیمەنە، هەمان ڕستەی دووبارە کردەوە: (مدیرێکی خراپ بوو، ئەها ئەو جارە لە سەرتاشخانەکەی عەنکاوە هەر سڵاویشی لێنەکردین).
من دەمزانیی کوڕەکەم لە داهاتوودا تێگەیشتنێکی دیکەی دەبێت بۆ خراپبوونی مرۆڤ و سڵاو لێنەکردن وەک خراپی کەسەکان لێکناداتەوە، بەڵام نەمدەتوانی بە ئاسانیش ئەو تێگەیشتنەی لەسەر خراپیی مرۆڤێکی ئاسایی بیر بەرمەوە کە لە ئەنجامی ڕەفتاری ڕۆژانەی کەسەکە خۆیەوە، یان بە هۆی ئەو ئەرکەی پێیسپێردرابوو لە لایەن قوتابخانەکەوە،

تیا دروستببوو. قوتابخانە و کەسەکان بۆ منداڵەکان وەکچۆن پێوەری زانیاریی و ڕاستەقینەی شتەکانن، ئاواش پێوەریی دروستبوونی ئەو بڕوایانەن کە لە لای منداڵەکان دروستیدەکەن، لەوانەش بڕوابوون بە ترس و بە سزا و لەویێشەوە دروستکردن و چاندنی ڕۆحییەتێکی ملکەچ لە منداڵەکاندا کە پێچەوانەی ئامانجە پەروەردەییەکانە.

## پەرپووتی:

پەرپووتی نەبوونی پلانێک ئاشکرا دەکات کە یەکخەریی گوفتار و کردار بێت. تۆ شتێک دەڵێیت و نایکەیت و شتێکیتر دەکەی.. خۆبڵاوکردنەوە، فڕێدانی شتێک لێرە و یەکێ لەوێ، بڵاوکردنەوە و کۆنەکردنەوە، وتنی زۆر و کرداریی کەم، بێ سەرەوبەرەیی، هەڵوەشاوەیی و هەڵڕژاویی لە نیشانەکانی ناسینەوەی پەرپووتین. پەرپووتیی نیشانەی بێ ئامانجی و بێبەرنامەیی و بێ پلانیە. یان لانیکەم نیشانەی ڕاستگۆنەبوونە لەگەڵ ئەو پلان و بەرنامانەی ڕاتگەیاندو و ئەو مژدانەی داوتن و نایانبەیتە سەر.

پەرپووت لەیەک شوێن نیە، لەیەک جێ خۆی بڵاو نەکردۆتەوە، (لە هەزار ئاشی کردووە و یەکێکی نەماڵیوەتەوە)، بۆی گرنگ نیە (قسە هەزار بێ و دوانی

بەکار بێت)، بۆیە مامەڵە کردن لەگەڵ پەرپووت زۆر ئاسان نیە. وەکئەوەی بۆ هەموو شتێک دەبێت لەسەرەتاوە، لە (ئەلف)ەوە لەگەڵیدا دەستپێبکەیتەوە.. پەرپووت لە ڕاگەیاندن و ڕێکلامکردنێکی بەهێز و لە ئیدارە و شێوازێکی وێراندا خۆی بەرجەستە دەکات.

ناوبردنی قوتابخانە هەرە (نمونەیی) و (بێ ڕکابەرەکان)ی سوودخوازیی تایبەت لە هەرێمی کوردستاندا، بە (پەرپووت) لەو تێگەشتنەوە هاتووە، کە لەناو تۆکمەترین، ڕێک و پێکترین، ستانداردترین، نێونەتەوەیی ترین، ئەکادیمیکترین، زانستیترین، بەشی سیستەمەکانیشدا پەرپووتی، ناڕێکی، دژوازیی و بەربەرەڵایی هەیە (بەختیار عەلی: جوانییەکانی ناڕێکی).

بە پەیسەر ئەمانەدا و کاتێک نامەیەکمان لە قوتابخانەی شوەیفاتەوە پێگەیشت، کە تیایدا باسی بەشداریی قوتابیەکانیان کردبوو لە ئاهەنگێکی تایبەتدا، بڕیارمدا ڕووبەڕوو بەڕێوەبەرەکەی ببینم. ئەمەش ڕێکەوتی نوڤێمبەری ساڵی ٢٠١٠ی کرد. بەیانییەکیان پاش کەمێک چاوەڕوانیی خانمێکی کەمێک ڕەشپێستم بینی بەناوی (دکتۆر حومەیرا بوخاری)، کە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو. لەو دانیشتنەدا باسی ناوەڕۆکی نامەکەمان کرد، کە تیایدا نووسرابوو:

*(منداڵەکەت خۆی بۆ بەشدارییکردن لە کۆنسێرتەکەدا تۆمار کردووە. لەبەر ئەوە منداڵەکەت دەبێت ئەو کراسە لەبەر بکات کە ئامادەکراوە بۆ کۆنسێرتەکە. نرخی هەر جلکێک لەم بابەتە، دەکاتە ٥٠ هەزار دیناری عێراقی. لەپاش بۆنەکە منداڵەکەت بۆی هەیە ئەم جلکە بۆخۆی گلبداتەوە. ئەگەر تۆش لەمەدا هاورای و حەز ئەکەی مداڵەکەت لەم بۆنەیەدا بەشداریی بکات، دەبێت ئەم زانیاریانەی خوارەوە پڕ بکەیتەوە و واژووی بکەیت و بیدەیتەوە بە خاتوو... )*
لە کۆتاییی نامەکەشدا نووسرابوو: *(دوا وادە بۆ پارەدان بریتیە لە ٩ی دیسەمبەری ٢٠١٠).*

خاتوونە بەڕێوەبەر، بە هێمنی و پاش گفتوگۆیەکی زۆر و هەوڵدانی جیدیی بۆ خۆ پەڕاندنەوە لە ناوەڕۆکی نامەکە و پەیامەکەی ناوی، ڕاشکاوانە ددانی بە هەڵەیەکدا نا و گفتی ئەوەیدا هەڵەکە ڕاستبکرێتەوە. جۆرێک لە مانوپۆلاشیۆن (فۆرخکاری)، ناچارکردن و لەسەر کردنە ماڵ لە پەیامەکەدا هەبوو. مەبلەغێ پارەیان لێبەردەدایتەوە تا ناچاریانە بیدەی بە شتێک، کە هەڵبژادنی خۆت نەبوو. بنەمای نامەکە لەسەر ڕەتکردنەوەی پرانسیپی ئازادیی بوو: بەزۆر پێکڕینێک لە پەیامەکەدا هەیە، کە ئەگەر دایک و باوک ئازاد بن و لەسەریان نەکرێتە ناچاری و نەخرێنە نێوان دوو بەرداشەوە، دەکرا پێویستیی دیکەی منداڵەکەیانی پێ پڕ بکەنەوە. لە پەیامەکەدا سوودێکیی زۆر لە شەرمنیی خۆرهەلاتیانەی داییک و باوک بۆ مەسەلەی پارە، وەرگیرابوو. لە خۆرهەلاتدا دایک و باوک هەرچەندەش

نەبوو، دەستکورت بن، هێشتا بۆ ڕەزامەندیکردن لەسەر بەخشینی پارە بۆ منداڵەکانیان، ناڵێن نا. ئەم مەسەلەیە ئەوان دەخاتە بەردەم لۆمە و پێشگر و پاشگریی ڕەزیلبوون کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ناوبانگێکی خۆش نیە و تاڕادەیەک ئابڕووبەرانەیە..

لە ڕوانگەی ئابووریی خێزانیی و بەرنامەی خێزانیی و پەروەردەییەوە، هیچ شتێکی مادیی، وەک خەرجکردنی ئامانجدارانەی پارە، ناچێتە چوارچێوەی ناووناتۆرە کۆمەڵایەتیەکانەوە. خێزانێک بڕیار دەدەن چۆن پارەکانیان بەکار بهێنن و بۆچی. ئەمە دەچێتە چێوەی سیاسەتی بەڕێوەبردنی خێزان و بەرنامەیەکی پەروەردەیەوە تا لەوێوە منداڵ بەشداریی پێبکرێت لە پاشەکەوت و ئامانجدارانە مەسرەفی دەستکەوتەکانی. ئەمە وا دەکات منداڵ لە زووەوە بەرنامە دابنێت و هەوڵبدات و لەبیری داهاتوودا بێت. بۆیە هەرچەندە ئەو مەبلەغەی قوتابخانە داوای دەکرد، لەو کاتەی گوزەرانی هەرێمدا (٢٠١٠) و بەرەودوا، زۆر نەبوو، وەلێ لە ڕوانگەی سیاسەتی خۆبەڕێوەبردنی خێزانییەوە، وەک بەفیڕۆدان وابوو، بەتایبەتی کە بۆنەکە چوون بۆ مۆزەخانەی لۆڤەر، یان تەیت گالێری لەندەن نەبوو.. ئێمە بە بیرکردنەوە لەوەی هەم پێویستە لە دەرەوەی دەوام کەشێکی خۆش بۆ

منداڵەکەمان بسازێنین، کە لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەسەری ببات، بڕیاری کڕینی جلکوبەرگە تایبەتییەکەمان دا، بەڵام دەمانەویست بە جیدیش بەدوایدا وێڵ بین.
ئەوەی لە دانیشتنەکەدا لەگەڵ بەڕێوەبەر ڕوویدا، هەم سەرکەوتنی باوکێکی بێدەسەڵاتبوو لەناوەندیی سیستەمێکی تایبەتیزەبوودا کە پرانسیپی پارە و قازانج لەسەرووی مافی منداڵ و دایک و باوکانەوە بوو. هەم ڕەواندنەوەیەکی کاتیی بەشێکی ئەو وێناکردنەش بوو بۆ ئەمجۆرە قوتابخانانە، کە کۆلۆنیاڵیزمیان بیر دەخستینەوە. بۆیە بە دڵخۆشییەوە چاوەڕوانیی نامەیەکی دیکەمان کرد، کە دەبوو تیایدا ئەو هەڵەیە ڕاستبکرێتەوە. بەڵام ڕێک لە ٥ی دیسەمبەری هەمان ساڵدا، نامەیەکمان پێگەیشت، کە تیایدا هەمان پەیام و ناوەڕۆک وەکخۆی دووبارە کرابۆوە.
ناوەڕۆکیی هەردوو نامەکە مەترسیدار و دوور بوو لە پەیام و نیازیی پەروەردەییەوە. بۆیە نامەیەکم بۆ بەڕێوەبەرەکە نووسی و بۆچوونی خۆمم بۆ دەربڕی. کە ئەمە بەشێکی گرنگیی نامەکەیە کە بە ئیمەیڵ ناردوومە:

(بۆ قوتابخانەی شوەیفاتی نێودەوڵەتی، لە هەولێر
٨ی دیسامبەری ٢٠١٠
بەڕێز د. بوخاری،

دوای ئەوەی لە نۆڤێمبەری ٢٠١٠ یەکترمان بینی و لەبارەی کۆنسێرتەکە و ئەو پارەیەی خراوەتە سەر ئەستۆی دایکان و باوکان، قسەمان کرد، جوان بەبیرم دێت کە ئێوە لەو دانیشتنەدا وتتان، ئەو وشانەی نامەکەی پێنووسراوە بۆ دایکان و باوکان هەڵەن. بەڵام ئەوەتا من هەمان نامەم بەهەمان ئەو وشانە بۆ هاتۆتەوە. (دەقی نامەکەم بۆی داناوەتەوە).

بەلای منەوە، ئەمەی ئێوە دەیکەن قۆرخکاریی (مانوپۆلاشێون)ێکی تەواوە بەسەر دایکان و باوکانەوە، کە شیاوی قەبوولکردن نیە.

ئێوە چاوەڕوانیی منداڵەکان دەبەنە سەرێ و دایکان و باوکانیش ناچار دەکەن بۆ پارەدان. من دڵنیاشم لەوەی ئێوە دەزانن کە هەموو دایکان و باوکانێک کە منداڵیان لە قوتابخانەکەی ئێوەن، هەمان دەرامەتیان نیە. من لە بنەمادا هاوڕا نیم لەگەڵ ئەم شێوازەی ئێوەدا. زۆر ئاشکرایە، ئەگەر باوانێک نەیانتوانی پارەکە بدەن، منداڵەکەیان نابێت بەشداربێت. باشە ئەی ئێوە چیی دەکەن بۆ لایەنی مێنتاڵیی و خوێندنی منداڵەکە.

زۆر گرنگە و پێویستە ئێوە ئەم جۆری داواکارییە بگۆڕن: بەشداربوونەکە لە پارەدان ئازاد بێت و ئەوەی دەیەوێت هاوکار بێت، بەڵام پێویستە هەموو منداڵەکان بەشداریی کۆنسێرتەکە بکەن. من دڵنیام تۆ لەم مەسەلەیەدا لەگەڵ بۆچوونەکەی مندایت و هیوادارم بڕیارێکی ڕازییکەریی لەبارەوە بدەن. من بۆخۆم بەدوای ئەم باسەدا دەچم، چەندی بوێت.

لەگەڵ ڕێزمدا

ڕێبوار سیوەیلی)

پەستییەک بە نامەکەی منەوە دیارە، بەڵام ڕەخنەیەکی جیدیشم هەیە لەم قۆرخکارییە، کە پێویستە بە پێشنیاری پەروەردەیی و ئاکاریانە ڕاستبکرێتەوە.

سیاسەتی ئەم قوتابخانە تایبەتیانە قازانج و پارەدەرهێنانە لەسەر حسابی بیرۆکەی سەرنجڕاکێش بۆ قوتابییەکان و سەپاندنی ئابووریی بەسەر باواندا. چەندە ئەم بیرۆکانە سەرنجڕاکێش و لە هەمان کاتیشدا پێگەیەنەر و پەروەردەکەرن، ئەوە جێی گفتوگۆیە و پێویستە وەزارەت لەمەشدا مەرجی خۆی هەبێت ئاخۆ کۆی ئەو چالاکییانەی لە دەروونی ئەو جۆرە دامەزراوانەیەدا دەکرێت، چەندە پەروەردەیی و زانستین و بەشێکن لە ئەو هەنگاوانەی پێویستە لەو دامەزراوەیەدا بنرێن، کە لەگەڵ ئامانجە پەروەردەییەکەدا وێکدێنەوە و لەگەڵ یاسادا دژواز نابنەوە.
لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە دایکان و باوکان پێویستە خوێندنەوەیان بۆ ڕەهەندە قۆرخکەرەکەی ئەو پەیامانە هەبێت، کە لەم قوتابخانانەوە بۆیان دێن. لە نمونەی کۆنسێرتەکەدا، قوتابخانە دەیتوانی یەکەمجار کۆبوونەوە لەگەڵ دایکان و باوکان بکات و ئامانجی چالاکییەکەیان بۆ ڕوونبکاتەوە، نەک لە سەرەتاوە قوتابییەکان ئیغرا بکات و چاوەڕوانییان بباتە سەریَ بۆ ئەوەی ئەم دۆخە وەک ئامرازێک بۆ ئامانجە ئابوورییەکە بەکار بهێنرێت..
ڕاستە من سەرکەوتنێکی سەمبولیکیانەم بە دەستهێنا، بەڵام قوتابخانەکە لە وەرگرتنی پارەکەدا منی بەزاند. ئەمە تەواوی لۆژیکی سەرمایەداریانەیە: (ئامانجەکەت لەبیر

نەچێت، هۆکارەکەش بدۆزەوە. سووربە لەسەر ئامانجە ئابوورییەکەت، بەڵام داوای لێبووردنیش لە شێوازەکەت بکە). من کەوتمە ژێر فشاری چاوەڕوانیی منداڵەکەمەوە و پارەکەییم دا و بڕواشم پێی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بە ئیمەیڵێک دووبارە دانی بە هەڵەکەیاندا نایەوە و داوای لێبوردنی کرد. من ئیمەیڵەکەی وەکخۆی دەخەمە پێشچاو، بۆ ئەوەی لە میانەیدا ئەو لۆژیکە پتر بناسینەوە، کە لە پشتییەوە ویستێکی زۆر بۆ قازانج و سامان و سووربوون لە ئارادایە:

(بەڕێز سیوەیلیی ئازیز،

لەگەڵ تێڕادیتنێکی زۆرمدا، ناچارم جارێکی تریش داوای لێبووردنت لێبکەم سەبارەت بەو شێوازە هەڵەیەی داڕشتنی نامەکەمان. بەڕێوەبەری نوسینگەکە لە جیاتی داڕشتنی نامە نوێیەکە، کۆنەکەی پرێنت کردۆتەوە. لەبەر ئەوە بەڕاستی پێمناخۆشە ئەم هەڵەیە ڕوویداوە. زۆریش هیوام وایە ئەم داوای لێبووردنە پەسەند بکەیت.

سەبارەت بە نیگەرانییەکانت لەبارەی ئەو پەنجا هەزار دینارەی دەبێت لەجیاتی تێچووی جلوبەرگی هەر منداڵێک بدرێت، کە دەیەوێ بەشداریی کۆنسێرتەکە بکات، ئێمە مشومڕێکی زۆرمان کرد. ئەو کاتیش من بۆ ئێوەم ڕوونکردەوە، کە بەشدارییکردن لە کۆنسێرتەکەدا، ئازادانەیە و ناچارەکیی نیە. قوتابخاکە زۆر چالاکیی لەدوای دەوام دەکات، کە هەموویان بە ویست و ئارەزوون. باوان و قوتابیەکان ئازادن لەوەی بەشدارییان تێدا بکەن. کاتێک ئەوان بڕیاری خۆیان دەدەن، بەمانای ئەوەیە کە باوانەکان پشتیگریی چالاکییەکە دەکەن..

کۆنسێرتەکەش بەهەمان شێوە ئیختیاریانەیە و قوتابییەکان دوای ڕێگەپێدانی باوانیان، دەتوانن بەشداریی تێدا بکەن، ئەگەر خۆیان حەزیان کرد. ئێمە هیوادارین هەمووان بەشداریی بکەن، بەڵام ئێمە ناتوانین دایکان و باوکان ناچار بکەین و شتی وەهاش ناکەین. هەروەها هیچ چاوەڕوانییەکیشمان لای منداڵەکان دروستنەکردووە، کە وا بیر بکەنەوە دەبێت بە ناچاریی بەشداریی بکەن. بەشدارییکردن بەستراوە بە ئیزنی باوان و بڕیاردانیانەوە. هەموو ساڵێک چەندین قوتابیی، باری ئابوورییان هەر چۆنێک بێت، بەشداریی ناکەن و ئێمەش ڕێز لە بڕیاریی دایکان و باوکان دەگرین. هیوادارم لەگەڵمان بەردەوام بیت و هاوبەشمان کەیت لە خەم و چاوەڕوانییەکانتدا.

سڵاوی گەرم

د. هومەیرا بوخاری

بەڕێوەبەر

**Dr.Humaira Bokhari**
Director
**International School of Choueifat_Erbil**
**Tel** 964-66-257-0092 (ext. 1056) mobile +964-750-416-4227
)**https://www.iscerbil-sabis.net**

ئەمە وەڵامی بەڕێوەبەرەکەیە. تۆ چیی لە نامەکەدا دەبینیت، ئازادیت. پەیامی نامەکەش ڕوونە. من بۆخۆم نییەتخراپی تێدا نابینمەوە. بەڕێوبەرەکە دەیەوێت پەیامەکەی بگات و پەیوەندییەکە ئەوپەڕی شەففاف بکات. شێوازەکەی دەگۆڕێت و جوانتریی دەکات، هۆکاری هەڵەکە بۆ ڕەهەندێکی تەکنیکی لەلایەن سکرتێرەکەیەوە، دەگێڕێتەوە،

بەڵام بەرگریی لە خودی هەڵەکە دەکات و هێشتا سووریشە لەسەر ناوەڕۆکیی پەیامەکەی. بازاڕیی ئازاد لە پشت لۆژیکی ئەم پەیامەوەیە. ئەوەی دەکرێت و کراوە، لە سایەی ئازادی و هەڵبژاردن و ئیختیاردا دەکرێت. نایاساییش نیە. قوتابخانە (بۆنە) دروستدەکات بۆ (خۆشیی قوتابییەکان) و بۆ پەیداکردنی پارە. کەس ناچار ناکرێت، بواری بەشدارنەبوون کراوەیە و ئەمەش پەیوەندیی بە بڕیاری دایکان و باوانەوە هەیە.

وەڵامەکە دوو دیوی هەیە: وەڵامە بۆ وشەکانی ناو نامەکەی من، بەڵام بەلای ماناکەیاندا ناچێت. من دەڵێم ئەمە قۆرخکارییە، ئەو دەنووسێت هەموو ئازادن. من لە ناخی منداڵەکەوە قسە دەکەم کە مەیلی بزوێنراوە و قوتابخانە ڕاپێچیکردووەتە ناو خەیاڵ و خەونێکەوە، کە ئامانج تیایدا خەیاڵ و خەون نیە. من دەڵێم پێویستە پێشئەوەی منداڵەکە ئیغرا بکرێت، لەگەڵ دایکان و باوکان ڕاوێژ بکرێت و پێکەوە بگەنە بڕیاری جۆری چالاکییەکان، ئەو دەنووسێت: دایکان و باوکان دەتوانن بڕیاری بدەن کە منداڵەکە بەشداریی نەکات.. لە هەموو ئەم دۆخانەدا ئازادیی ون و نادیارە. ئەمەش لە دامەزراوەیەکی پەروەردەییەوە چاوەڕواننەکراوە. گوێنەدان و گوێنەگرتن و بەشداریی

پێنەکردنی دایکان و باوکان بەشێکی مەترسیداریی ئەم قوتابخانە بەناو نێونەتەوەییانەیە.
بەڕاستیی من زۆر شت لە سەر ئەم قوتابخانانەم نەزانی و زۆر شتیش هەیە لەسەر قوتابخانەکانی دی ناتوانم بیزانم، جگە لەوەی کە منداڵەکەم باسیدەکرد و باسیدەکەن.. شتیش هەیە دەیزانم و بەڵگەش هەیە و باسی ناکەم. چونکە نییەتم داخستن و بەدناوکردنی قوتابخانەکان نیە، ئەوەندەی پرسیار و گەڕانە بەدوای وەڵامدا. ئێمە لە وڵاتێکی فرە کولتوور و جیاوازیی قەبووڵکەردا دەژین و ئەمەش مایەی شانازییمانە. ئەم قوتابخانانەش لەلایەن وەزارەت و سەرۆکی حکومەتەکەمانەوە گرنگیی زۆریان پێدراوە و ئەمەش لە جێی خۆیەتی. بەڵام هەر ئەو گرنگیپێدان و ڕووتێکردنەش هاندەرە بۆ ئەوەی وەک دایک و باوک چاوەڕوانیمان زۆر بێت و بمانەوێت بەشداربین لە ڕاستکردنەوەی کەموکوڕییەکاندا. دەستنڕانەگەیشتن بە زانیاریی چۆنێتی ژیان لەناو قوتابخانەدا کێشەیەکی گەورەیە بۆ دایکان و باوکان چونکە ناتوانن دڵنیایی تەواو لەسەر سەلامەتی منداڵەکانیان بەدەست بهێنن. من دەزانم منداڵی پۆلەکانی سەرەوە لە ڕێزی وەستانی کافتاریا و لە گۆڕەپان و کاتی وەرزش و یاریکردندا، پاڵنان و سەرەبڕی و پیاکێشانێکی زۆر هەیە. دەزانم ئەوانەی لە کافتریا پارە

وەردەگرن و دەفرۆشن، وەک پێویست میهرەبان و بە سەبر نین لەگەڵ منداڵە وردەکان.. دەزانم لە کافتریان و شوێنی یاریی خستنەخوارەوە و پیاکێشان و کورسی داگیرکردن و گوشارهێنانی هەندێ قوتابی بۆسەر هەندێکیتر و پاشقول لێدان و گاڵتەپێکردن و هەیە. ئەمەش لە زۆرینەی قوتابخانەکان هەیە و پەیوەندیشی هەیە بە کەوسایەتی و تەمەنی هەرزەیی و مێردمنداڵیی قوتابییەکانەوە.. دەزانم وشەی ناشیرین و نەشیاو، کەرامەتشکێن زۆرە و بەکار دێن.. دەزانم مامۆستاکان قیژە و هاوار و توورەبوون و کاغەز دڕاندنیان هەیە و زۆریش بەسەر قوتابییەکاندا چ لە ناو پۆل و چ لە گۆڕەپانی قوتابخانە هاتوهاوار دەکەن. زۆربەی کاتیش ستافی قوتابخانە ڕێکاریی پێویست ناگرنە بەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و هاوکاریی منداڵەکان کە ماڵەوە پەروەردەیەکی نەرم کراون و لەناو ئەو توندوتیژییەی قوتابخانەدا ناتوانن وەک پێویست بەرگریی لە خۆیان بکەن. هەموو ئەمانە پێمان دەڵێن ڕۆحێکی گرژ لەناو قوتابخانە و لە پەیوەندییەکاندا باڵا دەستە.. ئەم ڕۆحە لە کوێوە دێت؟ کێ سنووری بۆ دادەنێت، وەزارەت لەمبارەیەوە چی هەیە و سنووری دەسەڵاتی لەکوێیە.. قوتابخانەی تایبەت و

خاوەنەکەی چۆن بەرگریی لە خۆی دەکات و ئەگەر دایک و باوکان شکاتیان هەبوو پەنا بۆ کێ بەرن؟!

## کەمتەرخەمی دایکان و باوکان:

بەڵێ قوتابییەکان شتی زانستیی فێر دەبن، دەزانم زمانەکان باشتر لە ئێمە فێر دەبن. دەزانم فێری هەندێ پلاندانان و ئەتەکییەتی غەیرە خۆرهەڵاتیی دەبن، فێری سوپاس و بێزەحمەت و داوای لێبوردن دەکرێن.. کتێبەکانیان باشن و مامۆستای پرۆفێشناڵ و کارامە و شارەزا یە و هتد.. بەڵام هەموو ئەو شتانەی دیکەش بە ئاشکرا و شاراوەیی لەو قوتابخانانەدا هەن و ئێمە نایبیستین.. مافی خۆشمانە بزانین و بەشدار بین و ئاگادار بین. دایکان و باوکان ناهووشیارانە لەگەڵ ئەم قوتابخانانە مامەڵە دەکەن. خۆنواندنیان و ڕیزکردنی سەیارەکانیان لەبەردەم قوتابخانەکاندا و فیزلێدانیان لەبەر چاوی یەکتر و قسەکردنیان بە زمانی بیانی لەگەڵ یەکتر و پۆزلێدانیان لە کاتی کۆبوونەوەکاندا لە ئاست دایکان و باوکانیتر و خۆبچووککردنەوەیان لە ئاست ستافی بیانیی قوتابخانەدا، لە تایبەتمەندییەکانی ئەوانن. ئەوان خەم و پرسیار لەگەڵ یەکتر ناگۆڕنەوە، لەبارەی منداڵەکانیانەوە قسە ناکەن. تێبینی ناکەن و بێدەنگن و هیچ پەیوەندیی و نێتۆرکێکیان

نییه. ئەمەش بۆشاییەکی گەورەی دروستکردووە و ئەوەی کە خراپ و ناپەروەردەییە لەو بۆشاییەدا ڕوو دەدات..

دایکوباوکانی کورد چ ئەوانەی لە هەرێم ژیاون و چ ئەوانەی لە دەرەوە گەڕاونەتەوە و پەنایان بۆ ئەم قوتابخانانە بردووە، کێشەی هاوبەشیان زۆرە کە پێویستە قسەی لەبارەوە بکەن. پێویستە گوشار دروستبکەن و لە هەلومەرجەکان بپرسنەوە و بەشێک بن لە ئەنجومەنێکی پرسوڕا لەبارەی منداڵەکانیانەوە لە قوتابخانە. پێویستە ئەوان داوای پەیوەندیی بەهێزتری قوتابخانە و دایکان و باوکان بکەن و خۆیان بکەن بەشێک لە چارەسەر نەک بە پاسیڤی دابنشین و پێیانوابێت بەوەی پارەی منداڵەکانیان داوە، هیچ ئەرکێکی دیکەیان لەسەر نیە.

ئەو جلکەی دەبوو قوتابییەکان لە بۆنەکەی شوەیفاتدا لەبەری بکەن، نەیدەکردە سێ مەتر پارچە. بەرگدروویەکی ناوخۆ کارەکەی دەکرد و باڵای قوتابییەکانیش بەشێوەیەک نەبوو، مەسرەف لەم کراسە تایبەتە بچێت. پەنجا هەزار دینار، پاساوی ئەو کاڵایە نەبوو کە قوتابخانە بە ئێمەی دایکان و باوکانی دەفرۆشت. ئەمەش کێشەکە نیە، کێشەکە ئەوەیە کە قوتابخانە دەتوانێت ئاراستەی زیهنی و زەوقی و ڕەفتاریی قوتابی بکات. منداڵەکان بووروژێنێت و هانیان بدات بۆ بەشدارییکردن لەو بۆنانەدا کە ڕەهەندیی

پەروەردەییان لاوازە. بەڵام بۆ قوتابخانەی تایبەت سەرچاوەی دەرامەتن.
بەخشینی پەنجا هەزار دینار بۆ دایکان و باوکان لە پێناوی ئەزموونێکی خۆش بۆ منداڵەکەیان لەو ساڵانەی باریی ئابووریی هەرێمی کوردستاندا، هیچ نەبوو، بەڵام ئەگەر قوتابخانەکە تەنیا ٧٠٠ قوتابی تێدا بوایە، ئەو بڕە پارەیە دەیکردە زۆر بەبەراوورد بەو سەعات و نیوەی قوتابخانە هۆڵێکی خۆی دەخستە خزمەت بۆنەکەوە.
بەو لای دیکەدا من حەزم دەکرد ئەو بڕە پارەیە بە جۆری دیکەش سوودی لێوەربگیرێت: بەشێکی کەمی بۆ سندوقێکی یارمەتیدان بێت و منداڵەکان بۆ خۆیان ئەم بڕە پارەیە دەستنیشان بکەن و بیخەنە سندووقەکەوە. بەشێکیشی ڕاستەوخۆ بۆ بۆنەکە و چێژیی قوتابییەکان بێت و کەمێکیشی بکرێتە پاشەکەوت.. منداڵ زوو فێری هاوکاریی دەبێت و دەیەوێت هاوکار و بەشدار بێت. ئەمەش بۆ کەسایەتی خۆی باشە. بەشدارییکردنی منداڵ لە سندووقێکی یارمەتیی گرنگی پەروەردەیی خۆی هەیە، کە هەم منداڵەکە فێری کۆمەک دەکات و هەم ئەو کەس و گرووپە کۆمەڵایەتیانە دەناسێت کە کۆمەکی پێکردوون و هەم فێری پلاندانان و بڕیاردانیش دەبێت، لەوانەش بڕیاری چۆنێتی خەرجکردنی پارەکانی. وێڕای ئەمانەش منداڵ

لەمەوە فێری بەڕێوەبردنی دارایی خۆی دەبێت و پلانیی بۆ دادەنێت. وەلێ بردنی منداڵ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و پاسیڤانە و ناچالاک بۆ بۆنەیەکی لەو جۆرە، تەنیا یەک خۆشیی کاتیانەی پێدەبەخشێت، کە بەتەواوبوونی بۆنەکە ئەو خۆشییەش تەواو دەبێت، یان زۆر کەم دەمێنێتەوە.

بۆنەکان گرنگن، بەتایبەتی لە قوتابخانەدا، گرنگتر ئەو بۆنانەن کە قوتابییەکان بەرهەمی خۆیان پیشانبدەن و بیانگۆڕنەوە و بیانفرۆشن، یان لە مۆزەخانەی قوتابخانەدا نومایش بکرێن.. ئەمە هاندان و بیناکردنیانە تا لە چێژی کار و متمانە بەخۆکردن تێبگەن. وەلێ بۆنەی نومایشیی و کاتبەسەربردن، نیشانەی لاوازیی سیاسەتی کۆمەڵایەتیی و کولتووریی قوتابخانەیە. ئەو قوتابخانانەی بۆنەی گشتیی زۆر دەسازێنن، هەم قوتابیی پاساو دەکەن و هەم دەیکەنە بوونەوەرێکی مشەخۆر و حازرویست. ڕەهەندی کۆمەڵایەتیی قوتابخانە و منداڵ، قوتابخانە و خێزان بە سیاسەتێکی دیکە پتەو دەبێت، کە پێویستە تیایدا ڕێژەی بەشداریی لایەنەکان بۆ هەمان ئامانج دەستنیشانکراو بێت و ئەو ئامانجەش پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیی بێت. ئێمە بەهۆی کڕینی کراسێکەوە بۆ بۆنەیەکی تایبەت، منداڵەکەمان نە پەروەردە دەکەین و نە دەیکەینە کەسێکی کۆمەڵایەتی. بەڵکو ئەوە چالاکییە کۆمەڵایەتیی و پێکەوەییەکانن، کە

ئامانجی هاوبەش لە بیرکردنەوەماندا دەچەسپێنن و دەمانکەنە مرۆڤێکی کۆمەڵایەتیی و یەکتریی ویست.
قوتابخانەی شوەیفات، بە درێژایی ژیانی خۆی بەدەست نەبوونی کولتوورێکی کۆمەڵاییەتی پتەوەوە دەیناڵاند و دەناڵێنێت. ئەمەش ئەو قوتابخانەیەی کردە قوتابخانەیەکی سنۆبیست و درزێکی خستە ناو قوتابییەکان و تێڕوانینانەوە بۆ کۆمەڵگای لۆکاڵی. لە خۆتێکەیشتینیانی گۆڕی و کەسایەتیانی وشک کردەوە. ئەم قوتابخانەیە و قوتابخانەی (ئیشق) و (قوتابخانەی بەریتانی)یش هەمان تێبینییان بەسەردا دەسەپێت. وتارەکەی سەرۆکی حکومەت لە ڕێوڕەسمی دەرچوونی قوتابیەکاندا بەڵگەیە لەسەر ئەو هەستەی کە ئەم قوتابخانانە و قوتابیەکانیان دەبێت کوردستانی بن و ئیلتیزامی نەتەوەییان هەبێت. ئەو ڕوو دەکاتە قوتابیەکان و باسی کوردستانیان بۆ دەکات و داوایان لێدەکات خزمەتی پێبکەن. ئەم جۆرە دامەزراوانە لە ناخدا و بە کاوە خۆ، بە نهێنی و بێ ڕاگەیاندن ئینتیمای لۆکاڵیانەی منداڵەکان بە زێد و کولتوور و دابی کۆمەڵایەتیی خۆیانەوە دەگۆڕن و هێدی هێدی منداڵ وا لێدەکەن وەک غەیرە کورد بیر لە خۆی بکاتەوە. (ئیشق) منداڵ بە جۆرێکی تایبەت ئیسلامیزە دەکات و ئاگاییەکی تورکیاویستی بۆ بەرهەمدەهێنێت. شوەیفات، لە منداڵ

ئیگۆیستێکی لوتبەرز و باڵاخواز بەرهەمدەهێنێت کە توانایی پێکەوە دانیشتن لەناو هەمان پاسیدا لەگەڵ هاوڕێکەی لێدەستێنێتەوە و قوتابخانەی بەریتانی تێکەڵێک لە توندوتیژیی و بەربەرەڵلایی و دیسیپلین..

ئەو پاسەی هاتوچۆی بە قوتابییەکان دەکرد، نمونەیەکی خراپی لەسەر کۆمەڵگا بە قوتابیەکان دەدا. شۆفێرەکەی توندڕەوانە ڕەفتاریی دەکرد و ئەو خاتوونە چاودێرەش کە بەیانیان لەناو پاسەکەدا دەبوو ئاگاداری لەمنداڵەکان بێت، یەک وشەی کوردیی و ئینگلیزیی نەدەزانی و تەنیا بە عەرەبی قسەی دەکرد و زۆربەی کات بە مۆبایلەکەیەوە سەرقاڵ بوو. ناوپاسەکە لە هاویناندا گەرم و لە زستاناندا گەرمتر و بۆنێکی تایبەت و ناخۆشیی لێدەهات. خێرایی لێخووڕین و لادانی کاتیی و نایاسایی بەشێکی جیانەکراوەی بوونی ئەم پاسانە بوو لەسەر شەقام. بوونی هەندێ قوتابیی بڕیاردەر و .دۆمینێنت لەناو پاسەکەدا کەشێکی توندوندوتیژاویان دەخولقاند. قوتابییەکان هەمیشە کێشەیان هەبوو لە پاسەکەدا و زۆربەی ڕۆژەکان ئێمەی دایک و باوکان گوێبیستی ئەو چیرۆکانە بووین، کە لەناو پاسەکەدا باسیان لە ئاژاوەی ناو پاسەکانی قوتابییان دەکرد.

## گۆڕینی قوتابخانه به قوتابخانه‌یه‌كی دیكه:

توێژینه‌وه جیهانییه‌كان له‌باره‌ی (قوتابخانه‌ی باش)ه‌وه، وه‌سفه‌كانی وه‌ك (تایبه‌تیبوون)، (نێوده‌وڵه‌تیبوون) و (ئینگلیزیی) و (فه‌ره‌نسیی) و (ئه‌مه‌ریكیی)بوون، ناكه‌نه پێوه‌ر بۆ ئه‌وه‌ی سیفه‌تی (باش) بده‌نه پاڵ قوتابخانه‌كان. ئه‌وه‌ی قوتابخانه‌یه‌ك باش ده‌كات، ئه‌و پێشگر و پاشگره نیه كه پێوه‌ی ده‌لكێنرێت. له هه‌رێمی كوردستان ڕوانگه‌یه‌كی هه‌ڵه بۆ ئه‌م مه‌سه‌له‌یه دروستبووه، كه وه‌زاره‌تی په‌روه‌رده‌ش نه‌یكردۆته خه‌مێكی خۆی: باشیی قوتابخانه ده‌به‌سترێته‌وه به‌و پاشگره‌ی قوتابخانه‌كه هه‌ڵگریه‌تی. ئه‌م تێگه‌یشتنه له خۆیدا هه‌ڵگریی كه‌لێنێكی یاساییه و ئه‌وه‌ی له‌م كه‌لێنه‌شه‌وه دیسانه‌وه هاتۆته‌وه ژووره‌وه، ئه‌و پێشینه كۆلۆنیاڵیسته‌یه كه هه‌میشه كاڵای ده‌ره‌وه، به تایبه‌تی (ئه‌ورۆ-ئه‌مه‌ریكی)مان به نرخێكی گران پێده‌فرۆشێته‌وه.

ڕۆحی خۆ به‌كه‌مزانی و خۆبچووككردنه‌وه، هه‌میشه خۆی ده‌خاته‌وه خزمه‌ت بونیاده زه‌ینییه ئاماده‌كه‌ی كۆلۆنیاڵیزم و ڕوانگه‌ی ئێمه بۆ هه‌ر شتێك پاشگر و پێشگری (ئه‌وروپی)، (ئه‌مه‌ریكی)، له ئێستاشدا و له بواری هه‌ندێ كه‌لوپه‌لدا پاشگری (توركی)، له‌سه‌ر بێت، خۆی كۆلۆنیاڵیزه ده‌كاته‌وه. پێده‌چێت ئه‌م بونیاده زه‌ینیه بوبێته به‌شێك له نه‌ستێكی

هاوبەش و هەرکات کاڵایەک، بیرۆکەیەک، ستایلێکمان بەو پێشگر و پاشگرانەوە هاتە بەردەست، یەکسەر لە ڕووی چۆنایەتیەوە هەڵسەنگاندنی بۆ دەکەین و دەینرخێنین. دروستبوونی ئەم (سایکۆلۆژیای نرخاندنی پێشوەختە) پێشینەیەکی مێژوویی خۆی هەیە و پێویستە بابەتێکی گرنگیی (کۆمەڵناسیی بازاڕ) و کڕیار بێت. لەمەشدا تەکنەلۆژیای بەبازاڕکردن و پیرۆزکردنی کاڵا و بیرۆکە و زانست، لە ڕێگەی ڕیکلامەوە، کاریگەرییەکی زۆری هەیە. بۆیە پێویستیش دەکات ئەژنۆی ئەو میکانیزمانەی کاڵا بەهەر ناوێکەوە پیرۆز دەکەن بە بردنە سەری هووشیاریی خەڵک، بشکێنرێت. ئەمەش لە کاتێکدا پاشگر و پێشگری قوتابخانەکان گەرەنت نین بۆ باشیی و پەروەردەییان. پێوەریی باشی قوتابخانەیەک لە توێژینەوە زانستیەکاندا ئەو ڕێنماییە پەروەردەیی و ئیداری و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژیانەن کە پێویستە قوتابخانە خۆیان لەسەرەوە دامەزرێنێت. بۆیە بەڕێوەبەرایەتیەکی باش، ئامانجداربوون، تێگەیشتنی سایکۆلۆژیانە و پەروەردەییانە لە منداڵ، گرنگیدان بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان، بە پەیوەندیی نێوان قوتابخانە و منداڵ، قوتابخانە و قوتابی و خێزان و هەروەها گرنگیدان بە مامۆستا و ڕەخساندنی کەشێکی پێویستە بۆ چالاکیی و بەشداریی پێکردنی لایەنەکان و چەندین

خەسڵەتیتر، لەو پێوەرانەن کە بەهۆیانەوە باشی قوتابخانە هەڵدەسەنگێرنرێت. (**https://www.eva.dk**).

پاش چاوەڕوانییەکی دوو ساڵە لەسەر ئەوەی پەیوەندیی نێوان قوتابخانە و دایکان و باوکان گۆڕانێکی نەوعی بەسەردا بێت، پاش ئامادەبوون و بەشدارییکردنی چالاک لە هەر بۆنەیەکدا، کە قوتابخانە ڕێکیدەخست، پاش نامەگۆڕینەوە و گوێگترن لە ڕینمایی و مەرجەکانی قوتابخانە و خراپتربوونی باری دەروونی قوتابی و لەخۆڕازیبوونی قوتابخانە و گوێنەگرتنییان لە داواکاریی و گەرمکردنی پەیوەندییەکان، پاش ئەوەی لە کاتی خۆیدا، یان پێشەکی کرێی خوێندنەکەمان دەبرد و هەر ڕووبەڕووی ساردووسڕی و ڕەسمیاتێکی زۆر دەبووینەوە، بڕیارماندا قوتابخانەکە بگۆڕین.

گۆڕینی قوتابخانەش بڕیارێکی گرنگ بوو. ئەو دایکوباوکانەی منداڵەکانیان بۆ ماوەیەک لە قوتابخانەیەکی تایبەت دەمێننەوە، لە کاتی گۆڕینی قوتابخانەدا پێویستە زۆر بە وریایی ئەم کارە بکەن. ئەوەی لەم قوتابخانەگۆڕییەدا گرنگە ئەوەیە کە وەک گوناهێک، یان هەڵەیەکی گەورە تەماشای نەکەین و بیبەستینەوە بە پێویستیی منداڵەکەوە بۆ گۆڕینی شوێن و کەشێک بە یەکێکیتر. مەرجیش نیە هەمیشە ئەو جێگۆڕکێیە لەبەر

کەشێکی، یان خراپی قوتابخانەکە بێت. بەڵام گرنگە بزانین کە ئەو شوێنگۆڕکێیە تەنیا گۆڕینی قوتابخانە نیە و زۆر لایەنیتریش دەگرێتەوە. بۆیە پێویستە گۆڕینەکە لەپڕ و تەنیا بە بڕیارێکی میزاجی و لە پەرچەکردارەوە نەبێت. (http://voresborn.dk/skole/nar-dit-barn-skal-skifte-skole).

ئێمە بۆ بڕیارێکی وەها هیچ دوودڵ نەبووین لەوەی چ وەڵامێکمان بۆ قوتابخانەکە دەبێت: لە ڕوانگەی منداڵەکەمان و خۆمانەوە قوتابخانەکە سەرکەوتوو نەبوو لە دروستکردنی پەیوەندییەکی سوودبەخش و هەر وەک لایەنێکی سوودخواز مایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، مافی منداڵەکەمان پێشێل نەکرد و خۆیمان سەر پشک کرد لە گۆڕینی قوتابخانەکەیدا. گۆڕینی قوتابخانە پێویستە بە ڕەزامەندیی قوتابییەکە خۆی بێت، یان پێویستە ماوەیەکی باشی بدەیتێ تا تیایدا بیر بکاتەوە و بڕیارەکە بکاتە هی خۆی. هەڵکەندنی قوتابی لە تەمەنەکانی سەرەتاییدا لە قوتابخانەیەکەوە بۆ یەکێکیتر، دابڕکردنێتی لە کەشیکی ژیان و ژینگەیی زیاتر لەوەی دابڕکردنی بێت لە کەشێکی خوێندن. بۆی هەیە منداڵ لەگەڵ هاوتەمەنەکانیدا ئاسوودەبێت، بەڵام لە کەشی خوێندن، مامەڵەی مامۆستا، زۆریی ئەرک، نەبوونی کات، فۆرمەکانی سزا و کۆنترۆڵ، بێتاقەت بێت. زۆربەی دایکان و باوکات کاتێ قوتابخانەکە

دەگۆڕن بیر لە ئاستی خوێندن و کرێی خوێندن و ڕەهەندە پراکتیکیەکانی دیکەی مەسەلەکەش دەکەنەوە، بەڵام بیرکردنەوەش لە ڕەهەندیی دەروونی و ئاسوودەیی ڕۆحیی قوتابخانە لە ڕوانگەی قوتابیەکانەوە، گرنگیی خۆی هەیە و بگرە ئەگەر ئەم ڕەهەندە لەپێشچاو نەگرین، بۆی هەی کەلێنێکی دەروونی لەلای منداڵەکە جێبهێڵین. بۆیە لەبەر چاوگرتنی دۆخی سۆزداریانە و دەروونیی منداڵەکانیش هێندەی دۆخی فێرکاریی و پەروەردەییەکە گرنگە. دابڕکردنی منداڵەکان لە هاوپۆل و هاوەڵەکانیان، بەبێ هۆکاری زۆر گرنگ، لە خۆیدا کارێکی باش نیە و دەبێتە هۆی دروستکردنی کەلێنێکی دەروونیی بۆ منداڵەکان. بەڵام کاتێک ئەو بڕیارە پشتگیریی قوتابییەکە خۆیشی لەگەڵ بێت، ئەوە هیچ بەڵگەیەک نامێنێت بۆ پشتگوێخستنی وەها بڕیارێک..

لە نمونەکەی ئێمەدا، خودی منداڵەکەمان گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە چیتر نایەوێت بچێتەوە بۆ قوتابخانەی شوەیفات. گرانیی کەلوپەل، خراپی خواردن، ساردیی نێوان قوتابیەکان، زۆری وانەکان و ماندووکردنی قوتابی و توندوتیژیی ڕەمزیی قوتابخانە و فیزیکی قوتابییەکان، لەو هۆکارانە بوون. بۆیە ئێمەش کەوتینە پرسیار و گەڕان بە دوای قوتابخانەیەکیتردا. لەم نێوانەشدا لە ڕێگەی دۆستان و

هاوڕێیانمانەوە لە وەزارەتی پەروەردە، پرس و ڕامان گۆڕییەوە وسەردانی چەند قوتابخانەیەکی نمونەییشمان کرد بەبێ ئەوەی بڕیاریی یەکلاکەرەوەمان بۆ بدرێت.
لە هاوینی ئەو ساڵەدا بە هۆی هاوڕێیەکمانەوە (دڵکەش موراد)، کە لە لەندەنەوە گەڕابۆوە، بیستمان قوتابخانەی بەریتانیی لە هەولێر کراوەتەوە و ئەوکاتە بینایەی قوتابخانەکەش لە تەواوبوون و دەستەیەکی مامۆستایان دەهاتنە کوردستان. ماوەیەکی کەمی پێچوو، لەگەڵ هەمان ئەو هاوڕێیەمان توانیمان لەگەڵ بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، کە خانمێکی کورد بوو (فریشتە ڕاپەڕ)، یەکتر بناسین و دڵنیایی ئەوەمان وەرگرت کە بە زوویی قوتابخانەکە دەستدەکات بە وەرگرتنی قوتابییەکان بۆ وەرزێکی نوێ. ئەمەش مایەی دڵخۆشی ئێمە و منداڵەکانمان بوو. پاشان ڕۆژێک بە ڕێکەوت لە یەکێک لە مۆڵەکان، بەڕێوەبەر و ستافی مامۆستاکانیمان بینی و کوڕەکانمان بەوە زۆر دڵخۆش بوون، کە دەبنە قوتابی قوتابخانەیەکی نوێ، کە زۆرینەی مامۆستاکانی کراوەن.
ژماردنی ڕۆژەکان بۆ ئەوان دەستیان پێکرد و کەوتنە ژیان لەناو خەیاڵەکانی خۆیاندا. یەکەم شت بە دانانی سندوقێکی پاشەکەوت دەستپێکرد تا بتوانن بە پارەکەی ئەو کەلوپەلانەی بۆ قوتابخانە پێویستن، بیانکڕن.. لە هەمان

کاتیشدا توانیمان ناویان لە خولی هاوینەدا بۆ مۆسیقا و زمانی فەرەنسی تۆمار بکەین و ئەمەش وایکردبوو بەر لە دەستپێکردنی قوتابخانە، کەشێکی قوتابخانەیی لە ماڵەکەدا دروستببێت. ئێمە هێشتا لەوە دڵنیا نەبووین ئایا ئەم قوتابخانەیە هەڵبژاردنێکی ڕاستەقینەیە، یان قوتابخانەی باشتریش هەن. وەلێ هەرگیز لەوە دوودڵ نەبووین کە تازە بۆ هەمیشە شوەیفات ماڵئاوایی لێکراوە. جیاوازیی نرخی خوێندن و بیرکردنەوەمان لەو کۆژانانەی لەوێ بەسەر منداڵەمان و خۆمان هاتن، نەبوونی پەیوەندیی ڕاستەوخۆ و سڕینەوەی دایکان و باوکان لە بیرەوەریی قوتابخانەدا پاش هەر برە پارەیەک و هتد، بڕیارەکەیان پتەوتر دەکردین.

لەو کاتەدا کە ناونووسین و پارەدان لە قوتابخانەی بەریتانی دەستپێکرد، ئێمە نەمانتوانی پارەکە ئامادە بکەین. هەر لە ڕێگەی ئەو هاوڕێیەی لەندەنمانەوە، توانیمان داوا لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بکەین، تا کاتی دوومین قیستی قوتابخانە لەسەرمان بوەستن. ئەویش ڕەزامەندیی خۆی دەربڕیبوو و ئەمەش متمانەی ئێمەی زیاتر و پتەوتر کرد بە قوتابخانەکە.

بۆیە پرۆسەی دەوامکردن بە شێوەیەکی ئاسایی دەستپێکرد. هەرچەندە دوو هەفتەیەک لە دەوامی قوتابخانەکان دەستبەدەوام کرا. هۆکارەکەشی

تەواونەبوونی هەندێ بەشی بینایەکە بوو لە ناوەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کەشوهەوایەکی گەرم و گوڕ لە ئاردا بوو. بەیانیان ستافی مامۆستاکان و بەڕێوەربەرەکە لەبەر دەرگای قوتابخانە پێشوازییان لە قوتابیەکان دەکرد. یەکێک لەو شتانەی زۆر پێی سەرسام بووم ئەوە بوو کە بەڕێوەبەری و هەندێ لە ستافەکە بە ناو قوتابییەکانیان بانگدەکرد و بەشێوەیەکی ئارام بەڕێیاندەکردن بۆ ژوورەوە.

ناوی تایبەت، کەسەکان لە ئەوانیتر جیا دەکاتەوە، متمانەیان پێدەبەخشێت و هەستێکی خۆشیان دەداتی، چونکە هەرکەس بەناوی خۆی بانگدەکرێت. ئەمەش دڵنیایی بە منداڵەکان دەبەخشیی و گوێلێبوونەوەیان لە ناوی خۆیان، شاد و متمانە بەخۆی دەکردن. هەرچەندە هەندێکی زۆریان بە شەرمەوە لە ئۆتۆمبێل و پاسەکان دادەبەزین و سەریان دادەخست، بەڵام هەر ئەوەی گوێیان لە ناوی خۆیان دەبوو، یەکسەر سەریان قنج دەکردەوە و بەردەوام دەبوون لە ڕۆیشتن.. ئەو دیمەنە بە نووسین وەسف ناکرێت، دەبێت ببیینت بۆ ئەوەی ئەو هەستی دڵبەخۆخشکردنە لە خۆتدا بدۆزیتەوە. ئەمەش هەر بۆ ئێمەی دایکان و باوکان جێی متمانە و سەرەتایەکی خۆش نەبوو، بەڵکو سەرەتایەکی خۆشیش بوو بۆ ڕۆژێکی خوێندن و یاریی بۆ منداڵەکان.

قوتابخانەی بەریتانی لە شوێنێکی دوور بوو، هێشتا بە تەواوی بیانەیەکی تەواو نەببوو و ڕێگاکەشی تابڵێی ناخۆش و نالەبار. لەمەشدا پێویستە وەزارەت مەرجی شوێن و ئەو کەشوهەوایەی پێویستە قوتابخانەی تێدا بینا بکرێت، کە حەتمەن پێویستە لایەنی ئەمنی، تەندروستی و نزیکی لە شارەوە، لەبەرچاو بگیرێت. بۆیە دەکرا پێشبینی ئەو ناڕەحەتیانە بکرێت کە بۆ منداڵەکان و لە ناو ئۆتۆمبێل و پاسەکاندا دەهاتنە پێش. لە سەرەتاوە شوێنی یاریی و حەوانەوەی منداڵەکان زۆر ئامادە نەکرابوو، بەڵام ڕاڕەو و پۆلەکان جوان و تەندروستبوون و بەشێوەکی گونجاو ئامادەکرابوون. ڕەنگیی ئارام و دیواری ڕازاوە بە تابلۆی هەمە چەشن، لەگەڵ پلاستیکڕێژکردنی تەختایی پۆل و ڕاڕەوەکان، ئارامیەکی تایبەتیان دروستکردبوو. ئەم پلاستیکڕێژییە، هەموو دایک و باوکێکی لەوە دڵنیا دەکردەوە کە کەوتنی منداڵەکەیان ئازاری زۆری بەدواوە نابێت. لەوەش دڵخۆشکەرتر دەستەی مامۆستاکان بوون کە زۆرینەیان خەڵکی دەرەوە و بەتایبەتی بەریتانیا بوون و گەنج بوون. هەرچەندە کاتێ یەکەمجار لە مۆڵەکە ستافی مامۆستاکانمان بینی، یەکێک لە مامۆستاکان کە گەنجێکی تەمەن سیەکان بوو، ڕووی کردە کوڕە گەورەکەمان و بە تۆنێکی تایبەت وتی: من ناوم مستەر فلانە و پێویستە لە

قوتابخانەش هەر بە مستەر بانگم بکەیت)، ئینتیباعێکی جوانی بەجێ نەهێشت و من یەکسەر ئەمەم بەستەوە بە فۆرمێکی کۆنسێرڤاتیزمی ئینگلیزیی و لە خۆتێکەیشتنێکی کۆلۆنیالیسانەوە.. ئەو مامۆستایە هەر لە تێرمی یەکەمدا قوتابییەکانی بەجێهێشت و بەرەو میسر و کۆنتراکتێکی نوێ، ڕۆیشت. لەگەڵ ئەوەشدا شتێک کە هەرگیز لە شوەیفات نەمبینی و ڕێگەی نەدەدرا، ئەوە بوو، توانیمان وەک دایک و باوک ناو پۆلەکانی قوتابخانەی نوێ ببینین و هەرکات بۆمان هەبوو لەگەڵ ستافی بەڕێوبەر دابنیشین و گوێ لە ڕینماییەکان بگرین.. هەموو ئەمانە پێکەوە، یارمەتیدەربوون بۆ ئەوەی هەستێکی گوناه سەبارەت بە گۆڕینی قوتابخانەکەمان لە ئاست منداڵە گەورەکەمان لەلا دروستنەبێت و بۆ بچووکەکەشیان ئەزموونێکی نوێ و خۆش بێت.

بەمجۆرەش، هەڵبژاردنی منداڵەکان بۆ ژینگەیەکی نوێی پەروەردەیی و سەردانکردنی ئەو قوتابخانەیە و ئاشنا بوون بە هەندێک لە مامۆستاکان و بەڕێوەبەرەکەی و بینینی کەشێکی منالانەی پەروەردەیی، پێشئەوەی دەوام دەستپێبکات، بێکاریگەر نەبوون لە ڕاکێشانی منداڵەکان بەرەو خوێندن و خۆ ئامادەکردن بۆ چوونە قوتابخانە نوێیەکەیان. ئەگەر گرانیی نرخ و دووریی شوێنی

قوتابخانەکە نەبوایە، لەو کاتەدا حەزمان دەکرد ئەمجۆرە قوتابخانانە بکرێنە سەرمەشق. بەڵام گرنگیی ئەم قوتابخانانە و سەرمەشقییەکەیان هەر لە مەدا کورتنابێتەوە، چونکە ئەم بینا فراوان و پۆل و ڕەنگە جوانانەی پێشتر وەسفم کردن، بەشێکی ئەو پەیوەندییەن کە منداڵ و قوتابییەکان بە خوێندنەوە دەبەستێتەوە. بەشێکی هەرە گرنگتر ئەو پەیوەندیی و سیستەمی چاودێریی و فێرکارییەن کە لەوێدا دەخرێنە گەڕ.

لەگەڵ دەستپێکردنی قوتابخانەدا و لە هەفتەکانی یەکەمەوە، منداڵەکان دڵیانخۆش بوو، بگرە ساڵی یەکەمیان بەو دڵخۆشیی و هاندەرە ناخەکییانەوە تەواو کرد و نمرە و لەخۆڕازییبوونی بەرزیان هێنا. هۆکاریی ئەمە چیی بوو؟ ئەمە ئەو پرسیارەبوو کە دەمەوێت لێرەدا بە وردبوونەوە لە (کەسایەتی بەڕێوەبەری پەروەردەیی) وەلامی بدەمەوە. هەر لە ئێستاشەوە دەبێت ئەوە بڵێم، کە کەسایەتی بەڕێوەبەری پەروەردەیی پێویستە هەمان ئەو خەسڵەتانەی تێدابێت، کە بۆ هەر بەڕێوەبردنێک لە بوارەکانی دیکەشدا، گرنگن، بەڵام بەڕێوەبەری پەروەردەیی بەڕێوەبەرییەکی تایبەتە..

## بەڕێوبەریێتی لە پەروەردەدا:

باشیی قوتابخانە لە خۆیدا، ڕەنگدانەوەی گرنگیی لەسەر کەسایەتی منداڵەکان جێدەهێڵێت. کەشی پەروەردەیی و مامەڵەی دروست وەک: (تێگەیاندنی، بەشدارپێکردنی، گوێگرتن لێی و هاوکاریکردن و سنووربۆدانانی هتد.)، لەگەڵ قوتابییەکاندا و تێگەیاندنیان لە بارەی ئەو کرانەوە و ڕێگرانەی قوتابخانە وەک پرانسیپ تەماشایان دەکات، بە شێوازێکی باش و گونجاو و بەدەر لە سزا و بە گەڕانەوە بۆ تاکایەتی قوتابی، هەستێکی قووڵیان لەبارەی کەرامەتیی خۆیانەوە لەلا دروستدەکات. ئەنجامی ئەم شێوازە کە خۆی لە خۆیدا ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی پەروەردەییانەی قوتابخانەکەیە، لە پاشەکەوتکردنی وزەی قوتابیدا دەردەکەوێت و ئەمەش دەبێتە دڵخۆشیی و پەیوەندیی دروست و نمرەی بەرز و دڵبەخۆخۆشبوون و چالاکیی..

بەمجۆرەش قوتابخانە دەتوانێت، نەک هەر ئاستی دانایی قوتابیی بەرێتە سەرێ، بەڵکو دەشتوانێت توانایی شیاوەکی قوتابیی بەرزبکاتەوە بۆ تواناییەکی کردەکی و ئەوەی لە توانایدایە و شاراوەیە، بیهێنێتە دەر و بیکاتە بەرهەم و چالاکی و داهێنان، نەک تەنیا لە وانەکانیدا، بەڵکو لە ژیانی و یاریی و دۆستیی و هونەرەکان و پیشەی دەستیشدا. لێرەشەوە، قوتابخانە دەبێتە فێرگەیەکی شیاو بۆ ئەوەی

قوتابی لایەنی تیۆریی و لایەنی کردەیی کەسایەتی خۆی بۆ دەرکەوێت و پەروەردە و گەشەیان پێبدات.
هەندێ توێژینەوە لەسەر ئەم جۆرە قوتابخانانە ئەوەیان دەرخستووە، کە بەرزبوونەوەی نمرەی قوتابیی و لەخۆڕازیبوونی ئیجابیانەیی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیە سەرکەوتووەکانی دەگەڕێنەوە بۆ کەش و ژینگە پەروەردەییەکەی، ئەگەرچی ئەو قوتابیە لە ڕووی پێگەی کۆمەڵایەتی و چینایەتیەوە، لەسەر ئەو ڕێژەیە حساب نەکرێت، کە بە میرات زیرەکی و سەرکەوتنی بۆ دەمێنێتەوە. (Jan Bjerre Lauridsen..http://www.b.dk/nationalt).
ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت، کە کەشی قوتابخانە پێویستە تەواو جیاواز بێت لە کەشی خێزان وماڵەوە.. ئەم جیاوازییەیە کە دەرفەت بە قوتابی دەدات ئەوەی لە ماڵەوە ناچارەکی و سەپێنراوە، لە ژینگەی قوتابخانەدا ئازادیی و هەڵبژاردنە..
ژینگەی پەروەردەیی دروست بە ئیدارە و بەڕێوەبردنی باش و کەسی بەڕێوەبەر و ستافی مامۆستایان چێدەبێت. لە ماوەی ئەو ساڵەدا هەرکات هاتوچۆمان بە منداڵەکان دەکرد، یان لە کۆبوونەوەکان و بۆنەکانی قوتابخانەدا، لە دەرەوە یان ناوەوەی قوتابخانە، بەشداریمان دەکرد، ئامادەیی چالاکانەی بەڕێوەبەری پێشووتری قوتابخانەی

بەریتانییمان دەبینی، کە خانمێکی کورد بوو. ئەم جەختکردنەوەیە لەسەر کوردبوونی بەڕێوەبەر گرنگیەکی پەروەردەیی خۆی هەیە نەک تەنیا پشتگیرییەکی ناسیۆنالیستیانە لە پێگەی بەڕێوەبەرێک. گرنگە یەکێک لە مەرجەکانی وەزارەتی پەروەردە بۆ کردنەوەی قوتابخانە تایبەتیەکان لەسەر کۆمپانیا سپۆنسەرەکانیان و گۆڕینی بەڕێوەبەرە بیانییەکانی ئێستایان، بە بەڕێوەبەری خەڵکی کوردستان، لە پەیوەندیی بە ژینگە و زمانی داییکەوە بێت. پێویستە وەزارەت ئەوە بکاتە مەرجێک لەسەر قوتابخانە و پشتگیرەکانیان و بەڕێوەبەر کەسێک بێت بێت ئاشنا بە زمانی داییک و کارامە لە بەڕێوەبردندا.

بیرۆکەی ئەوەی دەبێت بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانانە بیگانە بێت، ئینگلیز و فەرەنسی و ئەمەریکی بێت، یان نێواونیوی ئەمانە، بیرۆکەیەکە ئەنجامەکانی لەسەر کەشی فێربوون و مافی منداڵان بۆ فێربوون و تێگەیشتنی قوتابخانە لە قوتابیان و دایکان و باوکان بە خراپ دەکەونەوە. ئەمەش نەک هەر لەبەر ئەوەی ئەرکی بەڕێوەبەر ئەرکێکی ئیداریی و کۆمەڵایەتیشە لەناو قوتابخانەدا و نمونەی بەرزە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەم زمانانە بۆخۆیان لە کۆمەڵگای لۆکاڵیدا ئەرکێکی دیکە جێبەجێی دەکەن کە پەیوەندیی بە هێز و دەسەڵاتی مێژوویی ئەو زمانانە خۆیانەوە هەیە. ئەگەر لە

بیرت بێت، باسی ئەو مامۆستایەم کرد، کە چۆن بە منداڵەکەمانی گوت: (من مستەر فلانم و پێویستە هەر بە مستەریش بانگم بکەیت)، ئەم ڕستەیە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە پەیوەندیی مامۆستا و قوتابی بەرجەستە دەکات بەپێی تێگەیشتنێکی تایبەت لە پەروەردە. لە وڵاتانی سکەندناڤیا ئەم ڕستەیە یەک پوولی قەڵب ناکات و ناوی کەسیی و تایبەت جێگەی وشەی (مستەر و سێر) دەگرێتەوە. ئەوەی لە ڕستەکەدا مەترسیدارە، یان بێزارکەرە، ڕەهەندە هێمایی و سیمبوولیەکەیەتی، چونکە لێرەدا مستەر بەبیرخەرەوەی یان جەختکردنەوەیەکە لەسەر جۆریک پەیوەندیی تایبەت کە پەیوەندیی سەردەستە و ژێردەستە و ئاغا و کۆیلە و هەڵگری کۆی ئەو مانایانەیە کە تێڕوانینێکی تایبەتی سەردەستەیان تێدایە بۆ کۆمەڵگای لۆکاڵی. بۆیە زمانی ئینگلیزی لەم بەکارهێنانەیدا هەر تەنیا زمانێک نیە فێربوونەکەی ئاسۆی داهاتووی قوتابی ڕوون و بگرە دابینی دەکات، بەڵکو زمانێکیشە لە پێشینەی دەسەڵاتی، کۆلۆنیاڵیستییەوە کە هەڵگری کۆمەڵێک هێما و ڕەمزی تایبەت بە خۆیەتی، مرۆڤ کۆلۆنیاڵیزە دەکاتەوە. زمانێکە هەڵگریی مێژوویەک و ئەو کۆد و نیشانانەیە کە لە ڕێگەیانەوە دەسەڵات قسەی خۆی دەکات و دەبێتە ڕێگرێک لەبەردەم تێگەیشتنی قوتابیە منداڵەکان لە کۆمەڵگای خۆیان.

ئەمەش پێچەوانەی مافی منداڵەکانە بۆ فێربوون بە زمانی دایک تا تەمەنی هەشت ساڵان. (PhD ، Abidogun،Gboyega) ((2013).

لەبەر ئەوە کاتێک لە حکومەتی هەرێمدا و لە ڕێگەی قوتابخانە تایبەتییە سوودخوازەکانەوە زمانی ئینگلیزی بە پیرۆز دەکرێت و گوتارێک دەخەملێنرێت لەسەر گرنگیی زمانی بێگانە و بەتایبەتی زمانی ئینگلیزی، نابێت ئەم بەپیرۆزکردنە لەسەر حسابی فێربوونی زمانی کوردی و زمانەکانیتر بێت.

## گرنگیی بەڕێوەبەری خۆماڵی:

گرنگیی بەڕێوەبەری خۆماڵی بەهۆی نمونەکەمەوە ڕووندەکەمەوە، کە پێشتر باسمکرد، چونکە لە دوای ئەوەی ئەم بەڕێوبەرە کوردە دوورخرایەوە، ئەو دوو بەڕێوەبەرەی دیکەی بۆ ئەم قوتابخانە بەریتانیە داندران، هیچیان نەیانتوانی وەکئەو سەرکەوتوو بن و جێگەی بگرنەوە، یەکێکیان خانمێکی بەریتانی و ئەویتریشیان بە هەمان شێوەو باسی ئەمزموونی خۆم لەگەڵ هەریەکێکیان پاشتر باسدەکەم..

هەرچەندە لە دوورەوە وا دیاربوو بەڕێوەبەرە کوردەکە، کەمێک توندوتیژ بێت، هەرچەندە لە باکگراوندی پسپۆڕیی

ئەومان نەدەزانی، بەڵام هەمیشە چالاک و ئامادە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، کە لە ڕووکاردا من وەک بەڕێوەبەرێکی توند دەمبینی، بەتایبەتی دەنگی زۆر بەرز دەکردەوە، بەڵام بیروڕای قوتابییەکان تەواو پێچەوانەی ئەو هەستەی من بوو. ئەوان بەڕێوەبەر و ستافی مامۆستاکانیان زۆر خۆشدەویستن. متمانە و لێکحاڵیبوون، گفتوگۆ و تێگەیاندن، جێگەی ترس و خۆدزینەوەیان لە ئەرکەکانی قوتابخانە گرتبۆوە. کۆششکردن لە ماڵەوە و خۆئامادەکردن بۆ چوونە قوتابخانە و خۆگۆڕین و باسکردنی هاوڕێکان، وەک چێژێکی ڕۆژانەی لێهاتبوو کە کەشی ماڵەکەی کردبووە کەشێکی قوتابخانەیی و بەردەوامیی لە فێربووندا. تەنیا شتێک لەم قۆناخەدا بریتبوو لە خواردنی خراپ و دووبارە، کە بە منداڵەکان دەدرا. ئەم کێشەیەش لە قوتابخانەی شوەیفاتیش هەبوو، ئەگەرچی زۆر هەوڵماندا کە هەفتانە بەرنامەی خواردنی خۆیانمان بە نامە بۆ بنێرن، بۆ ئەوەی لە ماڵ هەمان خواردن ئامادە نەکەینەوە، بەڵام گشت هەوڵەکانمان لە هەردوو قوتابخانەکە بێئەنجام بوون و وەرگرتنی زانیاریی پێشوەخت لەسەر ژیانی ڕۆژانە لە قوتابخانەدا، بە پچڕپچڕی بەڕێوە دەچوو..

لەو گفتوگۆ زۆرانەی ڕووبەڕوو، یان بە تەلەفۆن لەگەڵ ئەم بەڕێوەبەرە کوردەدا هەمان بوو، ئەوەم بۆ ڕوونبۆوە، کە

تێگەیشتنی ئەو لە منداڵەکان و ئەو پرانسیپانەی لە ژیانی ڕۆژانەدا پەیڕەوی لێدەکردن، لەسەر دۆزینەوەی هێڵێک بەڕێوە دەچوون کە لایەنی ئەکادیمی و پەروەردەیی و زانستیی قوتابخانەکەی دەبەستەوە بە شێوەژیانی لۆکاڵیی قوتابییەکانەوە. لە تێگەیشتنیەوە لە ژیانی لۆکاڵ و ژینگەی کۆمەڵایەتیی منداڵەکان کە لە خانەوادەی جیاوازەوە دەهاتن، مامەڵەیەکی ئەوتۆی لەگەڵ دەکردن کە ئامادەیان بکات بۆ ژیانێکی ئەکادیمی و زانستیی و پەروەردەیی و کولتووری قوتابخانەیان لەلا بەرجەستە بکات. بەمجۆرەش ئەم بەڕێوەبەرە ئەرکی خۆی لە جێبەجێکردنی کۆمەڵێک ڕێنمایی پێشوەختەی قوتابخانە و یاساییدا چڕ نەکردبۆوە و بە شێوەیەکی مەیدانی ئەزموونی ژینگەی قوتابیەکانی دەکرد. کاتێکیش بە شێوەیەکی وردتر لەگەڵ منداڵەکانم کەوتمە گفتوگۆوە لەسەر کەسایەتی بەڕێوەبەرەکە و شێوەی حوکمدانەکانی و دەنگبەرزکردنەوەکانی، ئەوەم بە ڕوونیی بۆ ئاشکرابوو کە کەسێکی خۆشەویست و ممتمانەپێکراوە و توندوتیژانە، یان بریندارکەرانە مامەڵەیان لەگەڵ ناکات و دەنگ بەرزکردنەوەکەی بەشێک نیە لە خراپیی و تووڕەیی، ئەو هێندەی ئەوەی شێوازێکە بۆ سەرنجڕاکێشانی قوتابییەکان و هێنانەدەریان لەناو ژاژەودا.

گرنگیی کەسایەتی بەڕێوەبەر، چ بۆ ئەوەی مامۆستاکان پێکەوە وەک دەستەیەک کار بکەن و چ لە پێناو ڕەخساندنی گفتگۆ و هاوکاریی لەگەڵ دایکان و باوکان و چ بۆ گەیشتنی قوتابخانەش بە ئامانجی خۆی و چ لەسەر قوتابییەکانیش، کاریگەریی زۆری هەیە. توێژینەوە جیهانییەکانی لەمبارەیەوە ئەوەیان سەلماندووە، کە لەو جۆرە قوتابخانانەدا کە بەڕێوەبەرەکەیان کەسێکی مەیدانی و دیار و ڕوونە لە هەنگاوەکانیدا، قوتابیەکان سەرکەوتووترن. (Andreas Rasch-Christensen :http://politiken.dk/debat).

ئەم سەرکەوتنەی بەڕێوەبەر بەشێکی بۆی هەیە پەیوەندیی بە پسپۆڕیی لە ئاستی خوێندنی باڵا، (دیپلۆم، یان ماستەر)ەوە هەبێت، بەڵام بەشێکی زۆریشی پەیوەندیی هەیە بە ئاستی بەرزی تێگەیشتنی لە ژینگەی کۆمەڵایەتی قوتابیەکان و ئەو کۆمەڵگایەی لێوەی هاتوون. کەسایەتی بەڕێوەبەر، نەک هەر تەنیا پێویستە هاندەرانە بێت، بەڵکو پێویستیشە لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە پتەوبێت و لە هەمان کاتیشدا کەسێکی مەیدانی و بۆچوونەکانی ڕوون و ئاشکرا بن. لە تیۆرییەکانی بەڕێوەبردندا جەختێکی زۆر دەکرێتەوە سەر پلان و ئامانج بۆ ئەوەی بەڕێوەبردنێکی باش هەبێت، کە دیارە هەردووکیان گرنگن.

بەڵام ئەم تیۆریانە بۆ بەڕێوەبردنی قوتابخانە ئەگەر ڕۆحێکی پەروەردەییان لەگەڵ نەبێت، سەرکەوتوو نابن.

من لە بەڕێوەبەرە کوردەکەی قوتابخانەی بەریتانیدا ئەم ڕەهەندەشم دەبینی، کە چۆن توانیویەتی بەڕێوەبەرییەکی پەروەردەییانە بچەسپێنێت و ئیمەی دایکان و باوکانیش بەرئەنجامەکەی لەسەر کەسایەتی قوتابیی و لەسەر ژینگەی قوتابخانەکە ببینین. گرنگترین شت لە چاوی قوتابییەکانەوە، ئەوە بوو کە بە مرۆڤێکی (عادل) وەسفیان دەکرد. (هیچ شتێکی خراپ بە کەس ناڵێت و هەر قوتابییەک کێشەیەکی هەبێت خۆی بە دەنگییەوە دەچێت). لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونی بەڕێوەبەرەکە بۆ منداڵەکان و قوتابیەکانیتر ئاشکرا بوون و شتگەلێک نەبوون کە میزاج و ڕۆحییەی منداڵانەیان بهەژێنێت. ئامادەیی بەڕێوەبەر لە ناو قوتابی و کارمەنداندا، ئەوەش دەگرێتەوە کە پێویستە زووزوو سەردانی پۆلەکان بکات. لەناو ئەو توێژینەوانەدا کە لەسەر کەسایەتی بەڕێوەبەری قوتابخانە کراون، ئەم خاڵە گرنگییەکی زۆری هەیە. (http://pub.uvm.dk/2006/skoleleder). ئەمەش ئەو پنتەیە کە بەڕێوەبەری ئۆفیسی لە بەڕێوەبەری مەیدانی و پەروەردەیی جیا دەکاتەوە.

هیچ کاتێک نەبووە لە کاتی دەوامدا ئێمە پەیوەندیمان بە بەڕێوەبەرەکەوە نەکردبێت، ئەو وەڵامی نەدابینەوە و بیروڕامان نەگۆڕیبێتەوە. هەمیشەش لەو کاتانەدا دەنگەدەنگی منداڵەکان دەبیسرا. بەمجۆریش جۆری بەڕێوەبەرایەتی و کەسی بەڕێوەبەر نەک هەر بۆ قوتابخانە و مامۆستا و قوتابییەکان گرنگیی خۆی هەیە، ئاواش بۆ دایکان و باوکان دڵنیاییبەخشە.

لەگەڵ ئەوەشدا و لە نمونەی بەڕێوەبەرە کوردەکەدا نابێت گرنگیی زمانی دایکمان بیر بچێت. ئەو بەڕێوەبەرە بە زمانی دایکی زۆربەی قوتابییەکانی قسەی دەکرد و زۆربەی قوتابییەکانیش فێری زمانی ئینگلیزیی ببوون. ئەم دوو زمانە گرنگییەکی زۆری هەبوو، کە وایدەکرد کۆنتاکت و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ تاکە تاکەی قوتابییەکان تایبەت و ئۆرگیناڵ بێت. قسەکردن لەسەر زمانی داییک لەمجۆرە قوتابخانەیەدا هەڵدەگرم بۆ بەشێکیتر، بەڵام ئەوە جێی سەرسووڕمانە کە وەزارەتی پەروەردە ڕەزامەندبووە لەسەر ئەو هەموو بەپەراوێزخستنەی زمانیی دایک لەمجۆرە قوتابخانانەدا. ئەم ڕەزامەندییەی وەزارەت و ئەو بەپەراوێزخستنەی زمانی داییک لە قوتابخانە هەردووکیان پێشێلکاریی مافی منداڵانان لە فێربووندا. بەپێی پەیماننامەکانی مافی منداڵان، پێویستە هەر منداڵێک تا

تەمەنی هەشتساڵان، کە بەپێی هەندێک تیۆریی، کە ئیدی بەتەواوی کەسایەتی خۆی دادەڕێژێت، لە زمانی دایک و لە پرۆسەی خوێندندا دانەبڕێت. هەر ڕێگرییەک و بەدیلێک بۆ ئەوەی منداڵ فێری زمانی دایک نەبێت، بە پێشێلکردن لێکدەدرێتەوە. تیۆرە سایکۆلۆژی و فەلسەفییەکانی فێربوونی زمانیش جەخت لەسەر ئەمە دەکەنەوە..

کاتێ لە قوتابخانەی بەریتانیی نێودەوڵەتی لە هەولێر، بەڕێوەبەرە کوردەکەیان لادا، بەڕێوەبەرێکی دیکەیان لە جێی دانا کە هاوسەری یەکێک لە خاوەن کۆمپانیاکان بوو، کە ئێستا ئەو کۆمپانیایە و بەڕێوەبەرەکە لە هەرێم نەماون. من چەند جار ئەو خاتوونە ژیکەڵەیەم بینی کە سارێژ بوو لە پراگماتیزم و سنۆبیزمی ئەوروپی. ئەوەی بەلامەوە جێی سەرسووڕمان بوو چۆنە لە بواری پەروەردەدا، کە ئەو خۆی وەک پەروەردەکارێکی پیشەیی ناساندبوو، چ پێویستییەکمان بە پراگماتیزم و سنۆبیزم هەیە، کە هەردووک ئەم خەسڵەتانەش لە تایبەتمەندییەکانی کولتووری ئەوروپی/لاتینی/ مەسیحین و مێژووی ئایدیاکانی ئەم دوو ئاراستەیە دەگەڕێنەوە بۆ ڕۆژگاری دێرین، کە ئێرە جێی نیە. بینینی بەڕێوبەرێک لە فۆرمی سنۆبیزمدا، کە شێوەژیانێکی خۆجیاکەرەوەیە، بەرزنۆڕی و لووتبەرزانەیە و لە هەمان کاتیشدا سودخوازو

ڕۆژگارهەڵسوڕێن، لەبواری پەروەردەدا جگە لەوەی دژوازییی و ناکۆکیەک دەهێنێتە ئاراوە، ئاواش دەمانباتەوە سەر جەوهەری قوتابخانە تایبەتیەکان کە سوود و قازانج دەخەنە سەرووی هەموو شتێکەوە. پێموایە ئەم بەڕێوەبەرە نزیکەی ساڵێک لەو پۆستەدا مایەوە و ئیتر چارەنووسی لەگەڵ چارەنووسی کۆمپانیای مێردەکەیدا تەواو بوو و هەڵاتن بۆ شوێنێک کە تیایدا قازانج بەدەستدەهێنن.
یەکەمین کار و بەریەککەوتنی من لەگەڵ ئەم بەڕێوەبەرە ژیکەڵەیەدا ئەو کاتە بوو کە منداڵەکان ڕۆژێکی ساڵی ٢٠١٣ هاتنەوە و ئەو پارچە کاغەزەیان هێنایەوە کە لە وێنەکەیدا دەیبینن و چەند جۆر پێڵاو نمایش دەکات.. بەر لەوەی لەم بەشەدا باسی ئەو مشتومڕانە بکەم کە لەگەڵ ئەم بەڕێوەبەرەدا و لەسەر ئەم بڕیارە کردوومن، دەمەوێت کەمێک لەسەر ڕێکلام و قوتابخانە بدوێم و وەڵامی ئەوە بدەمەوە بۆچی ئەم وێنەیە دەچێتە چوارچێوەی ڕێکلامەوە نەک پرۆسەیەکی فێرکاری.

## ڕێکلام لە قوتابخانەدا:

قوتابخانەکان دامەزراوەی فێرکردن و پەروەدەیین. بۆیە ڕێکلام لە قوتابخانەدا لە ڕووی یاسایی و پەروەردەییەوە نابێت ڕێگە پێدراو بێت. منداڵەکان دەچن بۆ قوتابخانە تا

زیرەک و هووشیاربن، نەک بۆ ئەوەی بچنە ژێر کاریگەریریی پرۆسەی بازاڕگەریی و ڕێکلامەکانەوە.
چاوەڕوانیی ئێمەی دایکان و باوکان لە قوتابخانە ئەوەیە منداڵەکانمان ئامادە بکەن بۆ ژیانێکی باش و عەدالەتباوەڕانە و دیموکراسیانە و جیاکردنەوەی زانینی ڕاستەقینە لە زانیاریی ئامانجدار بۆ ئەوەی بتوانن لە دوارۆژدا بەختەوەرانە بژین و سوودییان هەبێت بۆ کۆمەڵگاکەیان، نەک بۆ ئەوەی تەماعیان بجوڵێنرێت و ئیغرابکرێن بە کولتورێکی نا قوتابخانەیی.
من نازانم و نەمدی لە چوارچێوەی پرۆژەی پەسەندکراوی یاسای قوتابخانە تایبەتییەکان و ڕێنماییەکانی وەزارەتدا ڕێکلام قسەی لێوە کرابێ و ڕێگەپێدراو بێت، یان نا (http://moe-krg.com/ku/). بەڵام ئاگاداریش نیم وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان هیچ مەرج و ڕێنمایی و سنوورێکی لەمبارەیەوە بۆ قوتابخانەکان دانابێت. نەبوونی مەرجی یاسایی و ڕێگر لەمبارەیەوە، دیاردەکەی موباح کردووە و دەرگای کردۆتەوە بۆ قوتابخانە تایبەتیەکان تا لە ڕوانگەی سوودخوازییەوە ئەم دەرگایەش بەکار بهێنن و بیخەنە چوارچێوەی پرۆسەی ئیداریی و ڕێنمایی قوتابخانەکەیانەوە، کە بەشێکە لە سیستەمێکی سپۆنسەرکراوی سوودخواز.

## ئایا قوتابخانه میدیایەکە بۆ ڕیکلام؟

قوتابخانەکان بە حکومیی و تایبەتیەکانیانەوە دامەزراوەی یاسایی وڵاتن بۆ فێربوون و پەروەردە و ڕۆڵ و ئەرکی میدیای لایەنێکی تایبەت نابینن. بەکارهێنانی قوتابخانە بۆ مەبەستی بازارگەریی و ڕیکلام لە خۆیدا هەڵخلیسکاندنی ئەم دامەزراوانەیە لەوەی دامەزراوەی فێرکاری و میدیای کۆمپانیا سپۆنسەرەکانیان و ئەمەش بە مانای ئەوەیە چۆن لە نەبوونی یاسای تایبەتدا ئەم شوێنانە دەکرێنە سەکۆی سوودخوازی و دەبنە بەشێک لە سیتسەمێکی چاوبەست بۆ خۆڵکردنە چاوی خەڵک و حکومەتەوە.

کولتووری قوتابخانە کولتوورێکی جیاوازە لە کولتووریی بازارگەریی و سوودخوازی، بۆیە نابێت ئەم کولتوورە بکرێتە قوربانیی و مەیدانی قوتابخانە بکرێتە میدیایەک بۆ کۆمپانیاکان و سپۆنسەرەکانیان (http://politiken.dk). ئەمەش نەک تەنیا لەبەر ئەوەی ئەم سوودخوازییە پێچەوانەی هەر بیرۆکە و فەلسەفەیەکی پەروەردەیی مرۆباوەڕانەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە پێشینەی ڕیکلام و پڕۆپاگەندە لە سیستەمی پەروەردەیی وڵاتانی میراتگریی کۆلۆنیالیزم و دیکتاتۆریدا پێشینەیەکی تراژیک و بریندارەکەرانەیە.

## پێشینەی ڕێکلام لە قوتابخانەکاندا

چ قوتابخانە و چ ئەو کەرەستانەی لە قوتابخانەدا بەکار دەهێنرێن لەم جۆرە کۆمەڵگایانەی وەک کۆمەڵگای ئێمەدا، لەبەردەم ئەگەری بوون بە بابەتی ڕێکلام و پڕۆپاگەندەدان. ئەمەش نیشانە دیداری و نوسراوەکان دەگرێتەوە. تابلۆی ناوی قوتابخانە و ڕەنگی دیوارەکانی قوتابخانە و ئەو وێنە و پلاکاتانەی لەوێدا هەڵدەواسرێن، بۆیان هەیە لە ساتەوەختێکدا ئەرکێکی جیاواز لە ئەرکە پەروەردەییەکەی خۆیان بگێڕن، یان هەر تەنیا نیشانەیەک بن لایەنی ئیدارییی قوتابخانەکەمان بیر بخەنەوە. لەبەر ئەوەی وێنە و پلاکاتەکان و لۆگۆ و نیشانەکان لە (ڕەنگ) و (فیگەر) و (نیشانە) و (نوسراو) و (هێمان) پێکدێن، ئەوە بۆیان هەیە ببنە گوزارشێکی شاراوەش لەوەی لە ئاستی ڕواڵەتیدا نومایشیدەکەن (https://tegnet.wordpress.com/).

ڕیکلام و پڕۆپاگەندەکان هەمیشە ئاستێکی بینراو و ئاستێکی بیرلێکراوە، ئاستێکی دیدارییی و ئاستێکی بیرخەرەوەیان هەیە و ئەمەش مەبەستدارێتی قوتابخانە وسیستەمی پەروەردەیی تووشی لادان دەکات بەرەو ئامرازگەرایی و سوودخوازیی مادیی و ئایدیۆلۆژی. (ڕۆلان بارت)ی ڕەخنەگری فەرەنسی، یەکێک بوو لەو بیرمەند و نیشانەناسانەی لە مەترسیی نیشانە و ئاماژە

ئایدیۆلۆژییەکانیان بێداریی کردینەوە (لە کتێبی نیشانەناسی)یەکەیدا. هەر نیشانەیەک لەسەر دوو ئاست یان زیاتر مانای هەیە. ئەو بەشە لە مانا کە ڕاستەوخۆیە و ئاشکرایە و نیشانەکان یەکسانن بە ناوەڕۆکەکەیان، ئەو بەشەش لە مانا کە نادیار و شاراوەیە و بیرخەرەوەی شتی دیکەیە لەوەی گوزارشی لێدەکات.

ئەگەر بیرتان بێت لە دەفتەر و لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکانی سەردەمی بەعسدا، چەند لاپەڕەی یەکەمی هەر کەرەستەیەکی خوێندن وێنەی کەسە دیارەکانی ئەو ڕژێمە بوون. بەتایبەتی سەرۆکی فەرماندە و جێگرەکەی و کەسانی دیکە لەو بنەماڵەیە. بەعسیانەکردنی ناوەڕۆکی لۆگۆ و سەر بەرگی دەفتەر و کتێبەکان و نووسینەوەی دروشمەکانی ئەو ڕژێمە، ناوەڕۆکێکی سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی ئەوتۆی دەدایە کتێب و دەفتەرەکان، کە منداڵ بەشێوەیەکی (سرووشتی) و ئامادەبێت بۆ وەرگرتنی پەیامەکانیان. بەمجۆرەش بەعس کۆی پانتایی و ڕووبەری ئەو کەرەستانەی بارگاوی دەکرد بە پەیامەکانی خۆی و ئیدی دەفتەر و کتێب، هەر دەفتەر و کتێب نەبوون، بەڵکو میدیایەکیش بوون کە لە ڕێگەیانەوە، بەعس خۆی نومایش و بەسرووشتیدەکرد و لە دروستکردنی هابیتۆسێکی تایبەتدا بەشدارییان دەکرد. ئەم نمونەیە پێشینەیەکی

قێزەونی بە ئایدیۆلۆژیکردنی سیستەمی پەروەردە و قوتابخانەمان پێدەناسێنێت، کە دووبارەکردنەوەی مەترسیدارە..

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە کەرەستە و لۆگۆ و نیشانە فەرمییەکانی قوتابخانە لە لۆگۆ و نیشانە و پرۆپاگەندە ڕێکلامییەکان و ئایدیۆلۆژیای پشتیانەوە، جیا بکرێنەوە. قوتابخانە پێویستی بە خۆ جیاکردنەوە هەیە و ئەمەش لە ڕێگەی تابلۆ و لۆگۆکانیەوە دەبێت کە گوزارشێکی ڕاستەوخۆ لە پرۆسە پەروەردەییەکە بکەن و ئەمەش لە بڵاوکراوەکانی قوتابخانەدا ڕوونکرابێتەوە. لە دەرەوەی ئەم گوزارشکردنە، هیچ پانتاییەکی قوتابخانە، دیوارەکان، ڕاڕەوەکان، ناوپۆل، ژوورەکانی ئیدارە، گۆڕەپانی یاریی، شوێنی حەوانەوە و کافتریا و دەستشۆر و شوێنی چاوەڕوانی، نابێت بکرێنە میدیایەکی پروپاگەندەیی و هەڵواسینی ئەو نیشانە و وێنانەی بیرخەرەوەی



شتێکیترن بەدەر لەوەی ڕێنماییین بۆ قوتابیان.. ئاماژە ئایدیۆلۆژیەکانی سیاسەت و دین و ئەو ڕێکلام و وێنە و لۆگۆیانەی گوزارش لەم پەیوەندییە دەکەن، بابەتی پەروەردەیی نین و ئێمە بۆمان نیە و مافی ئەوەشمان نیە، جیهانی منداڵان بە ئاماژە کێشە لەسەرەکانی دنیای گەورەساڵان بشێوێنین.

ئەم دیاردەیە لە قوتابخانە تایبەتییە نێودەوڵەتیەکانی ئێستای هەرێمیشدا بەشێوەیەکی دیی بوونی هەیە. هەردوو قوتابخانەی شوەیفات و بەریتانی نێو دەوڵەتی، خاوەن لۆگۆ و نیشانەی خۆیانن و ئەو جلوبەرگانەش کە بەنرێکی گران بە قوتابیان دەفرۆشرێن ئەو پانتاییەن کە ئەم لۆگۆ و نیشانانەیان لەسەر دووراوون. ئەوەی کە کێ و بە پێی چ پێوەرێکی یاسایی ئەو نرخانە لەسەر جلوبەرگی



منداڵەکان داندراون، کەس نازانێت. بەڵام نرخەکان تابڵێی گرانن و کاڵاکانیش دەستبەسەردا گیراون و لە فرۆشگای خودی قوتابخانە دەفرۆشرێن.. ئەمەش کێشەیەکی دیکەیە: چۆنە لە قوتابخانەدا بەشی فرۆشتنی جلکوبەرگ هەیە؟ بۆچی ئەم ئیمتیازە بۆ قوتابخانە پارێزراوە و لە کێبەڕکێی بازاڕ دوور خراوەتەوە؟ چۆن و کێی و بە چ پێوەرێکی ستاندارد نرخیان لەسەر دادەنێت و چۆن دایکان و باوکان بەدوورن لەوەها بڕیاردانێک. جۆرایەتی جلوبەرگەکانیش لەولاوە بوەستێ و ڕەنگەکەشیان کە بەشی سەرەوەی سپیی و پانتۆڵیش خۆڵەمێشییە. هەردوو ئەم ڕەنگە لە بازاڕدا هەیە و لە کڕینیدا دایک و باوک ئازادترن. بەڵام کاتێک قوتابخانە لۆگۆی خۆی دەکاتە پێوەر و دەیکاتە مەرجی خۆی بۆ سەپاندنیی بەسەر دایکان و باوکاندا، ئەوە نیشانە و لۆگۆکەش دەبێتە بەشێک لە سیستەمێکی گەورەتری چەوساندنەوە و سوودخوازی و قوتابخانەش دەبێتە ئامرازێک بۆ ئەو مەبەستە. مادام ئەو دوو ڕەنگە لە بازاڕدا هەن و بە نرخ و کوالێتی هەرزانتر دابین دەکرێن و قوتابخانە ئامانجی ئابووریی نیە لەوەدا، دەبوو تەنیا بەوەی بە نرخێکی ڕەمزیی لۆگۆکەی خۆی بفرۆشێت و بیکاتە ئەرکی دایکان و باوکان تا بیدروون بە جلەکانەوە.

لەوەش ئەخلاقیتر ئەوەبوو کە ئەم قوتابخانانە لەگەڵ چەند بەرگدروویەکی خۆماڵیی و لۆکاڵیدا ڕێکبکەون و ئەرکی دوورینی جلوبەرگەکانیان بە هێزی کاری لۆکاڵی بسپێرن، بۆ ئەوەی هەمیشە بتوانن بە پێچەوانەی زۆربەی کۆمپانیا سوودخوازەکانیترەوە، منەتێکیش بەسەر حکومەت و کۆمەڵگادا بکەن، بەوەی توانیویانە هەلی کاریش بۆ هاوڵاتیان دابین بکەن. من گومان ناخەمە سەر ئەوەی کە قوماش و پارچەی ئەم جلوبەرگانە لە بەریتانیاوە، یان وڵاتێکی دیکەی ئەوروپی، یان ئەمەریکاوە، دەهێنرێن، بەڵام شوێنی دوورینی ئەوانەی قوتابخانەی بەریتانی لە تورکیا و ئەوەی شوەیفاتیش نادیارە..

**لە منداڵیخستنی منداڵێتی:**




منداڵ بە زۆر شێوە لە منداڵێتی دەخرێت و کەسایەتی بریندار دەکرێت. لە منداڵێتیخستنی منداڵ پرۆسەیەکی دەروونیە لە ڕێگەی فۆرمەکانی گووشار و پراکتیکردنیانەوە بۆ

ئەوەی منداڵ منداڵیتی خۆی نەژی و منداڵانە نەڕوانێتە کەسایەتی خۆی.
یەکێک لە خراپترینی شێوازەکانی سڕینەوەی منداڵیتی لە منداڵاندا، بریتیە لە کوشتنی پرسیار و وەڵامنەدانەوەیان. شێوازی دیکەش زۆرن، کە بە میکانیزمی جۆراوجۆر بەڕێوە دەچن. یەکێک لەو شێوزانە نەبوونی ئازادیی منداڵە لە هەڵبژاردنی ڕەنگ و جلوبەرگ و پێڵاو. پرۆسەیەکی پەروەردەیی تەندروست کە بەرەنجامی تێگەیشتنێکی قووڵ بێت لە کەسایەتی مرۆڤ، نابێت ڕێگە بەخۆی بدات ئەم مافە لە منداڵان بستێنێتەوە. بەپێی پەیماننامەی مافی منداڵان کە لە ساڵی ١٩٨٩ لەلایەن یۆنسکۆوە بڕیاری لەسەر دراوە و لە ساڵی ١٩٩٠وە خراوەتە واری جێبەجێکردنەوە، سێ ژێرخانی بنەمایی بۆ مافی منداڵان دەستنیشانکردووە، کە بریتین لە: مافی بەشداریپێکردن (Participation)، مافی ئاگاداری و بەرگریی (Protection) و مافی دابینکردنی پێویستییە سەرەتاییەکانی منداڵان (Provision) (/http://right-to-childhood.com).
بەشداریپێکردنی منداڵ ژێرخانێکی بنەمایی پتەوە بۆ ڕێزگرتن لە ئیرادە و ویستی منداڵانەی منداڵان و ئەمە ئەو مافە بە کەس نادات ویستی خۆی بەسەر منداڵاندا بسەپێنێت. بەپێی ئەم مافە، پێویستە پەیوەندییەکی

بژاردەکاریانەیان لەگەڵ ببەستین و بۆیان ڕوونبکەینەوە کە ئێمە چیمان پێدەکرێت و ئەو لەناو بژاردەکاندا کامیان هەڵدەبژێرێت. بەمجۆرەش ئەم بەیاننامەیە ڕوانگەیەکی گەردوونی بۆ کەسایەتی منداڵ دەخاتە ڕوو کە تیایدا کەسێتی منداڵ وەک کەسێتی مرۆڤێکی کامڵ بەرجەستە کراوە. کتێبەکەی بێرگمان لەم ڕووەوە کە چۆن لە منداڵان و هەستەکانیان تێبگەین، بەرچاوڕوونی پێویستمان دەخاتە بەردەست: (ڤۆلفگانگ بێرگمان: ۲۰۱۲، و. ک. چروستانی، خانەی سمۆرە).

ئێستا دێمەوە سەر وێنەی پێڵاوەکان.

حەز دەکەم بە وردیی لەگەڵمدا تەماشای وێنەکە بکەن. دوو گرووپ پێڵاو هەر یەکەیان لە ناو چوارچێوەیەکی شێوە چوارگۆشەیی تایبەتدا. چوارچێوەی یەکەم کەسک و لەسەرەوە بە خەتێکی ڕەش نووسراوە (**پێڵاوە پەسەندکراوەکانی قوتابخانە**) و لە ژێریدا بە خەتێکی سووری ئیتالیک کراو، نووسراوە: (***تەنیا پێڵاوی ڕەشی چەرم***). گرووپی دووەمی پێڵاوەکان خراونەتە ناو هەمان چوارچێوەی شێوە چوارگۆشەیی بەڵام بە ڕەنگی سوور و بە خەتێکی ڕەش نووسراوە؛ (**پێڵاویی پەسەند نەکراو**) و لە ژێریشیدا بە خەتی سوور ناوی چەند جۆر پێڵاوێک نووسراوە.

خودی ئەم نامەیە بەو شێوەیەی دەیبینن بە دەرزییەکی سەر خڕی زەردباو، لە بۆردێکی سەوز دراوە و هەتا ئەمساڵیش(٢٠١٥)، لە ژووری پێشوازیی، یان پرسگە دەتبینی. من وێنەکەم لە مانگی ئاگۆستی ٢٠١٥ گرتووە.

ئەڵبەتە ئەم وێنەیە لە ئامانجی خۆیدا ئەرکی ڕێکلام نابینێت، هێندەی ئەوەی نامەیەکە بۆ قوتابییان و دایکان و باوکان. بەڵام چۆن دەکرێ لە دەرەوەی ڕێکلامکردن تەماشای بکەین و ناوەڕۆکی پەیامەکەی تێبگەین؟ ڕەنگی چوارچێوەکان (کەسک و سوور) و ڕەنگی پانتایی نووسراو لە وێنەکەدا (ڕەش و سوور) هیچیان بێلایەن نین. کەسک



ئاماژەیە بە ڕێگەپێدراو و سوور قەدەخەمان بیر دەخاتەوە. بەهەمان شێوە ڕەنگ و شێوازی نووسینەکانیش هەڵگری دەلالەتی ڕیکلامیانەی خۆیانن و بێلایەن نین. چوارچێوەکە ئاماژەیە بە سنوور و دەرەوەی

خۆی. پەیامی قوتابخانەکە ڕوونە: ئەو پێڵاوانەی ڕێگەپێدراون و ئەوانەی قەدەخەن لە قوتابخانەدا منداڵان لە پێیان بکەن.

لەکاتی گفتوگۆمدا لەگەڵ بەڕێوەبەری پێشووی قوتابخانەی بەریتانیدا، جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەمکارە جۆرێکە لە سەپاندن و سەندنەوەی ئازادیی لە منداڵ لە پۆشینی پێڵاوی تایبەت بە خۆی. پێڵاو بەشێکە لە کەسایەتی مرۆڤ بە گشتی و منداڵان بە تایبەتی. لێکۆڵینەوەی دەروونناسیانە لە پێڵاو و ڕەنگ و فۆرمەکەی پەیوەندیی زۆر قووڵی نێوان کەوش و کەسایەتی مرۆڤ، بەتایبەتیش لە منداڵیدا دەخنە ڕوو: (http://www.jamnews.ir)، (http://all-that-is-interesting.com/fascinating-history-footwear)..

زۆرینەی ئەم پێڵاوانەی لەم وێنانەدا دیارن، هیچ منداڵانە نین. ئەمەش پێچەوانەی زەوقی منداڵەکان دەکەوێتەوە و ڕاهێنانیانە لەسەر شتێک کە ویستی ئەوانی لەسەر نیە. باشترین ڕێگا ئەوە بوو قوتابخانە لەناو چەند جۆری پێڵاوی منداڵانەدا کە لە بازاڕەکانی هەرێم دەستدەکەون، چەند دانەیەکی پێشنیار بکردایە و منداڵەکانی لە هەڵبژاردنی جۆرێکیاندا سەرپشک بکردایە و ئەم هەڵبژاردنەش ڕووبەڕووی دایکان و باوکان بکرایەتەوە.

پاشان شوێنی بەدەستهێنانی ئەم جۆرە پێڵاوانە دیار نەبوو، کە دەمانپرسی لە کوێ بیانکڕین و ئایا ئەوان ڕێنماییمان دەکەن لە دۆزینەوەی ئەو شوێنەدا، وەڵامەکەیان نەخێر بوو. ئەمەش گومانی لەلا دروستکردین کە جۆرێک بێت لە ڕێککەوتن لەگەڵ کۆمپانیایەکی تایبەت کە ئەمجۆرە پێڵاوانە دەهێنێت.. پێڵاوەکان پێدەچێت جۆرەکەیان باش بێت، بەڵام ستایل و ڕەنگ و فۆرمەکەیان هیچ منداڵانە نین. ژینگەی کوردستان و سەرما و گەرماش لەبەر چاو نەگیراوە و ئەو سزایانەش کە بۆ قوتابیان داندراون لەکاتی لەپێنەکردنیان، زۆر ڕووی ئەو سیستەمە پەروەردەییە سپی ناکەنەوە. پێخواسکردنی منداڵان بەناو قوتابخانەدا، مامەڵەی بەندیخانەی ڕژێمە تۆتالیتار و ستەمکارەکانمان بیر دەخاتەوە.

گفتوگۆکانم لەگەڵ بەڕێوەبەرەکە هیچ سوودیان نەبوو، ئەو لە پۆزشنی ئیدارییەوە بەرگریی لە کارە ناپەروەردەییەکەی دەکرد و منیش ناچاربووم لە دوو هەفتەدا بگەڕێم شێوە پێڵاوێکی ڕەش، بۆ منداڵەکانم بدۆزمەوە کە (پەسەندکراو)! بێت. ئێستاش کە ئەو منداڵە ناسکانە دەبینم ئەو پێڵاوە سەپێنراوانەیان لە پێدایە، لەو هەستە تێدەگەم کە لە پاشەڕۆژیشدا بەهۆی ئەم جەبرە پەروەردەییەوە، کەمێک زەوقیی خۆگۆڕیین و گرنگیدانیان بە خۆیان بمرێت.

بەمجۆرەش سیستەمێکی داخراوی پەروەردەیی، هابیتۆسێکی داخراویش بەرهەمدەهێنێت و دەسەڵات هیچ شوێنێک بۆ ئازادیی مرۆڤەکان ناهێڵێتەوە، تا خۆیان بن.

## زمانی داییک و قوتابخانە تایبەتیەکان..

بە ناچاریی دەبێت ئەم بەشە تەرخان بکەم بۆ قسەکردن لەسەر زمانی داییک لە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردندا. ئێمە لە هەرێمی کوردستان کتێبێکی زۆر باشمان هەیە لەسەر گرنگیی زمانی داییک (**سورخی** و ئەوانیتر: ***یادکردنەوەی ڕۆژی جیهانیی زمانی زگماک،*** ٢٠١٢)، کە من لێرەدا ناچمەوە سەری و لەو بارەیەوە دەدوێم کە زمانی داییک چ پەیوەندییەکی بە پەروەردەوە هەیە.

ساڵی ٢٠١٤ بەڕێوەبەری گشتی ڕێکخراوی یۆنسکۆ، بەبۆنەی یادی ١٤ ساڵەی ڕۆژی جیهانیی زمانی داییکەوە، وتارێکی گرنگیی پێشکەش کرد و تیایدا ستایشی زمانە خۆماڵییەکان و زمانی داییکی کرد، کە هەموویان پێشمەرجێکن بۆ (دروستبوونی هاووڵاتییەکی گەردوونی و تێگەیشتنێکی شایان لە بەرامبەر). هەروەها گوتبووی: **(ناسین و قسەکردن بە زیاتر لە زمانێک دەبێتە هۆی دەوڵەمەندیی و تێگەیشتنی زیاتر و مامەڵەی کولتووری زیاتر لە دنیای ئێمەدا). (گرنگیدان بە زمانە خۆماڵییەکان**

کەسەکان بەتواناتر دەکات تاکو دەنگیان بگەیەنن و لە چارەنووسی کۆیی خۆیاندا وەک یەکەیەکی چالاک بەشداریی بکەن). بۆیە هەوڵی یۆنسکۆ بۆ ئەوە بووە تاکو جۆرێ لە پێکەوە ژیان و هاوئاهەنگیی لە نێوان ئەو حەوت هەزار زمانەدا بهێنێتە ئاراوە کە لە جیهاندا قسەیان پێدەکرێت.

یەکێک لە خاڵە گرنگەکانی ئەم گرنگیدانەی یۆنسکۆ بە زمانی داییک و زمانە خۆماڵیەکان، شکاندنی ئەو درۆیە بوو کە زانستی دەبەستەوە بە توانایی تەنیا چەند زمانێکەوە، نەک کۆی زمانەکان و بەم هۆیەشەوە ئەم (ئەفسانە)یە لە میانەی ساڵەکاندا توانیوبووی زمانەکانی جیهان بەسەر دوو بەشدا پۆلێن بکات: ئەو دەستەیە لە زمانەکان کە زمانی (زانستی)ن و زانست و هزری زانستیی بەهۆیانەوە خۆی دەردەبڕێت و ئەمانە زمانە (بەهێزەکان)ن، لەوانەش زمانی ئینگلیزی، هەروەها ئەو دەستەیە لە زمانەکان کە زمانی لۆکاڵین و توانای گەیاندنی ناوەڕۆکە زانستیەکانیان نیە، کە ئەمەش هەموو زمانەکانی دنیای هەژار نیشینی میراتگرانی کۆلۆنیالیزمی دەگرتەوە.

ڕەنگدانەوەی ئەم هەڵبەستراوە ئایدیۆلۆژییە لەسەر زیهنییەتی خۆماڵی و لۆکاڵی قسەکەران بەم زمانانە، ئەوەبوو کە بەچاوێکی نزمتر و شەرمنانە تەماشای زمانی

خۆیان بکەن، چونکە ناتوانێت بابەتەکانی وەک زانست و فەلسەفە و بیرکاری و فیزیا و کیما و تەکنەلۆژیا بگەیەنێت. ئەم نیگایە وایکرد جۆرێ لە بڕیاری پێشینە بەسەر ئەو زمانانەدا بسەپێنرێت و دووچاری بەخۆدا شکانەوەیەکی مێژووییان بکات. لە ئاست زمانی کوردیدا ئەم دیدە وەک چەکێک بەدەستی ئەو ڕژێمانەوە بەکار هات بۆ ئەوەی لە ڕووی یاساییشەوە زمانی کوردی قەدەخە بکەن، بەتایەتی لە تورکیا، ئێران و تا ڕادەیەکیش لە عێراقدا. هەر لەو وتارە گرنگەیدا، خاتوو (ئیرینا باکۆڤا) دەنووسێت: (**بە پێچەوانەی زەینییەتی گشتیی باوەوە، زمانە خۆماڵییەکان بەتەواوی توانای گواستنەوەی زانستی مۆدێرن، بیرکاری، فیزیا، تەکنەلۆژییان هەیە**) هەروەها دەشنووسێت: (**ئەم زمانانە بنەمای تێگەیشتن و زانستی ئێمە پێکدەهێنن.. قەدەخەکردنی ئەم زمانانە بەمانای بێبەشکردنی مرۆیە لە حەقێکی بنەمایی خۆی بۆ دەستڕاگەیشتنی بە زانست**) (http://www.jayhon.com).

ئێستا پاش باجێکی قوورس، لانیکەم زمانی کوردی و تواناکانی و پاش وەرگێڕانی دەیان کتێبی زانستی و فەلسەفیی بۆ ئەم زمانە لە قورسترین بەرهەمی فەیلەسووفەکانی وەک ئەریستۆتالیس، سپینۆزا، کانت و هایدەگەر و سلۆتەردایک، هەروەها پاش چەندین دەیەی

خوێندنی زانستەکانی وەک بیرکاری و فیزیا و کیمیا بەم زمانە، ئەوەی سەلماندووە کە توانایی تایبەت بە خۆی هەیە و زۆر بەباشیش دەتوانێت زانست و بابەتە قورسەکانی زمانە زیندووەکان لە خۆیدا جێبکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاڵاهەڵگرانی سەردەستەیی زمانی بیانی و بەتایبەتیش ئینگلیزی هەر ماون و لێرە و لەوێ بە شمشێری سەردەستەکان، ئەم زمانە بریندار دەکەن. هەندێکیش لە سەردەستەیی زمانەکانی وەک فارسی و عەرەبییەوە، دەڕواننە زمانی کوردی و ئەو نیکاکۆلۆنیاڵیستیە ستەمکارانەیان بەدەروونیکردووە. لەوەش مەترسیدارتر و دەردەدارتر ئەوەیە کە بەشێوەیەکی یاسایی و دانپێدانراو، حکومەتی هەرێم و وەزارەتی پەروەردەکەی، بۆتە ڕەواجبەخشی ئەم ئەفسانەیە کە هیچ نیە جگەل میراتێکی دیکەی کۆلۆنیاڵیزم.

لەم ناوەدا، پەرپووتخانەی سیاسەتی بازاڕ و بەتایبەتیش قوتابخانە پەرپووتە تایبەتیەکانی هەرێم، سەرمەشقی ئەم بیرۆکەیەن و ئەمەش وایکردووە، ئەم زمانەی ئێمە هێشتاش لە بەردەم مەترسی گەورەدا بێت و لەو قوتابخانە ڕێپێدراوە بیانیانەدا، بە پەراوێز بخرێت. بێگومان ئەگەر ئەمە دۆخی زمانی کوردی بێت لەم هەرێمەدا، لە وڵاتی ئێران و تورکیا زۆر خراپترە و ئەوان زیاتر هەست بەم ستەمە

دەکەن. (بڕوانە: مولودی) و (ئەنوەر ئەسەدزادە).
(http://www.ziryan.ir/).

هیچ گومان لەوەدا نیە، کە زمانی ئینگلیزی زمانی زانستە و توانابیەکی مەزنی هەیە بۆ گەیاندنی ئەو بابەتانەی لە زۆربەی زمانانی دیکەدا، تووشی ئاستەنگ دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم توانابیەی زمانی ئینگلیزی هیچ بەڵگە نیە لە سەر بێ توانایی هێزەکیانەی زمانی کوردی، ئەگەر دەرفەتی بۆ بڕەخسێت تا خۆی بە شێوەیەکی کردەکی بەرجەستە بکات. لەوەش بترازێت، کە ئەم زمانە و زمانە (بەهێز)ەکانیتر، زانستیان لەسەر خۆیان تاپۆ نەکردووە. ***بنەماکانی تێگەیشتنی هەر جۆرە زانستێک لە تێگەیشتنی پێشزانستیانەی هەر زمانێکدا هەن، کە ڕەگوڕیشەیان لە ئەزموونی ئاخێوەرانی ئەو زمانەدا داکوتاوە.*** واتە پرانسیپی تێگەیشتن لە زانستی ڕووت، لەو تێگەیشتنە پێش زانستییەدا ئامادەن کە ئاخێوەرانی زمانەکان لە ئەنجامی ئەزموونی ژیانەکی خۆیانەوە بەدەستیان هێناوە. کلیفۆرد کۆرنەر لە کتێبە نایابەکەیدا (**مێژووی زانستی خەڵک**)، ئەم بۆچوونەی بە تەواوی ڕوونکردۆتەوە و بەڵگە و نمونە گەلێکی زۆری هێناوەتەوە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییەی پێماندەڵێت ئەوەی لە ئێستادا ئێمە وەک زانستێکی پەتیی و لە زانکۆ و

تاقیگاکان و بنکەکانی توێژینەوەدا دەیناسین، لە بنەمادا پێشینەیەکی لە سەر شەقام و لەلای خەڵکی ئاسایی هەیە کە لە ئەزموونی ژیانی خۆیانەوە پێی گەیشتوون (کۆرنەر: ٢٠٠٥، ل: ١١-١٢).

هەر بۆیەشە بەرپرسە باڵاکەی یۆنسکۆ لە وتارەکەیدا بە ئاشکرا نووسیویەتی: (**ناسینی زمانە لۆکاڵییەکان بە مانای کردنەوەی دەرگایەکە بۆ مامەڵەکردنێکی مەزنتر بە مەبەستی دەوڵەمەندکردنی زانستی گشتیی، بە سوود وەرگرتن لەو نەریتانەی نەناسراون.**) هەروەها دەشڵێت: (**ئەم زمانە لۆکاڵیانەی لە هەر چواردەوری جیهاندا قسەیان پێدەکرێت، بنەمای زانینی ئێمە پێکدەهێنن**) (http://www.jayhon.com).

بۆچی زمانی دایک لە قوتابخانە تایبەتیەکاندا بەپەراوێز دەخرێت؟ ئایا وەزارەتی پەروەدەی حکومەتی هەرێم ئاگاداری ئەم هەڵوێستەی قوتابخانە تایبەتیەکانە و ئایا ئەمە هەڵوێستێکی یاساییە یان نا؟ تا چەندە ئەمە ناعەدالەتیە لەو فێرگانەدا کە تیایدا چەندین منداڵ هەن بە زمانی جیاوازی دایکیی خۆیانەوە؟ ئایا ملکەچکرنی هەموو زمانەکان بۆ ژێر ڕکێفی یەک زمان شتێکی ڕەوایە؟ ئەگەر زاراوەی تایبەتی بە جیدیی وەربگرین پێویستە بۆ هەر کۆمەڵە منداڵێک، کە زمانی دایکییان جیاوازە، مامۆستای تایبەت و گرنگیی بە

هەر یەکێک لەو زمانانە بدرێت تا تەمەنی هەشت ساڵی، نەک هەموویان ناچار بکرێن یەک زمان فێر بکرێن و زمانی دایکییان بخرێتە پەراوێزەوە.
جاران لە قوتابخانەدا وانەی وێنە و وەرزش دوو وانە بوون دەخرانە کۆتایی دەوامەوە، هەر لەبەر ئەوەش وەک دوو وانەی گریمانەکراو بۆ پشوو تەماشایان دەکرا. قوتابخانە تایبەتییەکان و پەرپووتخانە سوودخوازەکانی هەرێمی کوردستان، زمانی دایکیشییان بە هەمان چارەنووس گەیاندووە. ئایا زیانەکانی ئەم هەڵوێستە ناپەروەردەییە لە چیدان، تا چەندە لەگەڵ مافی مرۆڤ بۆ فێربوونی زمانی دایک ناکۆک دێنەوە و گەلێک پرسیاری دی.. بەو دیوی تریشدا، ئایا یەکزمانی تا چەندە زیانبەخشە، تا چەندە زمانی ئینگلیزی و ئەو بەپیرۆزکردنەی لەم قوتابخانانەدا لە پێناوی زانست و پێشخستنی قوتابی و منداڵەکاندایە و لە پشت ئەمکارەوە، ئەم زمانە چیتریش لە دنیای منداڵ دەکات و چ ڕوانینێکی بۆ دروستدەکات.. ئەمانە بەشێکی ئەو پرسیارانەن دەمەوێت لەبارەیانەوە بهزرم و بیروڕاگەلێک لەبارەیانەوە ڕوونبکەمەوە.
لە ڕوانگەی سیاسیی، یاسایی و پەروەردەییەوە، هەروەها لە ڕوانگەی گەشەی منداڵەوە، فێربوون بە زمانی دایک مافێکی سرووشتیی مرۆڤە چونکە ئەمە زەمینەی فێربوونی

هەر زمانێکی دیکەش دەهێنێتە بەرهەم.. لە بەشی پێشووتردا ئەوەم خستە ڕوو، کە منداڵ پێویستی بەوەیە کە هەتاکو تەمەنی هەشتساڵی بەبێ پچڕان و دابڕان بە زمانی دایک فێر بکرێت و بنەماکانی تێگەیشتن و گوزارشکردن لە خۆی، لە چوارچێوەی ئەو زمانە شوناسبەخشەدا بدۆزێتەوە و پتەوی بکات تا ئەمەش ئامادەی بکات بۆ فێربوون و گوزارشکردن لە خۆی بە چەند زمانێکی تریش..

## بە پیرۆزکردنی زمانی ئینگلیزی و دەرئەنجامەکانی:

قوتابخانە تایبەتییەکان لە هەرێمی کوردستاندا، ڕێک بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە زانستی و مافناسانەیەوە ڕەفتار دەکەن. زمانی دایک لەو قوتابخانانەدا تەواو بە پەراوێز دەخرێت و لە بەرامبەر ئەمەشدا زمانی فەرمی و باڵادەستی قوتابخانەکان، بە تایبەتیش زمانی ئینگلیزی بە پیرۆز دەکرێت. لێرەدا دەبێت کۆی ئەو ڕەهەندە باشانەی فێربوونی زمانێکی وەک زمانی ئینگلیزی هەڵپەسێرین و گومان لە گرنگیی ئەم زمانە نەکەین، کە شتێکی بەڵگە نەویستە. قسە لەسەر پێویستیی قوتابیان و سیستەمی خوێندنی ئێمە بە زمانی ئینگلیزی و کۆمەڵگای ئێمە بەم زمانە و زمانیکەی جیهانی، نیە. کێشەکە ئەوەیە ئامانجەکە

لە پەروەردە و سیستەمەکەیدا ببێتە زمانی ئینگلیزیی و پشتکردن لە زمانی کوردی و زمانە لۆکاڵە فەرمییەکانیتر.
سەبارەت بە زمانی ئینگلیزیی، دەبێت ئەوەش بزانین، ئەم زمانە هەر تەنیا زمانی فێربوونی زانست نیە، بەڵکو زمانی بەرجەستەکردنی فۆرمێکیشە لە تێگەیشتن و حوکمدان بەسەر دنیادا، کە هەڵگری کۆی ئەو دەلالەتانەیە مێژووی ئەم زمانە هەڵگریانە لە ئاست (ئەویتر)دا، کە قۆناغی کۆلۆنیالیزم کردونی بەبەشێک لە ناخودئاگای ئەم زمانە و لەم ناوچەیەدا شوناسی خۆی لەسەرەوە هەڵچنیوە.
ئەوەی کە دەبینین لە ناو قوتابخانە تایبەتییەکاندا زمانی ئینگلیزی لەچاو زمانە خۆجێیەکانی وەک زمانی کوردیدا، ئەوەندە بەپیرۆز دەکرێت، شتێکی بەتەنیا زانستیی نیە، بەڵکو سیاسیشە. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئامادەیی ئەم زمانە لەم ناوچەیەدا و لە بنەمادا ئامادەییەکی زانستیی و پەروەردەیی نەبووە، هێندەی ئەوەی ئامادەییەکی سیاسیی، قۆرخکارانە و داگیرکەرانە و سەربازی بووە.
ئەم بەپیرۆزکردنە تەنیا بۆ ئەوە نیە ئاستی (خزمەتگوزاری زانستی) بۆ قوتابیانی لۆکاڵ بەرزبکرێتەوە بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بدرێتە ئەو نرخە زۆرەی ئەم خزمەتگوزارییەی پێ (دەفرۆشرێت). بەڵکو ئەم زمانە وەک کاڵایەکی بازرگارنییش مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت بۆ بەدەستهێنانی

سوودی زۆرتر. لێرەدا دەتوانین بڵێین: ئەوەی کە لەناو ئەم پەرپووتخانە تایبەتیانەدا زمانی ئینگلیزی ئەوەندە بەپیرۆز دەکرێت، مەسەلەکە دڵسۆزیی ئەم دامەزراوانە نیە بۆ زمانی ئینگلیزی، چونکە ئەم دڵسۆزییە بە هۆی پسپۆڕانی تایبەتیی ئینگلیزیی زمانەوە لە ئینگلستان دەنوێنرێت، نەک بە هۆی مامۆستای لۆکاڵییەوە لە قوتابخانە تایبەتیەکانی هەرێمدا. بەڵکو ئەم دڵسۆزییەی حکومەتی هەرێم و وەزارەت و قوتابخانە بازرگانییە تایبەتییەکانیان، شێوەنە بۆ ئەو سوودەی لە ڕێگەی بەفەرمیکردنی زمانی ئینگلیزییەوە و لەوێشەوە بۆ ڕازییکردنی (زەینییەتێکی ئیستیعماری) کە باڵی بەسەر هەرێمەکەدا کێشاوە، ئەنجام دەدرێت.

بەپیرۆزکردنی ئەم زمانە، وەکئەوەی لە ڕێگەی (کۆنفرانس) و (ئێوارەتەشریفاتی) و (مەراسیمە فەرمییەکانی حکومەتی هەرێم)ـەوە جێبەجێدەکرێت و وەکئەوەی زمانی فەرمیی هەموو (کۆمپانیا بازرگانی) و (نەوتییەکان) و (میدیاکان) و وەکئەوەی لە (قوتابخانە پەرپووتە تایبەتیەکان)دا پراکتیک دەکرێت و دواجاریش وەکئەوەی لە زمانی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمەوە دەبیستین بۆ (کردنەوەی قوتابخانە بە زمانی ئینگلیزی)، هەر هەمووی لەیەک بنەوانەوە ئاو دەخۆنەوە: خۆبەکەمزانیی و هەستکردن بە

بچووکی و گەورەکردنی ئەویتر، لە ڕێگەی بەپیرۆزکردنی زمانەکەیەوە.

ئەم زمانەی لەم بۆنانەدا بەکار دێت و ستایش دەکرێت، زمانی شکسپیر، دیکنز، زمانی جۆن لۆک و هیوم، زمانی ئیلیەت و ڤیرجینیاڤۆلف و هێمنگوای و فۆکنەر و شێمۆس هێنی، نیە. بەڵکو زمانی ڕۆژانەی بازرگانیی و تەکنەلۆژیایە. زمانی میتافۆر و وێنە و خەیاڵ و داهێنان نیە، بەڵکو زمانی ئیدارە و یاسا وردەکانی ڕاستەڕێی دیپلۆماسی و سوودخوازانەی دنیای گلۆباڵیزم و دیجیتاڵیزمە. ئەم ئاستە لە زمانی ئینگلیزی ئەوە نیە کۆی زمان و شوناسی کوردبوونی بۆ بکەینە قوربانیی و ئەوەندە بە دەروونی بکەین، لەوسەرەوە ببینین زمانەکەی خۆمان لەبیر کردووە و لامان سووک بووە و بەپەراوێزمان خستووە. چونکە هەموو بەدەروونیکردنێکی خۆبەکەمزانی و شاردنەوەی شکست لە ئاست زمانێکدا، دواجار دەبێتە بەدەروونیکردنی لەناو کولتووری زمانی خۆماڵیدا و لەوێشەوە شکستهێنان بە پرۆسەی دروستکردنی شوناس بەهۆی ئەم زمانە خۆماڵییەوە. ئەمەش دەبێتە چەکێکی بەهێز بۆ داگیرکەر و ڕژێم و ئایدیۆلۆژیا نەیارەکانی دژ بە بوونی سەربەخۆیانەی ئەم نەتەوەیە و هێشتنەوەی لە پەراوێزدا.

بەمجۆرەش بەڵگەیەک دەدەینە دەست ئەو هێرشانەی بەناوی (کەمینەیی و نازانستیبوون و محەلییبوونی زمانی کوردییەوە)، دەکرێنە سەر زمانەکەمان و (عەرەبی دەبێتە هونەر و فارسی دەبێتە شەکر) و تورکیی و ئینگلیزیش دەبنە جێگرەوەی ئەو پڕۆژانەی کە کۆڵۆنیاڵیزمی بەرایی نەیانتوانیی تەواوی بکەن و زمانی سەردەستەی بازرگانیی و بازاڕە ئازادەکەی حکومەتی هەرێم بۆیان تەواو دەکات. جا ئەگەر کەسانێک هەبن لەو بڕوایەدا بن کە کۆڵۆنیاڵیزم جودایە لەو فۆرمە زمانییەی لە ڕێگەیەوە گوزارش لەخۆی دەکات، دەبێت بەڵگەی ئەوەش بخەنە ڕوو کە بۆ دورستبوونی شوناسی نەتەوەیی، پێویستیمان بە زمانی نەتەوەیی نیە.

نمونەیەک لێرەدا پێویست بێت، ئەوەیە بڕوانینە زمانی نووسینی نووسەرانی کوردی ڕۆژگاری کۆڵۆنیاڵیزم، کە چۆن لە ڕێگەی زمانەوە بەرەنگاریی سیاسەتی ئیستیعمارییان کردووە و لە هەوڵی گەشەپێدانی زمانەکەیاندا بوون. کاتێک من بەرهەمی کەسانی وەک پیرەمێرد، ئەمین زەکیبەگ، تۆفیق وەهبی، ڕەفیق حیلمی، ڕەشید نەجیب، فایەق بێکەس، شێخ محەمەدی خاڵ، گۆران، عەلائەدینی سەجادی و گەلێکی دیکەیان، دەخوێنمەوە و لەگەڵ نووسەرانی ئێستادا بەراووردیان دەکەم، دەبینم

زمانی ئەوان زۆر لە زمانی باشترین کوردینووسە ئەکادیمیەکانی ئەم ڕۆژگارەمان ڕوونتر و کوردیترە. ئەمەش لەبەر ئەوەی بۆ ئەوان زمان بەشێک بوو لە شوناسی نەتەوەیی قەت بچووکنەدەکرایەوە لە تەکنکیی نوسینی (نامەیەکی بەناو زانستی)دا و هەرگیز لە ڕوانگەی ئەوانەوە زمانێکی پیرۆزتر لە زمانی کوردی نەبووە.

ئەمڕۆ کە دەبینین زمانی کوردی لە پەراوێزدایە و زمانی دیکە بوونەتە ئامرازی لەپێشچاوخستنی زمانی نەتەوەییمان، ئەو هەژارییە فیکریی و ڕۆحییەش دەبینمەوە کە لە پەراوێزخستنی زمانی خۆماڵیدا، دووچارمان بووە. قسە لەسەر ئەوە نیە زمان پیرۆزە یان نا، بەڵکو قسە لەسەر ئەو پەیوەندییە جەوهەرییەی نێوان زمان و کەسایەتیی مرۆڤ و زمان و شوناسی تایبەت و گشتییە. (هەرچەندە لە وتارێکی دیکەدا وردتر و تیۆریکتر قسە لەسەر زمان و شوناس دەکەم)، بەڵام دڕندەترین ئایدیۆلۆژی (چ بەناوی سیاسەت، یان هاوبیروڕایی سیاسیی، یان بازرگانی، یاخود زانستی و پەروەردەییەوە)، ئەوەیانە کە لەسەر حستابی زمانی داییک، مافی بوونی میللەتێک، یان گرووپێک، لەناو ئەو زمانەی خۆیدا، لەو میللەت و گرووپە دەستێنێتەوە. بێگومان ئەگەر ئێمە پێمانوابێت، لە چوارچێوەی ئەزموونی

حکومەتی هەرێمدا شوناسی زمانیمان پارێزراوە و لە ئاساییشدایە، هەڵەیەکی گەورە دەکەین.
ئەو مەترسییانەی لەسەر زمانی کوردیی لەم هەرێمەدا و لە مەودای حوکمڕانیی کوردیدا دروستبوون، هیچیان کەمتر نیە لەو مەترسیانەی لەسەر زمانی کوردی لە وڵاتانی وەک تورکیا و ئێران و سوریای جاراندا، هەن. هەرگیز هێندەی ئەم ماوەیەی حکومەتی هەرێم هەیە زمانی کوردی (بە ئایینیی) و (بەئایدیۆلۆژیی) حزبی نەکراوە، ئیدی لە سایەی ئەم سیاسەتەدا هیچ کات ڕەنگەکانی (زەرد، شین و کەسک و پرتەقاڵی) بەتەنیا شین و سەوز و زەرد و پرتەقاڵیمان بیر ناهێننەوە، ئەگەر لەگەڵیشیدا ئەو دەلالەتە ئایینی و حزبیانەمان بیر نەکەوێتەوە کە بۆیان دروستبوون. ئیدی وشەی (پەڕۆ) هەمان مانای جارانی نیە، بۆ پێچانی برین و نێوچەوان، بەکار دەهات و لە مەزارگەکاندا بە درەخت و کێلی قەبرەکانەوە هەڵدەواسرا، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ وشەی (شەڕ)دا مانای دیکەی هەیە و گوزارشە لە (شەڕێک کە تیایدا ئاڵا و ڕەنگەکان بەکار دەهێنرێن): شەڕە پەڕۆ..

## کێشەی زمان لە هەرێمدا:

بۆچی هەرێمی کوردستان بووە لانکەی نازکێشانی زمانە سەردەستەکان و بێ نازکردنی زمانی کوردی؟ وەڵامی ئەم

پرسیارە پەیوەستە بە وەڵامدانەوەی پرسیارێکیترەوە کە دەڵێت: بۆچی پرۆسەی شوناس لەم هەرێمەدا، وێڕای سەربەخۆییە نیمچە ئیداریی و سیاسیی و کولتوورییەکەی، بەبەراوورد بە بۆ نمونە، بەشی خۆرهەڵاتی کوردستان کە بەشێوەیەکی سیستەماتیک و لەلایەن کۆماری ئیسلامییەوە، ڕێگریی لە زمانی دایک دەکرێت، شکستی هێناوە؟ بۆچی زمانی کوردی لەو بەشەی وڵاتەکەماندا کە سەربەخۆ نیە، لە گەشەیەکی بەردەوامدایە و لە باشووردا گەشەی زمان وەستاوە؟

وەڵامی سادە و خێرای من ئەمەیە: لەبەر ئەوەی لە باشووردا پەیوەندیی نێوان زمان و شوناس کراوەتە قەزاوەگێڕی عەقڵیەتێکی بازرگانی کە زمانی ئینگلیزی و هاوشێوەکانی و بەپیرۆزکردنی ئەم زمانانە بۆتە هۆی پەراوێزخستنی زمانی کوردی. (ئەمیر حەسەنپوور:٢٠١٥) کەچی لە خۆرهەڵاتی کورستان و لەگەڵ ئەو هەموو ڕێگرە کولتووری و حوکمە پێشوەختانە و ئاستەنگە یاساییانەی بۆ زمانی کوردی دروستدەکرێن، ئەم زمانە لەگەشەیەکی بەردەوامدایە و پرۆسەی زانستیی و ڕۆژنامەوانیی و هزریی دەباتە پێش، کە هەرچەندە لە ڕووی چەندایەتیەوە هێندەی ئەوەی باشوور نیە، بەڵام لە ڕووی چۆنایەتییەوە زۆر وردتر و زانستیانەترە. بگرە هزری میتازمان، (ئەو

بەشە لە زمان کە لە زمان خۆی دەکۆڵێتەوە و لێی دەهزرێ)، لە خۆرهەڵاتدا زۆر تیۆریک ترە لەو میراتە فیلۆلۆژییەی لە باشوور مێژوویەکی بۆخۆی دروستکرووە و لە ڕووی ئایدیۆلۆژیەوە بەشێکی زۆری پەیڕەوکاری میتۆدە بەسەرچووەکانی جارانی شوورەوییە. ئەم نمونەیەم بۆیە هێنایەوە تا ڕوونیبکەمەوە، کە سەقامگیریی سیاسی و سەربەخۆیی کارگێڕی بە تەنیا و بەبێ سیاسەتێکی زمانناسیانە، کە لەسەر بنەمای پتەوکردنی زمان و شوناس وەستابێت، بەس نین بۆ گەشەی زمان و لەوێشەوە پتەوبوونی شوناسی نەتەوەیی.
ئێستە ئێمە دەزانین کە لەم هەرێمەدا هیچ سیاسیەتێکی زمانی نیە، کە دەبێت بەشێک بێت لە سیاسەتی کولتووری، تەنیا سیاسەتێک هەیە، سیاسەتی بەپیرۆزکردنی ئاستێکە لە زمانی ئینگلیزی  و لەپیرۆزخستنی هەموو ئاستەکانی زمانی کوردی. ئایا ئەو ئاستەی زمانی ئینگلیزی لەم وڵاتەدا ئەوەندە زانستی بەرهەمهێناوە تا زمانی کوردی بۆ بکرێتە قوربانی، ئایا زمانی کوردی ئەوەندە بێتوانایە لە ئاست زانستدا، کە وەزارەت سەباری ئەو هەموو پەرپووتیەی کەرتی تایبەت بۆ زمانەکەمانی هێناوەتە پێش، بیر لە کردنەوەی قوتابخانەی ئینگلیزیی بکاتەوە، لە جیاتی

بیرکردنەوە لە گەشەدان بە زمانی کوردی لە سەراپای سیستەمەکەدا؟
جارێکی دیکە ئەوە دەڵێمەوە: زمانی ئینگلیزی و زمانە بیانیەکانی دی گرنگیی زانستی و کولتووریی خۆیانیان هەیە و پێویستە منداڵانی ئێمەش فێری ببن، بەڵام ئەو زمانە ئینگلیزییەی لەم هەرێمەدا ئەو هەموو قوربانییەی بۆ دەدرێت و زمانی کوردی پێ ڕیسوا دەکرێت، ئەو زمانە نیە کە هەڵگریی کۆی ڕەهەندەکانی شارستانیەتی زمانی ئینگلیزیە. ئەوەی لە هەرێمی کوردستان زمانی ئینگلزیی بۆ کراوەتە دروشمی سەرە ڕمب و لە پشتییەوە خۆبەکەمزانیەک لە ئاست مۆدێرنیتە و زانستدا، دەشاردرێتەوە، هەموو هێزی زمانی ئینگلیزی و گشت ڕەهەندەکانی ئەم زمانە نیە.
خودی ئەم بەکارهێنانەی زمانی ئینگلیزی لە جیهانی سەرمایەداریەتی ئەمڕۆدا و لە نووسخە خۆبەکەمزانە مشەخۆرە کوردییەکەیدا، خاڵیی نیە لە هەڵاواردنی ڕەهەندە داهێنەرانە و ڕۆحیی و فیکرییەکەی ئەم زمانە و وەلاخستنی، چونکە بەکاری بازاڕگەری و ساتوسەودا نایەت. یەکەم ستەم کە ڕەهەندە بازرگانی و تەکنەلۆژییەکەی زمانی ئینگلیزی لە خودی ئەم زمانەی کردووە، بریتیە لە تووڕدانی ڕەهەندە مەعنەوی و ڕۆحیی و

شارستانیەکەی ئەم زمانە. بۆیە کاتێک سیستەمی پەروەردەیی و سیاسیی ئێمە ئەم هەموو قوربانییە بۆ زمانی ئینگلیزی دەدات، جگە لە سواربوونی گایەکی هار کە گوایە دەیگەیەنێت بە پانتایی خۆنوێنی (مۆدێرنیتە) و (پێشکەوتن) و (زانست)، هەروەها بۆ پڕکردنەوەی شەبەقێکی مەزن لە دەزگای هزریی و عەقڵیی خۆیدا، مەبەستێکی بازرگانیی ڕووتیش لە پشتییەوەیەتی، چونکە لە ڕێگەی بە دروشمکردنی ئەم زمانە و هاوشێوەکانیەوە، کاڵاگەلێکی زۆر لە بازاڕی ئازادیی هەرێمدا ساخ دەبنەوە. بەڵام مەترسییەکەی ئەم ڕەواجپێدان و زمانپەرستییە لەوەش زیاترە، چونکە بەهەمهێنەرەوەی دیدێکی بەخۆدا شکاوە لە ئاست سەردەستەیی داگیرکەرانەی زمانێکدا کە زمانی فەرمی داگیرکەرانی ئینگلیز بووە لەم هەرێمەدا.
لە ئێستادا ئەم زمانە لەناو سیستەمی پەروەردەیی ئێمەدا تەنیا پردێک نیە بۆ بەستنەوەی منداڵانی ئێمە بە زانست و بابەتە پەروەردەییەکانەوە، بەڵکو بەستنەوەشیانە بە یادوەریی ئەم زمانەوە، کە یادوەرییەکی کۆلۆنیاڵیستانە بووە. ئەمەش لەبەر ئەوەی زمان لە بنەمادا کۆمەڵێک نیشانە و کۆدی واتا دارە، کە ناتوانێت خۆی لەو دەسەڵاتە خاوێن بکاتەوە، کە لە ڕێگەیەوە قسەی خۆی دەکات و خۆی بە سرووشتیدەکات و ڕوانگەی مرۆیەکان لەسەر

خۆیان و له پەیوەندییان بە دنیای خۆیان و دەوروبەریانەوە دەگۆڕێت.

یەکێک لەو لێکۆڵینەوە دەگمەنانەی ئەم بۆچوونە پشتڕاستدەکاتەوە، کارە هاوبەشەکەی (ئابیدۆگۆن گیبۆیکا) و هاوڕێکانێتی بەناوی (***بەشداریی و ڕۆڵی فێربوونی زمانی دایک لە سەرەتاکانی قۆناغی منداڵێتیدا***، ٢٠١٣). هەروەها باسەکانی خاتوو جینوا سپێرمەن: (http://anthropology.ir) و گەلێکیتر.

ئەم توێژەرانە لە دۆخی زمان لە وڵاتێکی وەک (نێجریا)یان کۆڵیوەتەوە بەو پێیەی وڵاتێکی فرەزمان و پاشماوە و میراتگریی کۆڵۆنیاڵیزمە. ئایا زمانی دایک و زمانە لۆکاڵییەکان کە ژمارەیان لە (٣٩٥ زمانەوە بۆ ٢٠٠٠ زمان) هەژمارکراون، لە بەرامبەر زمانی ئینگلیزیدا، کە لەسەردەمی کۆڵۆنیاڵیزمەوە وەک زمانی خوێندن و پەروەردە بەکارهاتووە، چییان بەسەر دێت؟

ئەم توێژەرانە ئاماژە بەوە دەکەن کە لەناو ئەو ژمارە زۆرەی زمانی لۆکاڵیدا، کە لەو وڵاتەدا هەیە، تەنیا زمانی ئینگلیزی زمانی هەموو قۆناغەکانی خوێندنە و کۆی زمانەکانیتر پشتگوێ خراون، جگە لە سێ زمانیان ئەویش بە هۆکاری سیاسیی و کۆمەڵایەتی. بەمجۆرەش زمانی ئینگلیزی کە زمانی دایک نییە لەو وڵاتەدا، جێگەی چەند

سەد زمانی گرتۆتەوە و ڕۆڵێکی ستەمکارانەی هەیە بەسەر ئەو زمانانەوە. هۆکاری ئەمە چییە؟ بێگومان یەکەم هۆکار ئەوەیە زمانی ئینگلیزی ئەم پێگەیەی بەهۆی دەستگا سەرکوتکەرەکانی دەوڵەت و ڕەزامەندیی ناچارەکیانە و ملکەچیی خەڵکە لۆکاڵییەکەوە، بەدەست هێناوە. چ ئەو خەڵکە خۆجێییەی وڵاتەکە، کە بەشێوەیەکی سیمبوولیی و وەک بەهایەک زمانی ئینگلیزییان بەکار هێناوە و چ ئەو کەسانەی لە وڵاتانی دیکەوە گەڕاونەتەوە، (وەک کۆیلە خوێندەوار و ئازادکراوەکان)، بە زمانی ئینگلیزی ئاخاوتوون و ئەم زمانەیان وەک فیزێک بە خەڵکی لۆکاڵ فرۆشتۆتەوە و بوونەتە هۆی دروستکردنی مەیلێکی باش لەسەر ئەم زمانە. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە خەڵکە لۆکاڵەکە دەست لە زمانی داییکی خۆیان هەڵبگرن و وەک زمانێ (خراپ) لێی بڕوانن و لە قسەکردندا پەنا بۆ زمانی ئینگلیزی ببەن.

ئەم لاساییکردنەوە و بەپیرۆزکردنەی قسەکردن بە زمانی ئینگلیزی، بۆتە هۆی ئەوەی لە سەدا هەشتا و زیاتری چینە دەستڕۆیشتووەکانی خوارووی وڵاتی نێجیریا، لەگەڵ منداڵەکانیان کە هێشتا لە تەمەنی خوار باخچەی ساوایانیشدا بوون، لە ماڵەوە بە ئینگلیزی قسە بکەن، نەک بە زمانی داییک.

وەک توێژەرێکی دیکەش دەریخستووە، ئەم هەلومەرجانە وایانکردووە هاوسەنگیی نێوان زمانی ئینگلیزی و زمانە لۆکاڵییەکان بە قازانجی زمانی ئینگلیزی بشکێتەوە، ئەمەش تا ئەو سنوورەی زۆرینەی نێجیرییایە خوێندەوارەکان ناتوانن بە زمانی دایکی خۆیان بخوێننەوە و بنووسن (http://right-to-childhood.com/).

کێشەی ئەم ناهاوسەنگیە هەر تەنیا لەوەدا نیە کە هاووڵاتیی لۆکاڵ نامۆ دەبێت بە زمانی زگماکی خۆی، بەڵکو نەبوونی زمانی زگماک لە قۆناغی یەکەمی ساڵانی منداڵییدا، بەتایبەتی تا هەشت ساڵەیی و (هەندێکیتریش دەڵێن تا یازدە و سیانزە ساڵی)، بۆشاییەکی گەورە دەخاتە دەزگای سۆزداریی و گەشەی زەینیی و کۆمەڵایەتی و فیزیکیی منداڵەوە و کەسایەتیی منداڵ عەیبدار دەکات، چونکە بناخەی کەسایەتی منداڵ لەم قۆناخەدا دادەمەزرێت. زمانی زگماک پەیوەندییەکی نزیک و بێ جێگرەوەی نێوان منداڵ و دایکە و بە هیچ شتێکی دی پڕ نابێتەوە. هەر لەبەر ئەوەش کۆی ئەو یاسا و ڕێپێدانانەی لە کۆمەڵگایەکی وەکئەوەی هەرێمی کوردستاندا، ناهەوسەنگیی زمانی دروستدەکەن کە بە زیانی زمانی دایک تەواو ببێت، ڕێپێدانی ڕەوا و چوونیەک لەگەڵ پەروەردە و گەشەی منداڵ، نین..

توێژەرێکی ئێرانی، (عشایری، ٢٠١٥)، کە پسپۆڕە لە بواری دەمارناسیی و مێشکدا، نوسیویەتی: (زمانیی دایک هەندێ ئاسانکاریی تێگەیشتن دەهێنێتە ئاراوە. ئێمە بە هۆی زمانەوە جیهان دەناسین. ئەو تێگەیشتنانەی بەدەستیان دەهێنین، لە یادوەریی خۆماندا بەرهەمدەهێنینەوە و بەهۆی زمانەوە دەیانخەینە ڕوو. بۆیە زمان بە تەنیا قسە کردن نیە، بەڵکو هۆش و خرۆشی سۆزی مرۆڤیشە. بۆیە جەوهەری مرۆڤ بە زمانی داییک شرۆڤە دەکرێت. لەبەر ئەوە پێویستە زمانی داییک بخوێندرێت و نەتەوە و شوناس لە زمانی داییکدایە).

بۆ سەلماندنی ئەم خستنەڕووەش، ئەو توێژەرە پەیوەندیی نێوان ژیانی مرۆیی و زمان زیاتر شییدەکاتەوە و دەنووسێت: (ئێمە زمانێکی ناخەکیمان هەیە کە جیاوازە لە قسە و نووسین. زمانی ناخەکی بەرهەمهێنەری قسەیە بەڵام ئەوەی دەیداتەوە، هەمان ئەو شتە نیە لە ناخدا ڕوویداوە. هزرین بە زمانی ناخەکیی مرۆڤ دەبێت، ئەوەی زمان دەریدەبڕێت، لەگەڵ ئەوەی لە ناخدایە، جیاوازیی هەیە. بەڵام زمان چییدەکات. یەکەمین شتێک کە مێشک دەیکات ئەوەیە بەهۆی چاو و گوێ و هەستەکانەوە، جیهان دەدۆزێتەوە. ئەمە قۆناغی پێش زمانیە. لە قۆناغی دواتردا، بەهۆی فێربوونی زمانەوە، شتێکی دیکە لە مێشکدا

ڕوودەدات کە هێواش هێواش شوناس بە مرۆڤ دەبەخشێت. کەمێ گەشەی زیاتریش چەمکەکان دروستدەبن. کەمە کەمە وشەکان لە سیستەمی خرۆشانی هەستەکی و ئەو بەشە لە سەرتوێی مۆخ کە پەیوەندیی هەیە بە خرۆشانەکانەوە، هەڵدەکەنرێن. لێرەوەیە کە زمانی دایک دەبێتە بنەمای ژیانی مرۆڤ) (https://www.tribunezamaneh.com/).

هەموو ئەم بۆچوونە زانستیانەیە ئەوەمان پێدەڵێت، کە پێویستە لە سیاسەتی پەروەردە و فێرکردندا هەموو ڕێگاکان بۆ فێربوون و پەروەردەکردن بۆ زمانی دایک تەخت بکرێن و هیچ ڕێگرێک بۆ ئەم مەبەستە دروستنەکرێت.

## نامۆکردن بە زمانی دایک:

زمانی دایک کەناڵێکی سەربەخۆی بێ ڕکابەرە و مرۆڤ بەهۆیەوە و لێیەوە دێتە ناو جیهانەوە و خۆی بەرجەستە دەکات. مەحروومکردنی منداڵ لە زمانی دایک بە هەر هۆکارێک بێت، زیان بە کەسایەتی دەگەیەنێت و دووچاری کەمئەندامیی کۆمەڵایەتیانەی دەکات و ناتوانێت بە شێوەیەکی سرووشتی پەیوەندیی لەگەڵ هاوزمانەکانیدا بگرێت (مولودی: http://www.ziryan.ir/NewsDetail.). بۆیە

هەر بە پەراوێزخستنێکی زمانی دایک و بەهەر بەڵگەیەک بێت، دەستێوەردانێکە لە جیهانی ناخەکیی منداڵەوە. لێرەوەیە کاتێک بە هەر بەڵگەیەک (بەڵگەی زانستیبوون، سەردەستەیی زمانەکان و دانپیانەنانی یاسایی بە زمانەکان و باوبوونی زمانێکی تایبەت)، دێین و زمانی دایک قەدەخە، یان بەپەراوێز دەخەین، منداڵ لە خۆی بێگانە و بە خۆی نامۆ دەکەین.

ئەم بێگانەکردن و نامۆکردنە بەدئەنجامیی زۆری بۆ منداڵەکە لێدەکەوێتەوە، وەک نەبوونی توانای بۆ دەربڕینی ناخی خۆی و نەبوونی هاوسەنگیی لە نێوان ئەوەی هەستپێدەکات و لە ناخدا دەیخرۆشێنێت و ئەوەی دەیەوێت بیڵێت. جگە لەوەش، منداڵ هیچ وابەستەیی و گیرۆدەییەکی بە زمانی دایکەوە نامێنێت و وەک ئەو خوێندەوار و خاوەن بڕوانامە نەیجیریانەی لێدێت، کە ناتوانن بە زمانی زگماکی دایکی خۆیان بئاخڤن.

لە ئاستی کۆمەڵایەتیشدا، زمانی جێگرەوەی زمانی دایک، یان زمانی سەپاو، هەستێکی خۆ بەگەورەزانیی و بەچاوی سووک ڕوانینە زمانی دایکی، دەداتێ، کە نەتوانێت پەیوەندیی لەگەڵ ئەو واقیعەدا دروستبکات کە تیایدا دەژی. ئەمەش لەبەر ئەوەی زمانی سەپێنراو، یان فێرکراو، پێگەیەکی ئەوتۆ دەداتە مرۆڤ، کە پێی وابێت، دەبێت لە

ولات و کۆمەڵگای خۆشیدا بە زمانە نوێیەکەی بدوێت. ئەم زمانە نوێیە، لە نمونەکەی ئێمەدا، زمانی ئینگلیزی، دەبێتە سنوورێک منداڵ لە ژینگەی کۆمەلایەتی خۆی دابڕ دەکات. هەستێکی ترس و شەرمی پێدەبەخشێت. ترس لەوەی ئاشکرا بێت ئەم کوردە و شەرم لەوەی بە زمانی داییک بدوێت، یان لەگەڵ کەسە نزیکەکانی خۆی ببینرێت کە بە زمانی داییک قسە دەکات. ترس و شەرم هاوسەنگی ڕۆحیی منداڵەکان دەشێوێنن و توانای هەڵبژاردنی هاوڕێ و دەربڕینی هەستی سۆزداریی و تووڕەییەکانی بەشێوەیەکی سرووشتی لێدەستێنێتەوە. هەرچەندە لە شێوازیی قسەی ڕۆژانەدا هەموو ئەمانە پێکەوە، کێشەیەکی گەورە بۆ شوناسی تاکەکەس دروستدەکەن و چێژی دووان و ئاخاوتن و گوزارشکردن لە خودی خۆی، لێدەستێننەوە.

کاتێک هەموو ئەم زانیاریانە بە دۆخی ناو قوتابخانە پەرپووتەکانی تایبەت لە هەرێمی کوردستاندا بەراوورد دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت دەبێ کێ باجی ئەم دۆخە زمانیە سەپاوە بدات، کە تیایدا زمانی داییک بەپەراوێز خراوە؟ دەبێت لەوەش تێبگەین، کە ئەو نەوەیەی بەوجۆرە پەروەردە دەکرێن، چۆن لە ناخەوە دابڕ دەکرێن لە کۆمەڵگای خۆیان و دوورکەوتنەوەیان لەو بەشەی خودی خۆیان، کە هەڵگریی شوناسی ڕاستەقینەی ئەوانە..

پێویستە سیاسەتی پەروەردەیی ئێمە دابڕێژرێتەوە و تیایدا زمانی دایک لەو هێرشانە ڕزگار بکرێت کە بەناوی ئینتەرناشناڵیزم، پێشکەوتن، زانستگەرایی و مۆدێرنبوونەوە، دەکرێنە سەری. هەرچەندە ئەم هێرشە بۆسەر زمانی ئێمە، تەنیا لە بواری پەروەردە و بە ناوێکی خۆشی وەک زانستەوە نیە، بەڵکو لە مارکێت و مۆڵ و کافتریا و خواردنگەکانیشەوەیە و لە زۆرینەی ئەم شوێنانە زمانی ئینگلیزی، عەرەبی و تورکیی زۆر فەرمیترن لە زمانی کوردی.

لە بەدواداچوونێکمدا بۆ دوو کافتریای ناو ماجیدی مۆڵ و فامیلی مۆڵ، بۆم دەرکەوت کرێکارە بیانیەکانی ئەوێ هەر یەکەیان لە سێ ساڵەوە بۆ پێنج ساڵە لە هەرێمی کوردستان دەژین و هەتا ئێستا هیچیان بە زمانی کوردی بایی ئەوەی مشتەرییەکانیان ڕایی بکەن، ناتوانن بئاخڤن، لە کاتێکدا هەردووکیان بە ئینگلیزییەکی شەق و شڕ کاری خۆیان جێبەجێدەکەن و ئەو هەستە دەدەنە مشتەرییە کوردییەکانیان کە دەبێت ئەوان بە ئینگلیزی قسە بکەن. دەبێت حاڵی کوردێکی سنەیی، یان مەهابادی و هەر شوێنێکی دیکەی کوردستان کە دێتە ئەم هەرێمەی ئێمە چۆن بێت، کاتێک دەبینێت لەو شوێنەی کە ئازادیی زمان لە

هەموو شوێنێک ڕێپێدراوترە، زمانی دایکی لە هەر کاتێک پەراوێزخراوترە..

من هەرگیز لە بواری زماندا فەندەمەنتاڵیزمی زمانیم نەبووە، هەرگیز زمانی زگماکم بە خاوێنتر و پاکژتر نەزانیوە لە زمانەکانیتر، چەندیشم پێکرابێت زمانانی دیکە تا ڕادەیەک فێربووم، بەڵام بڕوایەکی تەواوم بە جەوهەرگەرایی زمانی هەیە و پێموایە بەبێ زمانی دایک شوناسی ئێمە دەکەوێتە مەترسییەوە. هەمیشە کاتێک دەچم بۆ لای پزیشک و دەبینم بە ئینگلیزی دەرمانم بۆ دەنووسێت و کاتێک دەچم بۆ دەرمانفرۆش و دەبینم ڕێنماییەکی بەکارهێنانی دەرمانەکانم بە عەرەبی بۆ دەنووسێت، زیاتر لە ڕووی ڕۆحیی و مەعنەوییەوە نەخۆش دەکەوم. لە زۆربەی ڕیستۆرانت و خواردنگەکانیش، لیستی خواردنەکان بە ئینگلیزی و بە عەرەبی هەن، بەڵام بە دەگمەن بە کوردی دەستکەون، ئەگەر هەشبێت ئەوەندە کوردییەکی خراپ، مرۆڤ ژەهرخەندی دێت.

هەموو ئەم ڕاستیانە پێماندەڵێن، ڕۆژگاری قەیرانی ئابووری و بێ مووچەیی ئەگەری قەرەبووکردنەوە و تێپەڕاندنیان زۆر زیاترە لە قەرەبووکردنەوەی قەیرانی کولتووریی و زمانیی و ڕۆحی.. قەیرانی ڕاستەقینە ئەمەی دواییانە کە

هەرگیز ناچێتەوە ئەو دۆخ و ساتەوەختەی خەسارەتەکان لە پیواری (غیاب)ی عەقڵانیەتێکی ڕۆشنگەرانەدا بە شێوەیەکی شاراوە، دەستیان پێکربوو. ساڵەها لەوە پێش، وتارێکی ژان فرنسوا لیوتارم خوێندنەوە کە تیایدا باسی کارەساتی کردبوو: (هەرگیز ناتوانین دوای کارەسات بگەڕێینەوە بۆ دۆخی پێش کارەسات، چونکە ئەو وزەیەی لە کارەساتەکەدا بە فیڕۆ دەڕوات، نابێتەوە بە هەمان وزەی کە پێشتر هەمان بوو). ئێستا و لەم دۆخەدا وەزارەتی پەروەردە و سیاسەتی کولتووریی حکومەتی هەرێم دەستبکەن بە پرۆژەی چاکسازیی و بە مرۆییکردنەوەی بواری خوێندنی تایبەت و گرنگیدانەوە بە زمانی کوردی لە هەرێمەکەماندا، ناتوانن قەرەبووی ئەو زیانانە بکەنەوە کە تا ئێستا بەرمان کەوتوون، چونکە خودی کارەساتەکە ئەو وزەیەی لێسەندووینەتەوە کە پێشتر هەمان بوو. بەڵام ئەگەر ئەم حکومەت و وەزارەتە کارێکی وایان کرد و بڕیاریاندا چاکسازیی بکەن و پێگەی زمانی کوردی بگێڕنەوە بۆ شوێنی خۆی، ئەوە تەنیا دەتوانێت سوودبەخش بێت بۆ گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ ئەم زمانە و سستکردنی ئەو پرۆسەی گاڵتەجاڕییەی بە ناوی پێشکەوتن و زانست و ئینگلیزییپەرستییەوە، بەسەر زمانی ئێمەدا سەپێنراوە. کێشەکە ئەوەیە من گومانم هەیە لەو فەرمانەی

بۆ ئەم مەبەستە دەردەچێت، کوردییەکی ئەوەندە خراپ بێت، وەک زۆرینەی بەڵگەنامە فەرمییەکانی حکومەتی هەرێم، مرۆڤ نائومێد بکات..

## گرنگیی مامۆستای زمانی دایک:

بەم بەشەی وتارەکەم کۆتایی بەم توێژینەوەیە دەهێنم. ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە کە هێشتا هیچم نەوتووە و مەودای خۆسانسۆری و هێشتنەی زۆر سەرنج، وایانکرد ئەم بڕیارە بدەم. من دان بەوەدا دەهێنم کە لە کاتی نووسینی ئەم وتارانەدا، هەم خۆم سانسۆر کرد و هەم ئاگادار کرامەوە دەبێت سەرسمی یاسایی بە دەستەوە نەدەم. بۆیە کۆی ئەو شتانەی کە ناتوانین بەڵگەیان بۆ بهێنینەوە و لەم قوتابخانانەدا هەن، لەم نووسینە کرانە دەرێ. من لەم زنجیرە وتارە ڕەخنەییە شیکارییەدا، نەچومە سەر فۆرمەکانی سزا و شیزۆفرینیای مامۆستای نەزان و سادیزمی پەروەردەیی ئەم قوتابخانانە کە لە هەموویاندا ڕوانگەیەکی نزمنۆڕی بۆ کۆمەڵگای لۆکاڵیی و تێڕوانینێکی کەمکەرەوە و کۆلۆنیاڵیسانە بۆ منداڵان هەیە. نەچومە سەر ئەو گرێبەستە ڕانەگەیەنراوەی کە وەلائی مامۆستا و بەڕێوبەرانی قوتابخانە دەبەستێت بە کۆمپانیا و خاوەنی قوتابخانەکانەوە و ئەوانی کردۆتە ئامرازی پارەکێشانەوە لە

دایکان و باوکان.. بۆ نمونە لە ئێستادا قوتابخانەی بەریتانیی ڕایگەیاندووە بۆ تاقیکردنەوەی هەر وانەیەکی قوتابیانی قۆناغی یازدە و دوازدە، پێویستە دایکان و باوکان بڕی سەد دۆلار بدەن. ئەمەش بەبێ هیچ زانیاریەکی پێشینە لەو پڕۆژەیەدا کاتی خۆی دراوە بە وەزارەتی پەروەردە. (https://www.facebook.com/biskurdistan/). بێگومان ملکەچیی دایکان و باوکان و گرنگی نەدانیان بە دۆخی قوتابیەکانیان و پشتبەستنیان بە پارە و فەرامۆشکارییان بۆ ڕەهەندیی پەروەردەیی، ڕێگای بۆ ئەمجۆرە مانۆپۆلاشیۆن و قۆرخکاریانە خۆشکردووە. بەو دیوی دیکەشدا نەبوونی فیلتەری پەروەردەیی و یاسایی ئەم قوتابخانانەی گۆڕیوە بۆ دوکانێکی بازرگانی و ئەوەش پێویستی بە ڕابوونی حکومەت هەیە لە خەونە دۆگماییەکەی خۆی..

هەروەها ناچمە سەر لایەنی تەندروستی و جۆرایەتی ئاسوودەیی دەروونی و ئیستاتیکی ئەم قوتابخانانە و لاوازییان، ئەمە جگە لەوەی نەچوومەتە سەر لایەنە ئابڕووبەرانەکەی ئەم قوتابخانانە، ئەوەش لەبەر ئەوەی کۆمەڵگای ئێمە بەرگەی ئەو هەموو ئازارە ناگرێت کە ئێستە بە دەستییەوە دەناڵێنێت، تا ئێمەش بە پەردەهەڵدانەوە و خستنەڕووی بەڵگەی زۆری ئابڕووبەرانەی ئەم قوتابخانانە، ئێشێکی دیکەی بۆ زیاد بکەین. دایکان و باوکانی ئێمە لە

ئێستادا ڕووبەڕووی سزای مووچەبڕین بوونەتەوە، چ خودا بەرداره تووشی سزایەکی دەروونیشیان بکەین.
لەلایەکیتریشەوە من ڕۆژنامەنووسێکی پیشەیی نیم تا بمەوێت لە خۆپەرستیمەوە دەستپێشخەریی میدیایی بخەمە پێش بەرپرسیارێتی ئەخلاقیمەوە لە ئاست کۆمەڵگادا. لەوانەش بترازێت ئەو بەڵگانەی ڕەهەندە ئابڕووبەرانەکەی ئەم قوتابخانانە ئاشکرا دەکات، خراونەتە بەردەمی وەزیری پەروەردە و لیژنەی تایبەت، کە دڵنیام هیچیان پێناکرێت لەوبارەیەوە. بۆیە لێرەدا قسە لەسەر ئەو کێشانە دەکەم کە لە ئێستادا بە پێویستیان دەزانم و دەکرێت بیریان لێبکرێتەوە..
بە پێی ئەزموونی خۆم چ لەگەڵ قوتابخانەی شوەیفاتی نیودەوڵەتیی و چ لەگەڵ قوتابخانەی بەریتانیی نێو دەوڵەتی، بۆم دەرکەوتووە زۆر بەکەمی سوودیان لە هێزی کاری خۆماڵی وەرگرتووە بەتایبەتی لە بواریی پیداگۆکیی و زماندا. زۆرینەی ئەو مامۆستایانەی لەو قوتابخانانەدا کار دەکەن، دوو تایبەتمەندیی کۆیان دەکاتەوە: یەکەمیان دەبێت لە تەمەنێکی گەنجدا بن و دوومیشیان کورد نین، یان کوردیی نازانن. تەنانەت ئەوانەشیان کە لە بەشی ئیداریی کار دەکەن کوردییەکی لاواز دەزانن یان هەر نایزانن.

بوونی مامۆستای زمانی دایک، لەو قوتابخانانەدا گرنگیی زۆری خۆی هەیە. لە ڕووی ئیدارییەوە، ئەم گرنگییە کەشی ڕۆژانەی قوتابخانە لە کەشی ژیانی کۆمەڵایەتی منداڵ نزیک دەخاتەوە. ئەو دیوارە گەورەیەی ئەمجۆرە قوتابخانانە لە نێوان فەزای قوتابخانە و ژیانی کۆمەڵایەتی قوتابیاندا دروستیانکردووە، بە بوونی مامۆستای زمانی داییک تەنک و شەفاف دەبێت. منداڵەکان هەست بە دڵنیایی دەکەن کاتێ دەبینن بە هەمان ئەو زمانەی لە ماڵێ قسەی پێدەکەن، مامۆستاکانیشیان بەیانی باشیان لێدەکەن. لێرەدا بوونی مامۆستای زمانی داییک، هۆکارێکی یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی منداڵان هەستنەکەن ئەوان لە ماڵەوە دەچن بۆ وڵاتێکی دی، یان تووشی دابڕانێکی زمانیی ڕەها هاتوون. لە ڕووی دەروونیشەوە، منداڵ لە قوتابخانە کێشە و گرفتی خۆی بۆ پێشدێت، چ لەگەڵ هاوپۆل و چ لەگەڵ گەورەترەکاندا بەتایبەتی لە کاتی پشوو و یاریی و هاتوچۆدا. بۆ ئەم دۆخانە منداڵان پێویستییان بەوەیە کەسانێک هەبن، بە زمانی خۆیان لەگەڵیان بدوێن، چونکە ئەوان بەو زمانە دەتوانن گوزارش لەخۆیان بکەن و هەست بە دڵنیاییەکی زیاتر بکەن.

کەمترین مامۆستای زمانی داییک لەم قوتابخانانەدا هەن، کە ئەوە دەبوو مەرجی وەزارەتی پەروەردە بێت، چ لە ڕووی

پراگماتیکییەوە و چ لە ڕووی پەروەردەییەوە. لە ڕووی پراگماتیکیەوە پێویستە وەزارەت هێزی کاری خۆی بەسەر ئەم قوتابخانەدا فەرز بکات و مامۆستای خۆماڵی دابنێت. لە ڕووی پەروەدەییشەوە، دەبوو وانەی زمانی دایکی و وانەکانی دی بدرێتە مامۆستای تایبەت و بە ئەزموون. زۆربەی مامۆستاکانی ئەم جۆرە قوتابخانانە کەم ئەزموونن، جگە لەوەش کوردستانی نین. نوکتەیەک هەیە لەسەر قوتابخانەی شوەیفاتی نێو دەوڵەتی کە دەڵێت: (ئایا دەزانیت بۆچی لە ڕۆژەکانی پشووی نەتەوەیی کوردستاندا ئەو قوتابخانەیە دەوامی هەیە و لە ڕۆژانی پشووی بۆنەکانی لوبناندا دەوام ناکات؟ لەبەر ئەوەی زۆربەی مامۆستاکانی لوبنانین..) ئەمە قسەی خوێنەرێک بوو کە بۆی گێڕامەوە.. لە قوتابخانەی بەریتانیی (ئەویش نێودەوڵەتی)، حاڵ لەمە باشتر نیە. بوونی مامۆستای کورد لێرە هەیە، بەڵام کەم ئەزموون. لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستای بیانی و غەیرە کورد زۆرن و کەشێکی عەرەبی ئیسلامییان دروستکردووە. لەناو ئەو کەشەدا زمانی داییک بەکەم دەگیرێت و بۆشایی نێوان کۆمەڵگا و قوتابخانە زۆرتر دەبێت. کێشەکەش لەوەدا نیە، زمانەکە بەکەم دەکرێت، بەڵکو بە کەمینەش دەکرێت و ئەمەش دەمانباتەوە سەر باسی جینۆسایید و زمان..

**کتێبەکەی فیلیپسۆن:**

ساڵی ۱۹۹۲ کتێبێکی گرنگ لەبواری زمانناسی کردەییدا بڵاو کرایەوە، کە مامۆستای وانەی زمانی ئینگلیزی وەک فیگەرێکی شۆککەر دەناسێنێت ( Linguistic Imperialism. (London, Oxford University Press, 1992). ڕۆبێرت فیلیپسۆن نووسەری ئەم کتێبەیە و تیایدا ئەو بەڵگانە دەخاتە ڕوو، کە ئاشکرای دەکەن کە ***بە جیهانیکردنی فێربوونی ئینگلیزی شێوازێکە لە ئیمپریالیزمی زمانی***. ئەم باسە پەیوەندیشی هەیە بە نەبوونی مامۆستای زمانی دایکی و بە دۆخی پەراوێزخراوی زمانیی دایکییەوە لە کۆمەڵگا لۆکاڵییەکاندا.

یەکێک لە بەڵگە هەراسانکەرەکانی فیلیپسۆن سەبارەت بە ئیمپریالیزمی زمانی، ئەوەیە کە دەڵێت: بەربڵاوبوونی زمانی ئینگلیزی لەناو بازاڕی زمان فێربووندا، خزمەتی کردووە بە بنکەندکردن و کەمکردنەوەی پێگەی زمانی دایک و مافی منداڵان سەبارەت بە فێربوون بە زمانی زگماک و لێدان لە دۆخی فرەزمانی لەناو قوتابخانەکاندا.. (http://www.information.dk). فیلیپسۆن بەڵگەی ئەوە دەهێنێتەوە، کە لە سەدەی هەژدە بەملاوە، کاتێک قۆناغی داگیرکاریی سیاسیی و ئابووریی ئیستیعمار، بەربڵاو دەبێت، داگیرکاریی کولتووریش لەگەڵیدا پەرەدەستێنێت و

شێوە ژیانی ئینگلیزانە و ئایدیاڵە کولتورییەکانیان بەسەر زمان و کولتوورە خۆجێییەکاندا باڵا دەست دەکرێت. لەم نێوانەشدا، فێربوونی ئینگلیزی و سیستەمە پشتیوانیکەرەکەی لە سیاسەتی ئیمپریالیستیدا بەشداربوون لە پیرۆزکردن و بە ئەفسانەکردنی زمانی ئینگلیزی وەک پێویستییەکی ناچارەکی و بۆ دابینکردنی دڵنیایی لەسەر ئەو بانگەشەیەی کە دەیگوت زمانی ئینگلیزیی زمانی باڵادەستە لە هەموو جیهاندا.

بێگومان هەموو بەپیرۆزکردنی زمانێک لە شوێن و ژینگەیەکی تایبەتدا جگەلەوەی دەبێتە هۆکاری فۆرمەکانی جینۆسایدیی زمانەکانی ئەو شوێنە، ئاواش پێگەی مامۆستای زمانی ئینگلیزی لەچاو مامۆستای زمانانی زگماک و خۆجێیدا بەرز دەکاتەوە. جیهان لە دۆخە سرووشتییەکەی خۆیدا جیهانی فرەزمانیە نەک تاکزمانی. بەر لەوەی زمانە باڵادەستەکان وەک بەشێک لە کۆلۆنیالیزمی کولتووری و ئیمپریالیزەی زمانی بچنە ئەو شوێنانەی جیهان کە کۆلۆنیالیزە کراون، زمانی خۆجێ و زمانانی دایکی ئەو شوێنانە ئەرکی خۆیان جێبەجێکردووە. پێشمەرجی گرنگیی زمانی دایک لەوەدایە کە پێش هەر زمانێکی دیکە دەکەوێت، نەک ئەم زمانی دایکە پاشەکشەی پێبکرێت لەبەر ئەوەی لەچاو زمانە بیانیەکاندا لاوازە یان

کەمتر زانستیە. جارنامەی جیهانی مافی زمان)یش ڕێگە بەمە نادات: (http://ruwange.blogspot.com/2010/).

کۆی ئەفسانەی ئیمپریالیزمی زمانی لەبەردەم ئەو ڕاستییەی کە دەڵێت: ***بنەماکانی تێگەیشتنی هەر جۆرە زانستێک لە تێگەیشتنی پێشزانستیانەی هەر زمانێکدا هەن، کە ڕەگوڕیشەیان لە ئەزموونی ئاخێوەرانی ئەو زمانەدا داکوتاوە***، دادەڕمێت. من لە بەشێکی دیکەدا ئەم ڕستەیەم بەو جۆرە داڕشت بۆ ئەوەی زەمینەیەکمان هەبێت بۆ پتەوکردنی زمانی دایک نەک دۆزینەوەی جێگرەوە بۆی. پتەوکردنی زمانی دایک دابڕ نیە لە ئامادەیی مامۆستای زمانی دایک. ئەزموونی فێرکردنی زمانی دایک لە وڵاتانی سکەندناڤیا ئەوەی سەلماندووە، کە فێربوونی زمانی دایک بۆ منداڵانێک کە زمانی دایکیان زمانی فەرمیی وڵاتانی ئەوێ نیە، پابەندە بە بوونی مامۆستایانی شارەزا لە زمانی دایکدا.

فیلیپسۆن داوا دەکات ئەم ڕوانگە ئیمپریالیستیە بۆ زمانی ئینگلیزی بگۆڕدرێت. لەو کاتەشەوە کە کتێبەکەی چاپ و بڵاوکراوەتەوە تا ئێستا، بیرۆکەکانی ئەم مامۆستایە گۆڕانکارییەکی زۆریان لە جوگرافیای فێربوونی زمانی ئینگلیزی و فێربوون بە زمانی دایک کردووە لە سەراپای جیهاندا. داواکەی فیلپسۆن ڕاوایە، چونکێ داوایەکی

ئەخلاقیانەیە لە پسپۆڕێکی زمانەوە بۆ سیاسەتی زمانی و لەسەر گێڕانەوەی هاوسەنگیی لە نێوان زمانەکان بەندە.
سیمای فرەزمانی جیهان ڕێگە بە تاکزمانی نادات و ئەمەش دۆخێکی ناسرووشتیە. لەبەر ئەوە فیلیپسۆن چەند خاڵێکی ڕەخنەیی بێدار دەکاتەوە هاوکات بە هەژاندنی ویژدانیانەی ئەو مامۆستایانەی خۆیان بە وتنەوەی زمانی ئینگلیزییەوە سەرقاڵکردووە. بەڵام خاڵی گرنگ بۆ ئێمە لەوەدایە کە هاوکات بە جەختکردنەوە لەسەر فێربوونی زمانی ئینگلیزی و زمانانی دی لەبواری زانستەکاندا، نابێت زمانی داییک بخرێتە پەراوێزەوە و جینۆساید بکرێت. هیچ زمانێک بە ئینگلیزیشەوە لە خۆیدا ئیمپریالیستانە نیە، ئەوەی زمانێک دەکاتە بکوژی زمانەکانی داییک لە کۆمەڵگا لۆکاڵیەکاندا ئەو سنۆبیزم و لوتبەرزییە زمانیەیە کە بازرگانانی زمان بەهۆیەوە ڕێخۆشکەریی دەکەن بۆ بێزران و لەبەرچاوخستن و دواجار جینۆساییدکردنی زمانی خۆیی.
مامۆستای زمانی ئینگلیزیش لە کەشێکدا کە فرەزمانی هەیە و مافی زمانی داییک پارێزراوە، یەکێک لە زمانە هەر باشەکان بۆ فێربوون بە منداڵ دەبەخشێت لە پاڵ ئەوەی چۆن مامۆستای زمانی دایک بناخەکانی فێربوون بە هەر زمانێک لە زمانی داییکدا دادەڕێژێت. مامۆستای زمانی داییک لە هەمان کاتدا بناخەی شوناسبەخشانە بۆ منداڵ

دادەڕێژێت لە کاتێکدا مامۆستای زمانی ئینگلیزی و هەر زمانێکی دیکەی جیهانی، منداڵ ئامادە دەکات بۆ جێبوونەوەی لە دنیایەکی جیهانگیردا. ئەمکارە بەبێ هاوسەنگیی نێوان زمانەکان و بەبێ کەشی فرەزمانی بۆ قوتابخانەکان مەیسەر نابێت. بەمجۆرە پێویستە ئێمە ئەقڵییەتی بازرگانیی زمانی قوتابخانە تایبەتیەکان بگۆڕین بە ئەقڵییەتێکی پەروەردەیی کە تیایدا سوودی پەروەردەیی و ڕێزگرتن لە مافەکانی منداڵ بۆ فێربوون و خوێندن بە زمانی دایک بخرێنە پێش سوودی پارە و قازانجەوە..

کۆمپانیاکانی بازرگانیی پەروەردەیی لە هەرێمی کوردستاندا نەک هەر کەشی تاکزمانیان کردە بار بەسەر کۆمەڵگای ئێمەوە، ئاواش هەر یەک لەو زمانانەی ئەوان بەبازاڕییانکردن بوونە بار بەسەر زمانی کوردی و زمانە لۆکاڵییەکانیترەوە. تەسلیمبوونی حکومەت و وەزارەتی پەروەردە بەم چاوبەستە بازرگانییە، تەسلمکردنی قوتابخانەیە بە کۆمەڵێک چاوبرسی کە بەلایانەوە گرنگ نیە زمان و پرۆسەی پەروەردەیی چیی بەسەر دێت. سنووردانان بۆ قۆرخکاریی ئەم قوتابخانانە و هووشیارکردنەوەی دایکان و باوکان لەمبارەیەوە و پێشخستنی قوتابخانە حکومییەکان لێکتری جیا ناکرێنەوە.

کەمبوونەوەی ڕێژەی قوتابیان لە دوای دەستپێکردنی قەیرانی داراییەوە، دابڕاو نیە لە قەیرانێکی زانستی و ئەخلاقی و پەروەردەیی.. کەمبوونەوەی پارە و مشتەری لەم قوتابخانە تایبەتیانە بۆتە هۆی دابەزینی جۆرایەتی و ئاستی پەروەردەییان و کردوونی بە دڕندەیەکی پارەویست.. نازانم لە ئێستادا حکومەت چی پێدەکریت وەزارەتی پەروەردە بە چ میکانیزمێک چاودێریی ئەم قوتابخانانە دەکات. بەڵام پێدەچێت هەتا یاسای قوتابخانە ئەهلییەکان بە جۆرێکی ئەوتۆ هەموار نەکرێتەوە، کە جێگەی بۆچوونی پەروەردەیی نوێ بگرێتەوە، ناکرێت هیچ سنوورێکی یاساییان بۆ دابنرێت و گۆڕانکارییان تێبکەوێت. پێشمەرجی هەر یاسایەکی پەروەردەیی گۆڕانیی ئەو عەقڵییەتەیە کە یاسا کۆنەکان و پێشترینەکانی بەرهەمهێناون و لەلایەن بزنسمان و بازرگانانی پەروەردەییەوە بە سوودیی مادیی خۆیان بەکار دەهێنرێن.

# دوارۆژی قوتابخانەکان

سەرەتا:

بە پێی ئەو سیستەمەی ئێستای خوێندن لە قوتابخانەکانماندا، کێشەی گەورە بۆ نەوەی داهاتوو دروستدەبێت. ئێستا ئەم سیستەمە لە قەیراندایە و هێشتا نەچۆتە سەر ڕێچکەی تەندروستانەی خۆی. قوتابخانەکانی دوارۆژ ئەرکیان قورستر دەبێت لە ئێستا: داوکارییەکان زیاتر، ڕێژەی قوتابیان بەرزتر و چاوەڕوانیی زیاتر و خەرجیی زۆرتر چاوەڕوانیمان دەکات. من پسپۆڕیی پەروەردەیی نیم، بەڵام چاودێریی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە هەرێمدا، خەمێکی گەورەمە. لێرەدا هەندێ پێشنیار دەخەمە ڕوو، کە هەموویان سادەن، بەڵام بنەمای سیستەمێکی فێرکاریی و پەروەردەیی وڵات لەسەر ئەم مەسەلانە بەندە.

قوتابخانەکانی ئێستا بەو جۆرەی کە ئەنجامەکانیان لەسەر قوتابیەکان دەبینرێ، قوتابخانەی دوارۆژ نین، ناتوانن وەڵامدەرەوەی پێویستییەکانی کۆمەڵگای کوردستانی بن، سەبارەت بە داهاتووی پەروەردە و خوێندن. بۆ ئەوەی ئەم سیستەمە و قوتابخانەکانی و بەرهەمەکەی ببنە بەرهەمی دوارۆژ، پێویستە لە هەنووکەوە هەنگاو بنرێت.

هەنگاوەکانیش پێویستە هەمەلایەنە و بەپێی بەرژەوەندیی گشتی وڵاتەکە و داهاتووی گەشەپێدانی مرۆیی بن لەم وڵاتەدا. لێرەوە، پسپۆڕان و دڵسۆزان و لایەنە پەیوەندارەکانی حکومەت دەبێت بچنە ناو کایەی گفتوگۆی جیدییەوە لەگەڵ یەکتر و گوێ لەیەکتر بگرن و بیرۆکەی نوێ لەلایەن هەر کەسێکەوە بە هەند وەربگرن، چونکە ئەو قەیرانەی ئێستا بەرەو شوێنێکمان دەبات، کە هەمووان زیانی لێدەکەین .

من لە پرسیارێکەوە دەچمە نێو باسەکەمەوە: چییە ئەو شتانەی پێویستە منداڵان لە قوتابخانەکانی دواڕۆژدا فێریان بن؟ ئەمە پرسیاری سەرەکیی منە لەم وتارەدا و دەمەوێت بە هێمنی بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکەم بیر بکەمەوە.

## پەروەردەکردنی توانا سەرەتاییەکان:

یەکەم شت کە پێویستە قوتابیانی ئەمێستا و دواڕۆژ فێری بن، بریتیە لە پەروەردەکردنی توانا سەرەتاییەکانی خۆیان لە بوارەکانی خوێندنەوە، نووسین و بیرکاری. پێویستیشە ئەم سێ بابەتە لە ئاستێکی بەرزدا فێر ببن چونکە خێرایی کات بواری ئەوەمان پێنادات فێربوونی ئەم سێ بابەتە هەڵگرین بۆ دواڕۆژ و پێمانوابێت کە دواتر منداڵان فێری

خوێندنەوە و داڕشتن و لێکدانەوەی بیرکاری دەبن و کاریان دەستدەکەوێت.
لە ئێستادا ڕێژەیەکی زۆر لە منداڵان و قوتابیانی ئێمە لەم سێ بوارەدا لاوازن و بگرە لە قۆناغی زانکۆشدا قوتابیی کێشەی نووسین و خوێندنەوە بە زمانی دایک و بیرکاریی و ژیریی و لۆژیکی هەیە. بۆیە پێویستە منداڵ لە ئێستادا توانا سەرەتاییەکانی پتەو بکرێن و تێگەیشتن و لێکدانەوەکانی لە جێی خۆیدا بن. ئەمەش ئەرکی قوتابخانەی بنەڕەتییە. لە دوا ئەمانەش و لە ڕوانگەی داهاتووەوە پێویستە منداڵان لە سەرەتاوە فێری زمانێکی تر بکرێن. وێڕای ئەو تێبینیانەی لە بەشی پێشوودا لەسەر ئەم زمانە نووسیمن، زمانی ئینگلیزی لەسەرەوەی لیستەکەیە و دەبێت لە ڕووی نووسین و خوێندنەوەوە بە باشی فێر بکرێن. زمانەکانی تریش گرنگن، وەک عەرەبی و ئەڵمانی و فەرەنسی و هتد. منداڵ لە قوناغی بەرایی خوێندندا بەپێی هەندێ لێکۆڵینەوە، دەتوانێ تا دە زمان فێر ببێت. زمانیش کلیلی تێگەیشتن و دروستکردنی ناسنامەیە و هەمیشە تاکەکەس لە ژینگەیەکی لۆکاڵییەوە، بۆ ژینگەیەکی جیهانیی دەگوازێتەوە و متمانەی مرۆڤ بەخۆی زیاد دەکات. بەڵام زمان بە تەنیا بەس نیە و وەڵامدەرەوەی پێویستیەکانی مرۆڤ لە دواڕۆژدا نیە .

بۆیه بەشێکی دیکەی گەسەپێدانی توانا سەرەتاییەکانی تاکەکەس دەکەوێتە سەر فێربوونیان لە بواری زانستەکانی وەک: زیندەوەرزانی، مێژوو، جوگرافیا، کۆمەڵایەتی و فەلسەفە و بواری دیکەی وەک زانستە سرووشتییەکانی وەک فیزیا و کیمیا. نابێت بە هیچ شێوەیەک ئەم بوارە زانستیانە پشتگوێ بخرێن، یان بەکەم بگیرێن. چونکە ئێمە بەرەو جیهانێک دەڕۆین کە پێویستە تاکەکەسەکانمان بە ئاراستەی پەیوەندخوازی و دیالۆگ و ئەویتردۆستیدا ببەین. ڕەنگە زەحمەت بێت لە دوارۆژدا بتوانین لە خەڵکی وڵاتانیتر تێبگەین، ئەگەر نەمانزانی ئەوان چ جۆرە تێڕوانین و کولتوور و بۆچوونێکیان لەبارەی ژیانی خۆیانەوە هەیە. لە چ جوگرافیایەکدا دەژین و ژینگەی وڵاتەکە چۆنە و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و کاتبەسەربردن چۆنن. زانین ئەو کاتە بەدەست نایەت کە پێویستیمان پێیەتی، بەڵکو جیهان لە ئێستاوە ناچارمان دەکات زۆر شت بزانین بۆ ئەوەی لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکاندا سوودی لێوەربگرین .

بەدەستهێنانی زانین خۆئامادەکردنێکی پێشوەختانەی مرۆڤە بۆ ژیانێکی سەرکەوتوو لەگەڵ ئەوانیتر و تێگەیشتن لە داب و نەریت و بیرکردنەوەیان. هیچ گۆشەگیرییەکی جوگرافیانە بەبێ دەربازبوون لە گۆشەگیریی کولتووریی و زانستی،

مەیسەر نابێت. سەردەمی جیهانگەرایی سەردەمی ڕزگاربوونە لە لۆکالیزم و سەردەمی شکاندنی سنوورەکانی گۆشەگیریی جوگرافیە، بۆیە ئازادیی و تێگەیشتن و پێکەوە هەڵکردن و قەبووڵکردنی فرەیی، بە تەنیا لەودیو سنووره جوگرافییەکانەوە نیە، بەڵکو لەو دیو فراوانکردنی سنووره کولتوورییەکان و سنوورەکانی زانینیشەوەیە. هەر ئەوە بەس نیە بلیتی فڕۆکە ببڕیت و بچیت بۆ تورکیا و لوبنان و قوبرووس، پێویستە لەگەڵ ئەم سنوور بڕییەدا تێگەیشتنە لۆکالیەکانیش ببڕین و تێگەیشتنی نوێتر جێگەیان بگرێتەوە بۆ ئەوەی چێژی جەستەیی سەفەر و چێژی مەعنەوی و کولتووری یەکتری تەواو بکەن و لەو سەرەوە سەفەر ببێتە قوتابخانە و فێرگەیەکی تر. هەموو ئەمەش پەیوەستە بە جۆری سیستەمی پەروەردەییمانەوە و چۆنێتی ئامادەکردنی مرۆڤی دوارۆژ لە وڵاتەکەماندا. لێرەوەیە کە وانەکانی مێژوو، جوگرافیا، فەلسەفە، کۆمەڵایەتی گرنگییەکی زۆریان هەیە، چونکە لە ڕێگەی ئەم وانانەوە قوتابی بازنەی زانیارییەکانی زۆر زیاتر و فراوانتر دەکات. بەڵام شێوازی گوتنەوەی ئەمجۆرە وانانە لە ئێستادا کێشەی تێدایە.

ئێمە لە قوتابخانەی بنەڕەتی، وانەکان بە جۆرێک دەڵێینەوە کە بەهاکەیان بۆ قوتابی تەنیا لەوەدا بێت، نمرەیان تێدا بهێنێت. ئەم شێوازە وایکردووە، وانەکان تەنیا ببنە زانیاریی

ڕووت و قوتابی نەتوانێت چێژ لە زانینەکەیان وەربگرێت. ئاساییە تۆ زانیاری بدەیت، بەڵام پێویستە ڕەهەندی زانستانەش بەرجەستە بکەیت. بۆ نموونە لە ئاستی بەخشینی زانیاریدا بە منداڵەکەمان دەڵێین: ئەمە سێوە. خڕە، سورە، زردە، مزرە، ترشە. قەبارەی چەندە و کێشی چەندە و هەتا دوایی. ئەمانە هەموویان زانیارین لەسەر سێو، ئەم زانیاریانە کاتێ سوودمەندن کە بەکاریان بهێنین بۆ باسکردنی زانستیانەی سێو: منداڵەکەمان و قوتابییەکەمان فێر بکەین سێو سوودی هەیە، ڤیتامینی تێدایە و ڤیتامین بۆ لەشی مرۆڤ بە سوودە و هتد. وانەی مێژوو، جوگرافیا و کۆمەڵایەتی و فەلسەفەش بە هەمان شێوە. پێویستە ئەم وانانە لە پەیوەندیی بە ژیانی واقیعی و کردەیی قوتابیەکانەوە بگوترێنەوە. پێویستە بە قوتابی بگوترێ بۆچی پێویستە ئەو ئاووهەوا، زەویناسی، مێژووی وڵاتان و میللەتانیتر بخوێنێت. بۆچی فەلسەفە و کۆمەڵایەتی دەخوێنێ و بەوجۆرە. لە سیستەمی فێرکردنی ئێمەدا، جیاوازیی نێوان زانیاری و زانست ناکرێت و پەیوەندیی ئەم دوانە بۆ قوتابی ڕوون ناکرێتەوە. بۆیە قوتابی چێژ لە وانەکان وەرناگرێت و ئەمەش وایکردووە، کە لە وانەکان وەڕس بێت.

## له خوێندنەوە بۆ کار:

پێویستە لە قوتابخانە و فێرگە بنەڕەتییەکانەوە، قوتابیان و منداڵان لەسەر ئەوە ڕابهێنرێن کە تێبگەن ئەوان بۆ دواڕۆژی خۆیان و دۆزینەوەی ئاراستەی ژیانی کارکردنیان دەخوێنن. ئەگەر بڕیار بێت خوێندن و فێربوون مەرجێک بێت بۆ چوونە ناو بازاڕی کارکردن، ئەوە پێویستە ئەم مەرجە لەسەرەتاوە بە قوتابی و منداڵان بگوترێت و وەک ئومێدێک لە ژیانی خۆیاندا ببینن و کاری بۆ بکەن. بۆ ئەمەش پێویستە قوتابخانە و فێرگەکان زیاتر بکرێنەوە و لەسەر شێوەیەکی سەربەخۆیانە و پشتبەخۆبەستوانەتر کار لەسەر قوتابیان بکەن. پێویستیمان بە نەوەیەکی نوێ لە مامۆستا و فێرکاران هەیە، کە شێوازی ئەرک بەخشینەکانیان بەسەر قوتابیاندا بگۆڕن، لە جیاتی ئەوەی بۆ کاتژمێرەکانی داهاتوو، وانەیەکی تایبەتیان لە کتێبدا بۆ دەستنیشان بکەن، قوتابیان ڕابهێنن لەسەر ئەوەی چۆن ئەرکێک بگرنە ئەستۆیان و شتێک پێشکەش بکەن کە ڕەنگدانەوەی فێربوونەکانی پێشتر و زانینەکانیان بێت.

ئازادیبەخشین بە قوتابی لە ئامادەکردنی ئەرکدا، دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی مێشکێکی ئازاد و چالاک و ئەمەش بە واتای پشتبەخۆبەشتن و متمانەکردن بە خود. متمانە

ساتەوەختێکی گرنگ و سرووشیانەیە لە ژیانی مرۆڤدا. داهێنان، بیرۆکەی نوێ، چاوەڕوانیی گەورە و پشتبەخۆبەستن، بەرهەمی متمانەبەخشین و متمانە کردنی مامۆستان بە قوتابی و بەرهەمی ئەمەش دەبێتە گەشە و پێگەیشتن. پێویستە قوتابی ڕابهێنین کە ئەرک بگرێتە ئەستۆی و خۆی بە بەرپرسیار بزانێت لەئاست جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا. ڕەنگە ئەمە بۆ قوتابیان لە سەرەتاوە قوورس بێت، چونکە لە خێزانیی کوردستانیدا ئەم بابەتە تا ئەندازەیەک لەبیر کراوە و منداڵان بەشێوەیەکی سیستەماتیک فێر نەکراون ڕوانگەیەکی بابەتیانەیان بۆ ژیان و دەوروبەر هەبێت و هەر زوو لەو بۆچوون و پەیوەندیی و ڕوانگانەوە دەگلێندرێن کە دایک و باوک و گەورەساڵان هەیانن. بەڵام ئەم قورساییە لەسەرەتاوە خۆشترە وەک لەو قورساییەی ژیانی دوا ڕۆژی لەسەر دروستیدەکات و بۆی هەیە بەرگەی نەگرێت. لەم ڕوانگەیەوە، گێڕانەوە و زیادکردنی وانە پراکیتیەکان، وەرشەکان، هونەرەکان بۆ ناو وانەکانی قوتابخانەی بنەڕەتی و دواتر، کارێکی زۆر بەسوودە، چونکە ئەو وانانە قوتابیی بەخۆی و تواناکانی ئاشنا دەکەنەوە و بوارێکی باشی بۆ دەڕەخسێنن بۆ سوودوەرگرتن لە وانە زانستیە ڕووتەکان.. کاری گرووپی و پێکەوەیی لەوەها پرۆسەیەکدا

زۆر بەسوودن و هەتا قوتابخانەکان، بەڕێوەبەر و مامۆستاکان بەم ئاراستەیەدا هەنگاو بنێن، شتی زیاتر و توانای زیاتری قوتابییەکانیان بۆ ئاشکرا دەبێت .

**جیاکردنەوەی زانینی ڕاست لە شێوەزانست و زانینی هەڵە:**
پێویستە قوتابیانی ئێستا و دواڕۆژ فێری ئەوەش بکرێن، کە چۆن بەدوای زانیندا بگەڕێن، زانینی ڕاستەقینە لە زانیاری ناڕاست و هەڵە جیابکەنەوە و بڕێک لە زانیاری تووڕ هەڵدەن، کە لەسەرچاوەی ناڕاست و نازانستییەوە بەرگوێیان دەکەوێت. هیچ شتێک لە بواری زانستدا پیرۆز نیە و لەسەرووی ڕەخنەوە نیە. پێویستە یارمەتی قوتابیەکانمان بدەین، بیروبۆچوونی خۆیان لەسەر بابەتەکان بڵێن. ئەمە لە بەهێزکردنی ئەوان و سەربەخۆکردنیاندا بەسوود دەبێت. بەمجۆرەش پێویستە سیستەمی پەروەردەیی ئێمە خۆی لە تەڵقینکردنی زانیاری ناو کتێب بەدوور بگرێت، تا بتوانێت قوتابیی و کەسایەتی سەربەخۆ بەرهەمبهێنێت. سیستەمی پەروەردەیی ئێمە وەک مەخزەن و عەمبارێک تەماشای قوتابی دەکات، کە بەتاڵە و دەبێت بە زانیاری ناو کتێبەکان پڕی بکەینەوە. قوتابیی عەمبارێکی خاڵی نیە، بەڵکو جیهانێکی سەربەخۆیشە، کە دەیەوێ خۆی دەر ببڕێت و پێویستە بواری ئەوەی بۆ

بڕەخسێنرێ کە خۆی بەرجەستە بکات. پێویستە قوتابیی ڕابهێنرێ لەسەر ئەوەی پشت بە حوکمدانەکانی خۆی ببەستێ و بەرگەی ئەنجامەکانیشی بگرێت. ئەمەش بە بێ کۆکردنەوەی زانیاری و لێکهەڵاواردنی زانینی ڕاستەقینە لە زانیاری هەڵە مەیسەر نابێت. لێگەڕێین قوتابیی فێری وەلادانی بڕێ زانیاری ببێت و لە هەمان کاتیشدا بەرپرسی بکەین، لە گەڕان بەدوای زانینی جێگیرتر و بەسوود تردا .
واچاکە قوتابیان فێری ئەوەش ببن کە خۆیان لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی نەگۆڕ بپارێزن. لە ڕوانگەی داهاتووەوە، ئەو قوتابیانەی تەنیا لەگەڵ هاوپۆل و هاوتەمەن و هاوئاستی خۆیاندا کار دەکەن، سەرکەوتوو نابن لە ژیان و بواری کارکردنیاندا. لە دواڕۆژدا هیچ بوارێکی کار گەرانتیی ئەوە ناکات، کە تاکەکان لەگەڵ هاوپۆل و هاوتەمەن و هاوئاستەکانی خۆیاندا کار دەکەن. بواری کارکردن لە داهاتوودا قورستر دەبێت و وەک کاری ناو قوتابخانەکان نابێت. بۆیە پێویستە قوتابخانە وێنەیەکی ڕاستگۆیانەتری داهاتووی کارکردن بخاتە مێشکی قوتابیان و منداڵانەوە. یەکێک لە ڕێگاکانی گۆڕینی ئەم کولتووری قوتابخانەیە، بریتیە لە ئەرکبەخشین بە قوتابیانی پۆلەکانی سەرەوە لە ئاست پۆلەکانی خوارەوەدا. بۆ نمونە ئەگەر لە ژێر چاودێریی مامۆستای بە ئەزموونندا، بوارماندا بە قوتابیانی

پۆلی هەشتەم، تاکو وانەی خوێندنەوە بە قوتابیانی پۆلی شەشەم بڵێنەوە، ئەوە لە زەمینەی پەیوەندییەکاندا گۆڕانێکی گەورەمان ئەنجامداوە. قوتابیانی پۆلی شەشەم بە هەستێکی ترەوە وانەکەیان وەردەگرن و قوتابیانی پۆلی هەشتەمیش چ لە ڕووی زمانەوە گەشەی زیاتر دەکەن و چ لە ناخیشدا هەست بە بەرپرسیارێتی و ئەرکگرتنە ئەستۆ دەکەن.
ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە ڕێگەبەخۆدانەوە هەیە، ئەگەر مرۆڤ ڕێگەی بەخۆیدا ڕێگای نوێ تاقیبکاتەوە، ئەنجامی باشتر و بەسوودتریشی دێتە دەست. ئەم مۆدێلە شایانی ئەوەیە لە هەموو قۆناغەکانی خوێندنی بنەڕەتیدا تاقیبکرێتەوە و کاریگەرییەکی زۆریشی دەبێت لەسەر فێربوون و تێگەیشتنی قوتابییەکان و لەسەر گەشەکردنی مینتاڵی و مەعنەوییان.

## داهێنان و تواناکان:

هەروەها پێویستە ئەو ڕێنماییانە گەشەپێدەین کە لە ڕێگەیانەوە قوتابیان دەتوانن بە هۆی قوتابخانەوە، مەهارەت و تواناکانی خۆیان بۆ داهێنان گەشە و پەرەپێبدەن. ئەوەش گرنگە قوتابخانە و مامۆستا پەروەردەییەکان بزانن، توانا و لێهاتووییەکانی قوتابیان لە زۆر بواری جیاوازدان و هەر قوتابیەک لە بوارێکدا

لێهاتوویەکی تایبەتی خۆی هەیە و دەتوانێ داهێنان بکات، ئەمەش پێویستە بدۆزرێتەوە.
ئێمە لە هەرێمی کوردستان وادەزانین، ئەگەر بشزانین، کە گوایە لێهاتوویی و تواناشکان شتێکە هەندێک مرۆڤ پێوەی لەدایک دەبن و هەندێکی تر بە رێژەیەکی کەمتر. وشەیەکمان هەیە بۆ ئەم بارە بەکاری دەهێنین: ***هیچ لەبارا نەبوو!*** هیچ لەبارانەبوو بە کەسێک دەگوترێ کە گوایە ناتوانێت لە هیچ شتێکدا داهێنان بکات و هیچی لەدەست نایەت. ئەم بۆچوونە لەسەر مرۆڤ سەراپا هەڵەیە، توانایی و لێهاتوویی و مەهارەت هیچیان زگماک و سرووشتکرد نین، بەڵکو مرۆڤ فێریان دەبێت و لە خۆیدا پەرە و گەشەیان پێدەدات و پلانیان بۆ دادەرێژێت. داهێنان پەیوەندییەکی ریشەیی بە ئازادییەوە هەیە. لە هەر شوێن و کەشوهەوایەکدا ئازادیی و کرانەوە هەبوو، لەوێ مرۆڤەکان داهێنان دەکەن و کارامەیی خۆیان پیشاندەدەن.
لە بنەمادا داهێنان بارودۆخێک و ساتەوەختێکی پەیوەستکردن و نوێبوونەوەیە. ئەو توانایەیە کە لە رێگەیەوە تاکەکەس دەتوانێ زانینەکانی خۆی لەگەڵ بیرۆکەی ئاشکرا و باودا، لێک بدات و شتێکی نوێی بە شێوازێکی تازە لێبخاتەوە و بەرهەمی بهێنێت. داهێنان کاتێک روودەدات، کە تاکەکەس بواری ئەوەی بۆ

بڕەخسێت، تاکو شتێک هەڵوەشێنێت، ڕێکیبخاتەوە، نوێی بکاتەوە و بەو جۆرەش پەیوەستی بکاتەوە بە کەسایەتیی خۆیەوە، کە پێشتر بەو جۆرە نەکراوە. لێرەدایە داهێنان ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە کەش و هەوای ئازادیی و کرانەوەوە.

هەر لەبەر ئەمەشە کە پێویستە لە ئێستاوە بۆ داهاتوو، کرانەوە و ئازادیی بە بەشێکی گرنگ لە سیستەمی پەروەردە و فێرکردن بزانرێ. پێویستە بوارەکانی داهێنان و گەشەپێدانی تواناکانی قوتابیان فراوانتر بکرێن و لە نێو وانەکانی تریشدا بەهەمان شێوە بواری داهێنانی قوتابیان زیادتر بکرێت. واچاکە قوتابخانە، بەڕێوەبەرەکان و مامۆستاکان و توێژەرە کۆمەڵایەتیەکان و دەروونییەکان، بە چاوێکی کراوەترەوە تەماشای لێهاتوویی تایبەتیانەی هەر تاکێکی قوتابی بکەن و نەیپووکێننەوە. جیهانێک کە ئێمە تیایداین و دەبین بە بەشێک لێی، مرۆڤێکی خاوەن توانایی و خەللاقی دەوێت، کە توانای داهێنانی خۆی بۆ ئاشکرا بوونبێت. لێرەوە پێویستە وانەکانی، وەرزش، وێنە، پیشە دەستییەکان زیاد بکرێن و لە ڕێگەیانەوە منداڵە قوتابیەکان فێری خۆ ڕێکخستن و هاوکاری بکرێن و متمانەیان بەخۆیان زیاتر بکرێت..

ئەگەرچی دوارۆژ لە کەسەوە دیار نییە، بەڵام لە بواریی پەروەردەدا بینینی دوارۆژێک کە دەمانەوێ، یەکێکە لە کارە هەرە بنەماییەکان. بۆیە پلاندانان بۆ چۆنیتی گەیشتن بەو دوارۆژە کارێکی جەوهەرییە لە بواری پەروەردەدا. تەنیا بیرکردنەوە جیاوازەکان جیاوازیی و گۆڕان دروستدەکەن، ڕەنگە نەتوانرێ ئەوەی بیریی لێدەکرێتەوە، بچێتە بواری جێبەجێکردنەوە، بەڵام پەروەردە و فێرکردن بەبێ بیرکردنەوەی پێشوەخت لە سەرەتاوە شکست دەهێنێت.

# وتەی دوایی

سیستەمێکی پەروەردەیی باش کە تیایدا مرۆڤ ئامانج بێت، بەبێ تێگەیشتنێکی فەلسەفیی لە مرۆڤ و ڕوانگەیەکی پەروەردەناسیانە بۆ زانین و فێربوون، سوودی خۆی نابێت. جیاکردنەوەی سیستەمیی پەروەردەیی لە دانایی فەلسەفیی لەبارەی مرۆڤ و توانا و پێویستییەکانیەوە، دەبێتە سیستەمێکی لە دەرەوەڕا جوانکراو و ڕازاوە و لە ناوەوەڕا بۆش و بەتاڵ کە بۆی هەیە هەموو بیروڕایەکی دژە پەروەردەییانە و بگرە دژە مرۆییانە تیایدا سەرهەڵبدات.

سیستەمی پەروەردەیی ئێمە لە پازدە بیست ساڵی چوودا، هەمیشە لە هەوڵی خۆجوانکردندا بووە و بەبارتەقای ئەوەش لە ناوەڕۆکە پەروەدەناسیی و فەلسەفییەکەی خۆی بەتاڵکراوەتەوە و بۆتە سەکۆی ساخکردنەوەی ململانێ سیاسی و حزبییەکان. جگە لە ڕەنگدانەوەی ئەو ململانێیە لە ئاستی زمان و زارەوەسازییدا بۆ ناسینەوەی بەشەکانی ئەو سیستەمە بەپێی ئەو لایەنە سیاسییەی سیستەمەکەی بەسەردا دابەشبووە (وەک بەکارهێنانی زارەوەکانی خوێندکار و قوتابیی و فێرخواز بۆ هەمان مەبەست)، ئەوە

خودی سیستەمەکە لەبەردەم هەڕەشەی بنەما مێژووییەکانی خۆیدا بووە و هەوڵێکی شێلگیر دراوە بۆ ئەوەی هەر لایەنێکی سیاسیی لە هەر کونێکەوە بۆی هەڵکەوتبێ، گۆڕانێک لە ئەدەبیاتی سیستەمەکەدا بکات و بەشێوازێک وانە و ماتەرییاڵە دەرسییەکان دابڕێژێتەوە کە خزمەت بە بنەما ئایدیۆلۆژییەکانی خۆی بکەن. ئەمە ئەو کارەیە کە لەگەڵ کتێبەکەی (باڵدار: ئەلف و بێی کوردی)، کراوە، وەک بەشێک لە سڕینەوەی ڕەهەندە دنیاییەکەی سیستەمەکە و بەخشینی ڕەهەندێکی ئایینیتر بە وانەکانی، کە لە کۆتاییدا ئەوە خزمەت بە هێنانەوە و ڕێخۆشکەریی دەکات بۆ دەستخستنەناوی ئایدیۆلۆژیانەی ئایینی لە سیستەمەکە.

بەهەمان شێوەش، هەر یەک لە حزب و لایەنە سیاسییە بەناو سێکۆلارەکانی هەرێمی کوردستان، هەوڵی خۆیانداوە بۆ ئەوەی ئەم سیستەمە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و لە ڕووی مێژووییەوە پەیوەستیی بکەنەوە بە مێژووی حزبەکەی خۆیانەوە.

گۆڕانێکی دیکەی مەترسیدار ئەوەیە کە لە بۆشایی و نەبوونی تێگەیشتنێکی پەروەردەناسیانەی فەلسەفیی بۆ پەروەردە، کەسانێک و دەستگەلێکی شاراوە لەناو سیستەمەکە و دامەزراوەکانیدا (هەر لە دایەنگە و باخچەی

ساوایانەوە تا قوتابخانە سەرەتایی و تا زانکۆکان)، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان، چ بۆ خزمەتکردن بێت بە ئایدیۆلۆژیایەیەکی تایبەت یان لە ڕووی بێموبالاتییەوە، هەوڵی لادان و پەراوێزخستن و سڕینەوەی کۆی ئەو ماددە و وانە فەلسەفییانەیان داوە کە لە بەرنامەدا بڕیاریان لەسەر دراوە و لە کردەییدا سڕدراونەتەوە. ئەمەش بە ئاشکرا هەڵخلیسکاندنی سیستەمەکەی لێکەوتۆتەوە و لە ناوەوەڕا ئەوەندەی لاواز کردووە، کە ناتوانێت بەرگریی لە خۆی بکات.

ئەوەی لە هەمووی دەردەدارترە و لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا تێبینیکراوە ئەو ڕەوەندە ترسناکەی پرایڤاتیزەکردنی کەرتی پەروەردە و کردنییەتی بە کەرتێکی تایبەت کە حکومەت تەنیا لە مەوەداوە چاودێریی دەکات. ئەم ڕەوەندە ئەنجامگەلێکی بێسنوورانە خراپی بە دەستەوە داوە، کە لە کۆتاییدا زەمینەسازییەکی کولتووریی و ئایدیۆلۆژیی شاراوەی کردووە بۆ قەبووڵکردنەوەی فۆرمگەلێکی داگیرکاریی کولتووریی و سڕینەوەی شوناس و لاوازکردنی زمانیی دایکیی و کۆلۆنیالیزەکردنەوەی مرۆڤی کوردستانی.

سەرهەڵدانی لێرە و لەوێی دەنگە ڕەگەزپەرستیەکانیش هەر بەرەنجامی نادیاریی تیگەیشتنی فەلسەفیی لە مرۆڤ و

جیابوونەوە و لێکدوورکەوتنەوەی فەلسەفە و پەروەردەن و ئەمەش خراپببوونی سەرلەبەری سیستەمەکە ئاشکرا دەکات.
بۆیە ئەگەر ئەم کتێبە توانیبێتی گرنگیی ئەو تێگەیشتنە فەلسەفییە لە مرۆڤ و پەیوەندیی نێوان فەلسەفە و پەروەردەناسیی و هاوکاریی هەردووکیان بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕەگەزپەرستی بخاتە ڕوو، یان هیچ نەبێت خوێنەر لەو کێشانە بە ئاگا بێنێتەوە کە لە غیابی پەروەردەناسییەکی فەلسەفییدا، سیستەمەکە دەکەنە بەرهەمهێنی فۆرمەکانی ناعەدالەتی و جیاکارەیی و ڕەگەزپەرستی، ئەوە برێک لە ئامانجی خۆی نزیک بۆتەوە. ئەوەی لە هەر شت زیاتر ئازارم دەدات ئەوەیە کە چۆنە ئێمە لەلایەکەوەو بە شێوەیەکی یاسایی هێشتا نەمانتوانیوە شوناسی کەسیی و نەتەوەیی خۆمان دروستبکەین، بەڵام بواریی پەروەردەمان بە شێوەیەکی ڕەها تەسلیمی کۆمپانیا و تەماعی سەرمایەداریەتی مشەخۆرکردووە کە جگە لە قازانجی مادیی، هیچ نیازێکی بە پەروەردە و سیتەمەکەی نیە. لەولای دیکەشەوە هەموو ئاسانکارییەکی یاساییمانکردووە بۆ ئیسلامیزەکردنی بواری پەروەردە؟! ڕەنگە ئەمە گەورەترین هەڵەیەک بێت کە هەر حوکمڕانییەک بیکات، لە نەزانیی و نەشارەزایی لە ئاست گرنگیی

سیستەمی پەروەردە بۆ دروستکردنی کەسایەتیی مرۆڤ و شوناسی نەتەوەیی..

ئەم هەڵەیە شتێک نیە بە ئاسانیی قەرەبوو بکرێتەوە، چ جا ئەوەی ڕاستبکرێتەوە. یەکێک لە کێشە هەرە سەرەکییەکانی بزووتنەوەی پەروەردەیی و زمانیی لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، لەلای کورد و لە ناو دەوڵەتی تازە دامەزراوەی عێراق دا هەر لە پەیوەندیی بە زمان و شوناسەوە بوو. چۆن بکرێت زمانی کوردی و شوناسی کورد لەو حوکمڕانییەدا جێی بکرێتەوە و بسەلمێنرێت؟ هەوڵەکانی تۆفیق وەهبی و ئەمین زەکی بەگ لەمڕووە پێمان دەڵێن، ئەوەی بۆ کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کێشەیەکی سەرەکیی بوو و ململانێی جیدیی لە پێناودا دەکرا، بۆ حوکمڕانانی ئێستای هەرێمی کوردستان لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا بایەخێکی ئەوتۆی نەماوە و ڕادەستی کۆمپانیا تایبەتییەکان کراوە، کە نە نییەتی دروستکردنی کەسایەتی کوردستانی و نە ئامانجیشیانە شوناسی نەتەوەییمان بۆ چێبکەن. بۆیە ئەو کێشانەی لە داهاتوودا لە غیابی پەروەردەیەکی باشدا دەستەویەخەیان دەبینەوە کەمتر مەترسیدار نین لەو کێشانەی کە بەهۆی لەقبوون و لاوازبوونی بنەما ئابووریی و مایەپووچبوونی سامانە هاوبەشەکانی سەرزەوی و ژێر

زەوییەوە دووچاریان دەبین.. کۆی پرۆسەکە پێماندەڵێت: ئێمە لە بواریی پەروەردەیی و زمانسازیی و شوناس چێکردندا بە ڕێیەکی هەڵەدا چووین و دەبێت لێرەڕا بوەستین و سەرلەنوێ لە بیری چارەسازییەکدا بین، کە ئامانجەکەی ئەو دەستکەوتە بێت لە پێناویدا تێکۆشاوین، نەک ئەو ئامرازەی کە بە هۆیەوە دەستکەوت و ئامانجەکەمان لێبزر دەکات.

## لیستی کتێب:

**ئەم لیستەی دەخرێتە ڕوو ئەو سەرچاوە و وتار و لینکانە دەگرێتەوە کە لە کاتی نووسیندا بە شێوازی جۆربەجۆر سوودیان لێوەرگیراوە و گرنگیی خۆیان بۆ بەشەکانی ئەم کتێبە هەیە.**


١. عەلائەدین سەجادی: **ڕشتەی مرواری**، چاپخانەی پەنجەرە، ٢٠١٥.

٢. غازی حەسەن: **خوێندەواری: ڕێگەیەکی سەخت و درێژ لە کوردستاندا.** هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم: ٢٠٠٨

٣. جان بياجي: **التوجهات الجديده للتربيه**. ت: محمد الحبيب بلكوش. سلسله المعالم، دار توبقال للنشر، المغرب، ١٩٨٨

٤. ژان پیاژه، باربیل انهلدر: **روانشانسی کودک**. ت: دکتر زینت توفیق، تهران: نشر نی، چ: هشتم، ٢٠٠٤.

٥. ارسطو: **سیاست**، ت: د. حمید عنایت، تهران: شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، چ: ششم، : ١٢٨٧أ، ١٢٨٨ب، ٢٠٠٧.

٦. بيير بورديو: **العنف الرمزي: بحث في أصول علم الاجتماع التربوي**. ت: نظير جاهل، بيروت: المركز الثقافي العربي. ١٩٩٤
٧. مەجید کاکەوەیسی: **باسێک لەبنەمای پەروەردە و فێرکردن و کۆمەڵگەی پێشکەوتوو**. هەولێر: دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، بەشی دووەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.
٨. *ڕێبوار سیوەیلی: (قەیرانی هوشیاریی لێبووردەیی)*، لە: ڕێبوار س. هیواحاجی، نەوزاد جەمال: **لێبووردەیی و فەلسەفە**. پرۆژەی فەلسەفە، زنجیرە:٢، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چ: یەکەم: ٢٠٠٩
٩. ڕێبوار سیوەیلی: **دیاردەناسیی شوێن و شوناس**. سلێمانی، غەزەلنووس، ٢٠١٥
١٠. کریستیان نوربرگ- شولتز: **گزینەای از معماری: معنا و مکان**. ت: ویدا نوروز برازجانی، تهران: نشر جان جهان، ٢٠٠٣.
١١. الیسون جیمز، کریس جنکس، الن پروت: جامعەسناسی دوران کودکی: **نظریه پردازی دربارەی دوران کودکی**. ت: علیرضا کرمانی، علیرضا ابراهیم أبادی. نشر ثالث، چ: أول، ٢٠٠٤
١٢. جەیمز ئێچ. سترونگ: **ویژگی های معلم مؤثر**. ترجمه و تألیف: خیریەبیگم حائری زاده و لبیلی م. حسین. مجموعه اموزش مؤسر١، تهران: قطره، ٢٠٠٧.
١٣. عبدالله محمد الشيخ: (*الديمقراطيه و المعلم*) له : **الديمقراطيه و التربيه في الوطن العربي**. مركز دراسات الوحده العربيه& جامعه كويت. بيروت، ٢٠٠١
١٤. فایەق سەعید: **قوتابخانەکان ڕوویان لە قیبلە نییە**. هەولێر: دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.
١٥. محمد طاهر معیری: **مسائل اموزش و پرورش**. تهران: مؤسسه انتشارات أمیر کبیر، چ: دوازدهم: ٢٠٠١.

١٦. ميشل فوكو: **مراقبت و تنبيه** (تولد زندان). مترجمان: نيكو سرخوش، أفشين جهانديده. تهران: نشر نى، چ: پنجم، ٢٠٠٥، بەشی سێیەم، پارەی دووەم.
١٧. ميشل فوكو: (**نقد چيست؟**) لە: **تئاتر فلسفه**. ت. نكيو سرخوش و أفشين جهانديده. تهران، ١٣٩٠، چ دوم، ص: ٢٦٧-٣٠٧
١٨. طيبه ماهروزاده: **فلسفهء تربيتى كانت**. تهران: سروش، ٢٠٠٤.
١٩. یەسپەر یول: **منداڵە لێهاتووەکەت**. بەرەو لێکدانەوەیەکی نوێی دایک و باوکایەتی و فێرکاری. و. نوری کەریم. هیوا فاوندەیشن. سلێمانی ٢٠١٤.
٢٠. ناصيف النصار: **فى التربيه و السياسه**. دار الكليعه، بيروت، لبنان، ط: ٢، ٢٠٠٥
٢١. **د. رەحیم سورخی و ئەوانیتر: یادکردنەوەی رۆژی جیهانیی زمانی زگماک**، بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی (٢٠٠)، چ. حاجی هاشم، هەولێر: ٢٠١٣
٢٢. **د. ئەمیر حەسەن پوور**: سەدەیێک خەبات لە پێناوی زمانی **کوردیدا: تیۆری، سیاسەت و ئیدەئۆلۆژی.** لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠١٥
23. *Ondskabens filosofi*, Klim 2001.
24. *Andres Fogh Jensen: Hvordan skal jeg leve mit liv، Kierkegaard?* Akademisk Forlag، 2013.
25. *Andres Fogh Jensen: Epi-demos، En lille bog om store epidemier* Forlaget THP، 2012.
26. *Andres Fogh Jensen: The Project Society* Aarhus University Press، 2012.
27. *Andres Fogh Jensen: Projektmennesket* Aarhus Universitetsforlag، 2009.
28. *Andres Fogh Jensen: Projektsamfundet.* Aarhus Universitetsforlag، 2009.

29. *Andres Fogh Jensen: Magtens kartografi. Foucault og Bourdieu* Forlaget Unge Pædagoger، 2006.
30. *Andres Fogh Jensen: Mellem ting، Foucaults filosofi.* 1. udgave، 2005، nu udsolgt. 2. Reviderede udgave 2013.
31. *Andres Fogh Jensen: Metaforens Magt.* Forlaget Modtryk، 2001. 3. udgave 2013.
32. Robert Philipson: Linguistic Imperialism. London, Oxford University Press, 1992.
33. Immanuel Kant: Besvarelse af spørgsmålet: Hvad er Oplysning. i; Oplysning, historie, rfremskridt. Morten H. Jeppesen. Slagmrk, 1993.

## سەرچاوەی ئەلیکترۆنی:

34. http://pukmedia.com/KS
35. http://www.payam.tv
36. http://www.awene.com/article/2013
37. https://www.eva.dk
38. http://voresborn.dk/skole/nar-dit-barn-skal-skifte-skole
39. http://www.b.dk/nationaltJan Bjerre Lauridsen
40. http://politiken.dk/debat Andreas Rasch-Christense
41. http://pub.uvm.dk/2006/skoleleder
42. http://politiken.dk
43. https://tegnet.wordpress.com/
44. http://www.jamnews.
45. http://all-that-is-interesting.com/fascinating-history-footwear
46. http://www.jayhon.com
47. http://www.ziryan.ir

48. http://www.jayhon.com
49. .http://anthropology.ir
50. http://right-to-childhood.com/
51. https://www.tribunezamaneh.com
52. http://www.ziryan.ir/NewsDetail.
53. https://www.facebook.com/biskurdistan
54. http://www.information.dk
55. http://ruwange.blogspot.com/2010/

# Felsefe’ Regezperstî’ Perwerde



Rebwar Siwayli

پەروەردە لە وڵاتی ئێمەدا لەو پەڕی لاوازی
خۆیدا دەژی، توندووتیژی سیاسی میدیایی و
دەستتێوەردانی کەسی و لایەنەکان و
دەسەڵاتی شاراوەی ئەو کۆمپانیانەی
بازرگانی بە پەروەردەوە دەکەن. وای کردووە
لە هەرێمی کوردستاندا وشەی پەروەردە و
هزری پێداگۆژی لەبەرچاوی منداڵ و خێزان و
بەشێکی زۆر لە خەڵکی وڵاتەکە بکەوێ.
پەروەردە کوورت کراوەتەوە لە کردنەوەی
قوتابخانە و دامەزراندنی مامۆستایان و
ئەرکە ڕۆتینییە ئیدارییەکان، کە زۆربەیان
ڕێگرن لە بەردەم پەروەردە خۆیدا وەك
جۆرێك لەبیرکردنەوە.

چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر